# کتێبی

# حاجی قادری کۆیی

## خوێندنەوەی فەلسەفییانەی ئەزموونی شیعری

پ. ی. ڕێبوار سیوەیلی

2016



- ناوی کتێب: کتێبی حاجی قادری کۆیی
-بابەت: خوێندنەوەی فەلسەفییانەی ئەزموونی شیعری
- ناوی نووسەر: ڕێبوار سیوەیلی
- تایپ، مونتاژ، هەڵەبڕی: نووسەر.
- بەرگ: هۆشمەند عەبدوڵا حەمەک
- سەرپەرشتیاریی هونەریی چاپ: عوسمان پیرداود
- وێنە، تابلۆ و دیمەنەکانی ناوەوە: نووسەر، عەدنان کەریم، محمدهاشم، ئارام لالۆ.
- بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی، ژمارە (314)
- بە هاوکاریی دەزگای زەریاب، چاپی یەکەم/2016
- بڵاوکردنەوەی: ماڵی وەفایی، هەولێر.
- چاپخانە: چاپخانەی ڕۆژهەڵات.
- تیراژ: 1000
- نرخ: (10) هەزار دینار.
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (460)ی ساڵی 2016ی پێ دراوە

کتێبی

# حاجی قادری کۆیی

رێبوار سیوەیلی
2016

ئەو بۆچوونانەی لەم کتێبەدا خراونەتە ڕوو،
ڕەنگدانەوەی بیروڕای نووسەرن.

به مامۆستا و هاوڕێم

پرۆفیسۆر

دکتۆر محەمەد کەمال،

پێشکەش

کە یەکەمین کەس بوو پشتگیریی کردم لە ئاراستەبوونمدا بۆ گرتنەبەری خوێندنەوەی فەلسەفیانە بۆ جیهان و پشتبەستن بە فرەمێتۆدی لە توێژینەوەدا.

## بەشی یەکەم

**ونبوونی شوێن (شار) لە ئەزموونی شیعریی حاجی قادری کۆییدا**

## بەشی دووەم

# پێشەکی:

کاتێک لە نووسینی ئەم کتێبە بوومەوە، زۆر خەمم خوارد کە هێشتا لەچاو ئەوەی کارم بۆی کردبوو، بیرم لێکردبۆوە و بەرنامەم دانابوو، هیچی ئەوتۆم لەسەر حاجی قادر و جیهانە شیعرییەکەی نەگوتووە. خۆمم لە شێوەی منداڵێکدا هاتە پێشچاو کە بە دڵ گوێی لە چیرۆکێکی خۆش گرتبێت و دیمەنەکانی بێهێنێتە پێشچاوی خۆی، بەڵام لەپڕ چیرۆک دەپچڕێ و دیمەنەکان لە شوێنی خۆیان وشک دەبن.. بۆیە خەمی من لە حاجی قادر هاوکاتیش بوو بە تورەبوونێکی منداڵانە بۆ بینینی دوایین دیمەنەکانی ئەو چیرۆکەی هەموومان دەمانەوێت کۆتاییەکەی بزانین. بەڵام ناتوانین.

حاجی قادر بەگشتی ئیرادەگەرایەکی ناکام بوو. بەدڵ و ئەقڵیی خۆی نەژیا، هەڵگری میراتێکی تراژیدیانەی مێژوویی کەڵەکەکراو بوو. تیرەکەی لە کرماشانەوە شاربەدەر کرابوو، خۆی لە ناوچەی کۆیە و لە گۆڕقەرەچ بینییەوە. لۆکالیزمی ناوچەکەی بەجێهێشت و سەرەتا دەستیکرد بە کۆیەویستی، دواجار کەوتە فراوانکردنی پانتایی شوێنی لەدایکبوونی و باشووری کوردستانی خستە جێگەی، پاشان گشت کوردستانی

وەک نیشتیمانێکی لێکدانەبڕاو دەبینی. لەسەر عەردی ئەم کوردستانە گەورەیە خەونی بە دەوڵەت و یەکبوون و پێشکەوتنەوە دەبینی و هیچیان نەهاتنە دی. کولتووری ئایینی و کۆمەڵایەتی میللەتەکەی خۆی ڕەتکردەوە و لەسەر ئەمە سزا درا و دەرکرا لە وڵات. قەت ژنی نەناسی، هەرگیز نەگەڕایەوە نیشتیمانی خۆی و بە دۆستان شاد نەبۆوە. هەر زوو باوک و پاشان داییک و دوایئەوەش هاوڕێکانی لەدەستدان. ستایشی خوێندەواری دەکرد و میللەتەکەی نەخوێندەوار مایەوە. هەڵوێستێکی دژوازانەی لە ئەوروپا وەرگرت: ستایشی دەکرد و ڕەتیشییدەکردەوە و ڕەخنەی لە داگیرکاریی دەگرت و نائومێد بوو. لە ئەستەمبووڵ ژیا و ئەو شارەی لێبووە دۆزەخ. خوداناسییەکی پتەوی هەبوو، بەڵام ئاییندار نەبوو، دیندار بوو. باشەی لە نیزام و خوێندەواری و یەکبووندا دەبینی. بەڵام نەتەوەکەی بە یەکبوون نەبینی و باشەی خوێندەواریی و نیزامی لەلای عوسمانییەکان ڕەتدەکردەوە. قسەی زبری بە نەتەوەکەی خۆی گوت، بەڵام دڵسۆزیی لێدەباری. ڕەخنەی لە سیستەمی سیاسی عوسمانییەکان گرت و ڕێزی لە کۆمەڵگای تورکەکان دەگرت. بەگژ هەڵپەی سیاسیی ئەرمەنەکاندا چۆوە، بەڵام سوکایەتی بە مرۆڤی ئەرمەنی نەکرد. لەگەڵ هەستان و

ڕاپەڕینی گەلانی ئازادیخوازدا بوو، بەڵام گەلی خۆی بە ڕاپەڕینەوە نەبینی. پاشان نیشتیمانی لەدەستدا و لە غەریبایەتی بە شیعر کەوتە دروستکردنەوەی نیشتیمان لە زمان و بەهۆی یادوەریی و خەیاڵەوە. هەرگیز ماڵی نەبوو، بەڵام بەدوایدا دەگەڕا، شیعری کردە ماڵی خۆی و خێزانێکی شیعری پێکهێنا، بەڵام لەمەشدا ترسی هەبوو شیعرەکانی بفەوتێن ئەوەش ڕوویدا.. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئیرادەیەکی پتەوی هەبوو، مرۆڤی نەدەبەستەوە بە چارەنووسەوە، بڕوای وابوو مرۆڤ خۆی دروستدەکات ئەگەر ویستی هەبێت. داهاتووی بۆ گرنگ بوو.،، کە هەرگیز نەهات و ئەو سەری نایەوە.. بە کورتی و بە کوردی، کاتێک شیعری حاجی دەخوێنمەوەو بایی ئەوەی لێیتێدەگەم، بۆم دەردەکەوێت ئەوەندەی لە پشت ناکامیی و شکستەکانی حاجییەوە کورد هەیە، ئەوەندە بێگانە نیە. ئەوەندەی هۆکارە ناوەکییەکان ئامادەن ئەوەندە هۆکارە دەرەکییەکان نین. حاجی عاشقی کوردبوون و لە هەمان کاتیشدا کۆیلەی کوردبوونی خۆی بوو.. حاجی بەم مانایە نەمردووەو لەگەڵ ئێمە دەژی و هاوکۆژانی ئێمەیە لە کوردبوون و مرۆڤبووندا.

بۆیە دنیای حاجی قادر زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت، کە بەم کتێبە باسی بکرێت. کەسایەتی حاجییش لە مێژووی

ئێمەدا زۆر لەوە گرنگترە تا ئێستا زانیومانە. حاجی قادر وەکخۆی، نەک بەبەراووورد بە شاعیرانی دیکەی پێش و پاش خۆی شاعیرێکی تایبەت و سەرنجڕاکێشە.
هەرچەندە من لەم کتێبەدا پتر خۆمم بە لێکدانەوەی چەمکی شوێن و کات و پەیوەندیی نیوانیان و دژوازیی و ناکۆکییانەوە لە ئەزموونی ئەو شاعیرەدا سەرقاڵ کردووە، بەڵام لە ئاستی ناوەڕۆکدا بەسەر زۆر بەڵگەی سەرنجڕاکێش لە شیعری حاجیدا کەوتم، کە دەبێت بە وردی و لەلایەن کەسانیترەوە توێژینەوەیان لەبارەوە بکرێت. لە هەندیک شوێنی ئەم کتێبەدا ئاماژەم بەو بڕگانە داوە.
بەوجۆرەش پێشبینی دەکەم لە داهاتووشدا ئەزموونی شیعریی حاجی و مێژووی ژیانی ئەو، جێگەی مشتومڕێکی زۆر بێت و لە ڕێگەیەوە کەسانێک هەبن، بە گرتنەبەری میتۆدی شییکردنەوەی نوێ، بیانەوێت تێگەیشتنەکانی حاجی لە خۆیی و لە کوردبوون و لە دنیا ڕوونتر بکەنەوە، کە هێشتا بۆ نەوەکانی پاشەڕۆژ گرنگیی خۆی دەبێت.
ئەم کتێبە بە دید و تێگەیشتنێکی فەلسەفیانەوە نووسراوەو ئەو سەرچاوانەی تێدا بەکار هاتوون، کە خزمەت بەم خوێندنەوەیە دەکەن. کتێبەکە لە دوو بەشی

پێکەوە بەستراو پێکهاتووە و پەیوەندیی توندیان بە یەکترەوە هەیە. لەبەشی یەکەمدا باسم لە شوێن و نیشانەکانی لە ئەزموونی شیعری حاجیدا کردووە و پرسیاری ونبوونی شوێن، بەتایبەتی شاری ئەستەمبووڵم کردۆتە خولگەی بیرکردنەوەکانم لە لەلای حاجی قادر. لە بەشی دووەمدا باسم لە تێگەیشتنی حاجی لە کات و دۆخەکانی کردووە و بەپێی توانای سنوورداری خۆم، ئەوەم ڕوونکردتەوە کە چۆنە حاجی لەم دوو تێگەیشتنەیدا بۆ شوێن و کات ناکۆک و دژوازە بەڵام هەر ئەم ناکۆکەش پێکهێنەری شوناس و تایبەتمەندیی ئەوە.. هەر باسێکی دیکەم هێنابێتە پێش بۆ ڕوونکردنەوەی ورد بووە لەسەر ئەم دوو لایەنە لە شیعری حاجیدا و تەواوکەری تێگەیشتنەکانی منە لە ئەزموونی ئەو مرۆڤە گەورەیە.

پێشینەی ئەم لێکۆڵینەوەیەی من دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی سەرەتای دوو هەزار، کە تازە گەڕابوومەوە بۆ هەرێمی کوردستان و لە کولێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین وانەبێژ بووم. یەکەم کەسیش هانیدام لەبارەی حاجی قادرەوە بنووسم، پرۆفیسۆر دڵشاد عەلی، بوو لە میانەی گفتوگۆیەکدا کە ڤیستیڤاڵی گەلاوێژ لە سلێمانی کۆی کردبووینەوە. بەرهەمی ئەم توێژینەوەیە لە سەرەتای

خۆیدا بریتیبوو لە نامیلکەیەک کە دەزگای سپیریز بەناوی (هاوکاتی و هاوسوناسی)، لە دهۆک، چاپی کرد، لە هەنگامەی بڵاوکردنەوەشیدا، ئەو نوسخانەی لای خۆم بوون لەگەڵ سەدان کتێبی دیکە و دەستنووسدا لە کتێبخانەکەم سوتێنران.

یەکێکیتر کە پشتگیری ئەم جۆرە کارانەی کردووم و ڕای سپاردووم بۆ ئەوەی پەرە بە توێژینەوی شوین و شوناس بدەم، بریتیە لە مامۆستا د. محەمەد کەمال. ئەو مرۆڤە مەزنە ئەرکێکی ئەوەندە گەورەی بە من سپارد کە دەرچوون لە ژێر باری بوێریی دەویست کە من نەمبوو. بۆیە لەسەر ڕاسپاردەی ئەو مامۆستایەم، کە لە پێشەکی کتێبەکەم: (*شوێن و شوناس: توێژینەوەیەکی دیاردەناسانە لە شاری سلێمانی* 2015)، فەرمووبووی: (هیوادارم ڕێبوار بتوانێت بەرهەمی زۆرتر لەم بوارەدا بڵاو بکاتەوە)[1]، دەستمدایە تەواوکردنی ئەم کارەم لەسەر حاجی قادر. بۆیە ئەگەر ئەمکارەشم ئەو مامۆستا مەزنەی فەلسەفە ڕازیی بکات، ئەوە من شتێکم کردووە.

---

[1] پێشەکی د. محەمەد کەمال بۆ کتێبی: شوێن و شوناس: ل: 14

لە کاتی کارکردنم لەم بەرهەمەدا، دەستەی سەرۆکایەتی ئەکادیمیای کوردی، بەڕێزان سەرۆکی ئەکادیمیای کوردی (پرۆفسیۆر د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی) و (دکتۆر نەجاتی عەبدوڵا) جێگری سەرۆکی ئەکادیمیا، بە پشتگیریی و هەلڕەخساندن و سەرچاوە پەیداکردن و بیروڕاگۆڕینەوە، پێمەوە ماندوو بوون. لێرەدا سوپاسی پشتگیری و متمانەیان دەکەم و ئەمکارە چەند بە بەرهەمی خۆم دەزانم ئەوەندەش بەبەرهەمی ئەو کەشەی دەزانم کە ئەو دوو بەڕێزە لە ئەکادیمیای کوردی، بۆیان ڕەخساندم. هەر د. نەجاتیش جەختی لێکردمەوە، تا کتێبەکە بە خۆشەویستی (کتێبی نالی)یەوە، ناوبنێم (کتێبی حاجی قادری کۆیی).

لیستی ناوی ئەو کەسانەی دەبێت سوپاسیان بکەم، زۆرن. بەڵام نابێت سەرۆکایەتی زانکۆی کۆیە، سەرۆکی ئەو زانکۆ خۆشەویستە و جێگرەکانی، بەتایبەتی پ. ی. د. حەیدەر لەشکری، هەروەها پ. ی. د. سەربەرست نەبی، لەیاد بکەم، بەوەی بۆ ڤیستیڤاڵی حاجی قادر ڕوویان لێنام تا بەشێک لەم توێژینەوەیە پێشکەش بکەم. هەروەها نوسەری گەنج، ئیدریس عەبدوڵا ئومەرگومەتی، کە بەپەیداکردنی سەرچاوە و بە چاوساخییکردنم بۆ چوونە زێدی لەدایکبوونی حاجی قادر، هەمیشە بە ڕووی

خۆش و زانیاری پڕ بایەخەوە، هاوڕێم بووە، جێی سوپاسێکی تایبەتمە.
هەروەها سوپاس بۆ ستافی بەڕێوەبەری کەناڵ بیست و چوار، بەتایبەتی هاوڕێی دێرینەم، نورەدین سەعید وەیسی، کە بەشێوەکی فەرمی نامەی ئاراستەی ئەکادیمیای کوردی کرد و تیمێکی تەلەفزیۆنی لە هەردوو بەڕێزان هونەرمەند (محەمەد هاشم وەک دەرهێنەر و ئارام لالۆ وەک وێنەگر)، پێکهێنا بۆ ئەوەی ئەم توێژینەوەیە بکەینە فیلمێکی بەڵگەنامەیی لە بارەی حاجی قادرەوە و ئەو کارەش لە ئەنجامداندایە. بەشێکی وێنەکان کە لە کتێبەکەدا بەکارهاتوون، ئەو تیمە گرتویانن. وێڕای ئەوەی دەبێت سوپاسێکی تایبەتی هونەرمەندی ناودار، (مامۆستا عەدنان کەریم) بکەم، کە پەسەندی فەرموو لە پرۆژەی فیلمەکەدا کاری دەنگی بگرێتە ئەستۆی خۆی، ئەمە پرۆژەکەی منی جوانتر کرد.
کەسانیتریش زۆرن کە هاوکارم بوون، پ. د. محسن محەمەد و پ. د. وریا عومەر ئەمین بە شێوەی جۆربەجۆر هاندەر و هاوکارم بوون. لە دڵمەوە سوپاسیان دەکەم. هەر یەکە لە سامان سولێمانی و مامە جوتیاری حاجی سلێمان ئاغای ئامۆزام، لە پەیداکردن و دەستخستنی سەرچاوەدا، هاوکارییان کردم و

کەسانێکتریش کە نەیانویستووە ناویان بهێنم، بە زەحمەتەکانیان خۆشەویستی منیان پەلکێش کرد.
لە پاش هەموو ئەمانە، نابێت ناوی (ئاهەنگ و زەریاب و نایاب)م لە بیر بچێت، کە هەمیشە ئامادەبوون لە نازیان کەمبکەمەوە و نازی حاجی قادر زیاتر بکێشم.
من خوێنەرم زۆر بۆ گرنگە، ئەو پێشوازییە زۆرەی لە بەرهەمەکانم کردوویانە، ئەرکی منیان قورستر کردووە. بۆیە هەرکات بەرهەمێکی نوێ دەستپێدەکەم، بیریش لە خوێنەرێکی هووشیار دەکەمەوە، کە دەزانم بە وردیی دەمخوێنێتەوە. هیوادارم لەم بەرهەمەدا، کەسیان نائومێد نەکەم و کارەکە لە ئاستی چاوەڕوانیاندا بێت. ئەگەر کەسانێکیش هەبن ناوییانم بیر کردبێت، بمبەخشن.
ئەم کتێبە بۆ ئەو کەسانەیە کە بە وردیی شعری حاجی قادریی کۆییان خوێندبێتەوە، هەروەها پەیگریی ئەو نووسراوە زۆرانەیان کردبێت کە نووسەران لە بارەی حاجی و شێوازیی هزرینییەوە نووسیویانن.. ئەگەر نا دەبێت پاش خوێندنەوەی ئەم کتێبە دەستبکەن بە خوێندنەوەی حاجی، چونکە من دەمەوێت بیروڕای نەریتی لەسەر حاجی قادر بگۆڕم و تێگەیشتنێکی نوێی لە دنیای ئەو مرۆڤە ناوازەیە بەرهەم بهێنم.. لێرەوە دەڵێم بۆ ئەو کەسانەی کە لە کۆییبوونییەوە تەمەشای حاجی

قادر دەکەن، دەبێت لە جاران زیاتر شانازیی پێوە بکەن، بۆ ئەوانەش کە وەک کورد لە حاجی دەڕوانن ئەرکێکی زۆر گەورەیان دێتە سەرشان، چونکە کوردبوون دەروەستییەکی ئاسان و گاڵتە نیە. کەسی خۆی دەوێت.

ڕێبوار سیوەیلی،

مامۆستا لە بەشی فەلسەفە، کۆلێژی ئەدەبیات، زانکۆی سەلاحەدین

ئەکادیمیای کوردی

2016

من لە سەردەمی مێردمنداڵیمدا بۆ یەکەمجار چاوم بەم قەڵەمکێشەی مامۆستا باباجان لەسەر حاجی قادر کرایەوە، بۆیە هەمیشە ئەو هەستەم هەیە کە ئەم وێنەیە لە کەسایەتی ڕاستەقینەی حاجییەوە نزیک بێت.



## بەشی یەکەم

# ونبوونی شوێن (شار)
# لە ئەزموونی شیعریی حاجی قادری کۆییدا

### سەرەتا و داتا:

شیعری حاجی قادری کۆیی فەرهەنگێکە لە شوێن و شوێنناسی و ناوی شوێنەکان. ئەوەندەی ئەو ناوی شوێنگەلیکی جیاوازمان بیر دەخاتەوە، لە شاعیرانی هاونەوەی خۆی کەمتر بەولایەدا چوون. پەیوەندیی حاجی و شوێن، وەک پەیوەندیی ماسیگرێکی کارامە وایە لەسەر گەمییەکی ئارام کە تۆڕ هەڵدەدا و ماسیی خۆی دەگرێ و تۆماریاندەکاتە ناو دەریا شیعرییەکەی خۆیەوە. ئەو جگە لە بەکارهێنانی زارەوەکانی شوێنناسی بە شێوەیەکی دروست، ناوی چەندین شوێنی ئەفسانەیی، سرووشتی، ئایینی، مێژوویی و میعماریی لە دیوانەکەیدا بۆ پاراستووین و بیری خستوینەتەوە[1].

---

[1] ئەو دیوانەی حاجی قادر، کە من لەم توێژینەوەیەدا پشتم پێیبەستووە، ئەمەی خوارەوەیە: – سەعید کەرەمی: دیوانی حاجی قادری کۆیی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: سەردار حەمید میران و کەریم موستەفا شارەزا. لەسەر نووسێکی نوێ بە پێی بۆچوونەکانی موحەمەدی مەلا کەریم. ئینتیشاراتی کوردستان، سنە، 1391 (2012).

لەگەڵ ئەوەشدا، چۆنە حاجی قادری کۆیی بەشێکی زۆری تەمەنی خۆی لە شار ژیاوە و کەچی شار لە ئەزموونی شیعریی ئەودا ونبووە؟ ئەگەر سەفەری حاجی لە کوردستانی سەدەی نوزدەیەمەوە بۆ ئەستەمبووڵی پایتەختی عوسمانی لەبەر چاو بگرین و ئەو ماوەیەش کە تیایدا ژیاوە بکەینە، پێوەر، دەبوو شیعری حاجی پڕ بێت لە ئەزموونێک کە ئەزموونی شارە، ئەمەش وەک بەشێک لە ئەزموونێکی گەورەتر کە ئەزموونکردنی شوێنە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم شیعر و ئەزموونە لەمڕووەوە زۆر هەژارە و ئەمەش ئەو پرسیارەمان لەلا دروستدەکات: بۆچی شار لە ئەزموونی شارنشینترین شاعیری ئێمەدا نادیارە؟ یان ئەگەر هەشبێت ئەوەندە لاوازە کە ناتوانین لە ڕێگەیەوە تێگە و کاریگەریی شار لەسەر حاجی بەرهەمبهێنینەوە. ئەمەش شتێکی دەردەدارە چونکە بەشێکی زۆری شیعری حاجی هەڵگری شوێنێ و ئەزموونێکی مۆدێرن و یاخیگەرانەی فۆرمێکە لە نەتەوایەتی، بەبێ ئەوەی ئەم مۆدێرنیتە هزریە پەیوەستبێت بە شوێنێکیی تایبەتەوە کە شاری مۆدێرنە.

ئەمەش ئەو دژوازییە ئاشکرا دەکات کە پەیوەندیی هەیە بە ئامادەیی بەرجەستەی چەمکی کاتەوە لە ئەزموونی حاجیدا. چونکە ئەو تیڕوانینێکی بەرز لە ئاست کات و

دۆخەکانی کاتدا، بە مانا (ئاگۆستین)ییەکەی بەرجەستە دەکات و سۆژەیەکمان پێدەناسێنێت کە یەکێک لە نیشانەکانی مۆدێرنبوونی بریتیە لە ئاگایی ئەو بەرامبەر بە کات..

بەمجۆرەش، پەیوەندیی کات و شوێن لە شیعری حاجی دا، پەیوەندیەکی هاوکاتیانە نیە. ئەو کاتەی حاجی تیایدا سەرنجمان بۆ لای هووشیاریی خۆی لەئاستێ کاتدا ڕادەکێشێت، شوێنی هەمان ئەو کاتە بەسەر بیرکردنەوەی حاجییەوە دیار نیە و ئامادەیی نیە و ئەو بۆخۆی ئەو شوێنانە، دەسڕێتەوە، نێگەتیڤیزەیان دەکات و بچووکیان دەکاتەوە تا ئەو ئاستەی کە بایەخێکیان نەبێت.. حاجی لەو بەشەی شیعرە کوردییەکانیدا کە لە ئەستەمبووڵ و تاراوگەی ژیانی خۆی نوسیونی، هەستێکی بەرزی ئەومان بەرامبەر بە کات بۆ ئاشکرا دەکات و لەم ڕێگەیەشەوە ئەزموونی شاعیر دەبێتە ئەزموونی سۆژەیەکی مۆدێرن چونکە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی سۆژەی مۆدێرن بریتیە لە ئەزموونکردنی تاکەکەسیانە و هووشیارانەی کات. بەڵام ئەم باسکردنەی کات لەلای حاجی هاوکات و هاوشوێن نیە. ونبوونی شوێن لە فۆرمی شاردا، لەم شیعرانەی حاجیدا و ئامادەکردنەوەی شار وەک شوێن، بەمانا

قیزەوونەکەی و نەبوونی ڕەنگدانەوەی ئەزموونی شاریانە لە ژیانی هەستەکی و هزریی ئەودا، دابڕانێکیان لە پەیوەندیی کات و شوێندا دروستکردووە.

ئەمە جگە لەوەی ئەم باسە بۆچوونی نووسەرانێک دنە دەدات بۆ گفتوگۆ، کە لەو بڕوایەدان و لەوێوە ڕووبەڕوومان دەکەنەوە لەگەڵ شیعر و هزرینی حاجی قادر، کە گوایە حاجی قادر شاعیرێکی ناسیۆنالیستیە[1].

لێرەدا من جەخت لەسەر زاراوەی ناسیۆنالیست وەک ئادیدیۆلۆژیایەک دەکەمەوە کە زادەی پێشزەمینەیەکی سیاسی و کولتووریی خۆرئاواییە و بە توندی گرێدراوە بە بوون و گەشەی شارەوە، وەک بنەمایەک بۆ دروستبوونی دەوڵەت. ئەوانەی لەم ڕوانگەیەوە حاجی دەخەنە چوارچێوەی ناسیۆنالیزمەوە، بەمکارەیان وێنەیەکی حازربەدەست و ئاسان لە بەرهەمی ڕەنجی حاجی دادەتاشن و دەیخەنە باوەشی ئایدیایەکی تایبەتەوە کە لە شوێنێکی دیکەی دنیا بەرهەمهاتووە و بەمکارەشیان ئەو تایبەتمەندیانەی هزری حاجی قادر کە

---

[1] بۆنمونە دیارترینیان مەریوان وریا قانع: ناسیۆنالیزم و سەفەر. کورد لە دیاسپۆرا. بلاوکراوەکانی نیوەندی ڕەهەند. سلیمانی: چاپخانەی ڕەنج، 2005، ل: 65، 66-70. یان: د. جەعفەر عەلی: ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی. سلیمانی: ئەندیشە، چ: 2، 2013، ل: 157-159

نەک بە وەرگرتن، یان کاریگەربوون بە ئایدیایەکی تایبەتەوە بەرهەمی هیناون و کۆپی کردبنەوە، بەڵکو بە ئەزموونی ژیانێکی سەخت و تێکەڵبوونی گۆشت و ئێسقان و ڕۆح بەو ئەزموونە و باجدانێکی مەعنەویی زۆر لە چەند بڕگەیەکی ژیانە ناجێگیرەکەیدا، بۆخۆی پێیان گەیشتووە، ڕەنجبەخەسار دەبێت.
ئەوە ئاسانە بگوترێ حاجی قادر ناسیۆنالیستە، یان ئەنتی دینە، یان ئانارشیستە، بەڵام بەرهەمهێنانەوەی ئەو ئەزموونەی ئەو دەکاتە ناسیۆنالیست، یان ئەنتی دین و ئانارشیست لە خودی دەقەکانیەوە، کارێکی ئاسان نییە.
بۆیە ئەوانەی حازربەدەستانە بۆ حاجی قادر دەچنە سەنگەری هەندێ چەمک و چوارچێوەی حازربەدەستەوە و کاڵای بە باڵای تیۆرییە پێشتر ئامادەکراوەکانی بازاڕی توێژینەوەی پۆزەتیڤیستانە دەبڕن، خۆیان ناتوانن حاجی قادر وەکە فیگەرێکی تایبەت و بەرهەمی ئەو وەکو ماددەیەکی خاو بۆ تیۆرییەیەکی نوێ ببینن.
بۆیە ئەم توێژەرانە ئەگەر سووربن لەسەر بەناسیۆنالیستکردنی حاجی، پێویستە وەڵامی تیۆریکی ئەو پرسیارە بدەنەوە، کە چۆنە حاجی قادر ناسیۆنالیستە و دژی شارە؟ چۆنە ئەو دەیەوێ دەوڵەت بۆ کورد پێشبینی بکات و شار لە هزرینی ئەودا دزێویکە؟ ئایا

ناسیۆنالیستبوونی حاجی ئەو ناخاتە بەردەم دژوازییەک کە پێویستە ئەو نوسەرانە ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەن؟ بەکام پێوەر و لە چ پێشزەمینەیەکی کولتوورییەوە وشەی ناسیۆنالیزم بۆ جۆری بیرکردنەوەی حاجی بەکار دەهێنرێت: ئەگەر ئەو پێشزەمینەیەی ئەو نووسەرانە بیری تیا دەکەنەوە نەریتی ئەورووپی لە پەیوەندیی بە هزرینی ناسیۆنالیزمەوە بێت، ئەوە هزری حاجی و هەڵوێستی لەسەر شار و خواستی بۆ دەوڵەت، ڕێگرە ئەو بە ناسیۆنالیست ناوبەرین. ئەگەر ئەو کولتوور و پێشزەمینەیەش کە ئەوانە قسەی لێوە دەکەن، کولتوور و نەریتی ئەورووپیی نیە، ئەوە دەبێت ڕوونکردنەوەیەکی ئەوتۆ بدەن کە بواری هیچ ناکۆکیەک لە نێوان هەڵوێستی حاجی لە ئاست شار و خواستی ئەو بۆ دەوڵەت نەهێڵێتەوە.

ئەڵبەت لە شیعری حاجیدا زەخیرەیەکی زۆری فۆرمێکی هووشیارانە لە بیری نەتەوایەتی و نەتەوەخوازیی دەبینین، بەڵام تا چەندە ئەوە ناسیۆنالیستانەیە یان شتێکیتر، ئەوەیان توێژینەوەی دەوێت. من بۆخۆم لەوبارەیەوە توانایی ئەو ڕوونکردنەوەیەم نیە کە حاجی بە چ پێوەرێک و لە کامە نەریتی ئایدیۆلۆژیدا ناسیۆنالیستە، بەڵام لەو بڕوایەدام هزری نەتەوایەتی

حاجی (کە دەکرێت لە هەندێ بڕگەی ڕوانینەکانی ئەودا بۆ شوناسی نەتەوەیی سیمایەکی ناسیۆنالیستانەشی هەبێت)، بەرەنجامی هەست و پەیوەندیی ئەوە بە خاک و شوێنەوە.

هزرینی حاجی بەر لەوەی *ناسیۆنالیستانە* بێت لە فۆرمێکی هووشیارانەی ئایدیۆلۆژیدا، هزرینێکە پەیوەندی هەیە بە شوێنەوە وەک ئەوەی ئەو لە قۆناغی سەرەتایی ژیانیدا بەشێوەیەکی نائاگایانە و لە ئەنجامی ئەزموونکردنی شوێنەوە، کە پاشان بە دەروونییکردووە و بە جەستەیی کردووە، سەریهەڵداوە. ئەو پێشئەوەی ناسیۆنالیستێکی نەتەوەساز بێت لە خەیاڵدا، بکەر و خودێکی شوێنناس و ئەزموونکەری شوێنە و هەموو ئەوەش کە ئەزموونی کردووە لە پەیوەندی بە شوێنە جاوازەکانەوە، دەبێتە ژێرخانی بیرۆکەی نەتەوەخوازییەکی تایبەت کە ڕەگەزی خاک (شوێن)، بە هەموو ئەو هەستانەی بە مرۆڤیان دەبەخشێت، تیایدا باڵا دەستە.

لەلایەکیترەوە، هەر چەندە حاجی هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ یەکخستنی کورد و سازدانەوەی *خەیاڵیانەی* وەک نەتەوەیەک، لە ئاستی *مێژوویی و زمان و یادەوەریی و خاکی هاوبەش* و کۆششێکی زۆر دەکات لە کەسایەتیە

نیشتیمانپەروەر و خەباتکاران و ئەدیبانی کورد لە گشت شوێنێک کە هەبوون، ڕەمزی هاوبەش دروست بکات، کە ئەوەش دەچێتە چوارچێوەی ناسیۆنالیزمەوە[1]، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕەخنە و هێرشێکی توندیش دەکاتە سەر **نەتەوە** و سیمبوول و میللەتی خۆی.

ئەگەر حاجی ناسیۆنالیست بوایە، بەو مانایەی کە ناسیۆنالیزم دروستکەری ڕەمز و یەکێتی نەتەوەییە لەسەر بنەمای پیرۆزکردن و جوانکردنی ئەندامانی ئەو نەتەوەیە و هەر شتێک پەیوەندیی بەوانەوە هەبێت و بچێتە خزمەت گەورەکردنی نەتەوەییەوە، چۆن حاجی قادر لێرەو لەوێ، کەم کەم و زۆرجار هێرشێکی توند، ڕەخنەی جەرگبڕ لە کورد و مرۆڤی کورد دەگرێت و شکۆی دەهێنێتە خوارەوە و پرسیاری لە سەر چییەتی و ئاگایی ئەو دروستدەکات و بە پەست و نەزان و بێ ئیدراک وەسفیان دەکات؟ ئەم هێرشەش هێرش نیە بۆ دەستە و تاقم و چین و توێژێکی تایبەت، هێرشێکی چینایەتی نیە، حاجی کردبێتیە سەر ئەو چین و توێژانەی لەگەڵیاندا ناکۆک بووە، بەڵکو ڕووی لە هەموو کوردە:

---

[1] بۆ تێگەیشتنێکی ورد و شەففاف لە ناسیۆنالیزم، بڕوانە: نزار سابیر: ناسیۆنالیزم و موزیک (لە ئەزموونی کوردستانی عیراق دا). ئەڵمانیا: Clausen &Bosse –CPI، چاپی یەکەم، 2011، ل ل: 23–42

لەبەر حیزەبخۆیی و ناتەبایی
لەژێری حیزی حیزان بووینە دۆشەک
هەتا وەک "ئاگری بن کا"ن لەگەڵ یەک
ئەگەر تۆفان بێ لەشکرتان بە پووشەک (ل: 78)

یان بزانە چۆن لەم بەیتەدا ئەوەی بە (بیستن) لەسەر پەستیی و بڵندیی دەوڵەتان بیستوویەتی بەبەراوورد بەوەی بۆخۆی لەسەر پەستیی کوردستانی (بینیوە)، دەخاتە لاوە و شایەتی چاوی پێ ڕاسترە وەک لە شایەتیی گوێ:

گەلێکم بیستووە پەستی و بڵندیی دەوڵەتان ئەمما
جیهان نەیدیوە پەستی وا میسالی حاڵی کوردستان
(ل: 100)

لەم نیوە بەیتەشدا پرسیار لە (توانای ئیدراک)ی کورد، دەکات و وەک کەمی و نەقسێک دەیبینێت لە بوونی ئەواندا، کە ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی گوێ بۆ خۆی بگیرێت کە لە هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو نەقسەدایە بۆیان:

کێ دەڵێ کوردەکان بە ئیدراکن
بەسە ئەم نەقسە گوێ لە من ناکەن (ل: 194)

لێی گەڕێ قەومی تۆ هەموو مارن

دز و حیز و پیاوکوژ و هارن (ل: 195)

میللەتیش هێند کەرن وەکوو جاران
دەستیان ماچ دەکەن دەڵێن: قوربان! (ل: 214)

ئەمانە بێ شعور و گێژ و وێژن
موتیعی "لۆتەخۆر" و هەرزەبێژن (ل: 229)[1]

حاجی لە هەموو بڕگەکانی فیکری خۆیدا، دەچێتەوە سەر هەندێ تێزی ناسیۆنالیستانە، بەڵام ئەوە ڕێگەمان پێنادات بیرکردنەوەکانی لە چێوەی ناسیۆنالیزمدا پۆلین بکەین، کاتێک دەگەینە ئەو هەڵوێستە ئەنتی شارییەی کە ئەو هەیەتی لە ئاست شاری مۆدێرندا کە لانکەی مێژوویی ناسیۆنالیزمە[2]. بۆیە شار بەم مانایە و لە پەیوەندیی بە

---

[1] وشەی *لۆتەخۆر* کە لە کەرکووک بە مانای (پاشماوەخۆر) دێت، لە دیوانەکەدا بە هەڵە کراوەتە: (لۆتی خوێری)، بەڵام لە پەراوێزی ژمارە (1)دا ڕاستکراوەتەوە، بڕوانە دیوان، ل: 229.

[2] لەوەش بترازێت، هیچ کامێک لەو پێناسە فەرمیانەی بۆ ناسیۆنالیزم کراون و پشتیان پێدەبەسترێت، لەگەڵ شیعر و جۆری هزرینی حاجیدا ویکنایەنەوە. بۆ نموونە بڕوانە ئەو پێناسانەی لەم سەرچاوانەدا بۆ ناسیۆنالیزم کراون:

- دایره المعارف ناسیونالیزم، 1380، ص: 17
- دریوش اشوری: دانشنامە سیاسی، 1370، ص: 320
- استنلی بن: Encyclopedia of Philosophy, ed. Paul Edwards 1967، لە: فولادوند، عزت الله، (1377) خرد در سیاست، تهران: طرح نو، وەرگیراوە.

هزرینی حاجی قادرەوە وەک بەشێک لە هزرینێکی ناسیۆنالیستانە، شوێنێکی قێزەوون و نادیار و ونە.
من لەم توێژینەوەیەدا بەدوای هۆکارەکانی ئەم ونبوونەدا دەگەڕێم و لە هەوڵی وەڵامگەلێکدا دەبم، کە دەزانم دوایین وەڵام نابن. بەڵام ڕێگەیەکی ئاسانیش ناگرمە بەر بۆ سەپاندنی چەمکگەلێک، کە بنەمایەکی ئەزموونییان لە شیعری حاجی قادردا نەبێت. لەسەرەتاوە لیستێک لەسەر ئەو شوێن و ناوی شوێنانە دەخەمە ڕوو، پاشانیش درێژە بە کارەکەمان دەدەین.

میتۆد و توێژینەوەی پێشوو:
بۆ خستنەڕووی توێژینەوەیەکی لەمجۆرە پێویستیم بە گرتنەبەری زیاد لە میتۆدێک هەیە و ڕوانگەیەکی فرەمیتۆدی دەگرمە بەر. بابەتی شوێن، هەروەک بابەتی کات وەکئەوەی پاشتر لەلای حاجی قادر قسانی لەسەر دەکەم، لە بنەمادا بابەتێکی فەلسەفییە. بەتایبەتیش کاتێک قسە لەسەر شار دەکەین، ئەم بابەتە دەبێتە مەیدانی توێژینەوەی شارناسی وەک بەشێک لە شوێن. بۆ ئەمەش سەرچاوەگەلێکی تیۆریی کە لە ڕوانگەی فەلسەفییەوە

---

- بندكت أندرسن: الجماعات المتخيله. تأملات فی أصل القوميه و انتشارها. ت: ثائر ديب. المركز العربی للابحاث و دراسه السياسيات. بيروت: 2014.

باس لە شوێن دەکەن، پشتیان پێدەبەسترێت. لەناو ئەو سەرچاوانەدا، بەرهەمەکانی هایدەگەر، باشلار، کریستیان نۆربێرگ شولتز و ئامۆس ڕاپاپۆرت، یوهانی پالاسما و .. کە پتر ڕوانگەیەکی دیاردەناسانەی هایدەگەرییان هەیە بۆ شوێن، گرنگیی خۆیانیان هەیە.
باسی ژیان و شوێنگۆڕکێ و شار لەلای حاجیی قادر و سەفەری ئەو بۆ ئەستەمبووڵی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم، بابەتێکی مێژووییە و لەم پەیوەندییەدا میتۆدەکەمان دەبێتە میتۆدێکی مێژوویی، چ بە گەڕانەوە بێت بۆ سەرچاوەی مێژوویی، یان پەنابردن بێت بۆ بەڵگەنامە، تابلۆی هونەری و وێنەی فۆتۆگرافی بەتایبەتی بۆ پیشاندانەوەی هەندێ دیمەنی ئەوسای ئەستەمبووڵ، کە حاجی قادر تێیدا ژیاوە. شیکردنەوەی دەق و ڕاڤەی هەندێ دەقی شیعریش لەم پێناوەدا، میتۆدی ڕاڤەکاریی دەق و ڕەخنەی ئەدەبیی و خوێندنەوەی تێکست دەسەپێنن. ئەم ڕوانگە میتۆدیانە هەر یەکەیان وەک پێویستییەک بۆ ئاستێک و قۆناغێک لە ئەزموونی حاجی قادر گیراونەتە بەر، تا بتوانین لە ڕێگەی هەرکامێکیانەوە و هەموویان پێکەوە، تێگەیشتنێکی دی بۆ بەرهەمە کوردییەکانی حاجی بخەمە ڕوو.

سەبارەت بە توێژینەوەی پێشوو، هێندەی من ئاگادار بم، بە زمانی کوردی هەریەک لە مامۆستایان مەسعود محەمەد[1] و بەتایبەتییش مامۆستا جەعفەر[2] پرسی شوێنیان لە ژیان و بەرهەمی حاجی قادردا هێناوەتە پێش و ئەوەش بایەخێکی زۆر گرنگی هەیە، چونکە ئەم پرسە یەکێکە لەو ئاسانکاریانەی تێگەیشتن لە زەین و هزری شیعریانەی حاجی قادرمان بۆ ئاسانتر دەکات. من هەرچییەک لەم توێژینەوەیەدا دەیکەم وەک تەواوکارێک دەبێت بۆ ماندوویی ئەو دوو مامۆستایە، لەگەڵ هێنانە پێشەوەی چەند پرسیار و بابەتگەلێکیی دی کە ئەوان کەمتر لیی دواون. مەسعود محەمەد، لە چەند شوێنێکی سیانەییەکەیدا (حاجی قادری کۆیی)، پرسی شوێنی لە ئەزموونی حاجیدا هێناوەتە پێش، کە پاشتر ئاماژەیان بۆ دەکرێت.

هەروەها مامۆستا جەعفەر (فازیل کەریم ئەحمەد) لە چوارچێوەی تێگەیشتن لە شوێن و شار، چەند پرسیارێکی شیاو ئاراستەی ئەزموونی شارنیشینیانەی

---

[1] مەسعود محەمەد: حاجی قادری کۆیی، بەرگی 1، 2 و 3. هەولێر: دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس، چاپی دووەم، 2010

[2] فازیل کەریم ئەحمەد (مامۆستا جەعفەر): مێژووی بیری کوردی. "حاجی قادری کۆیی و پرۆسەی ویستەرنیزەیشن"، سلێمانی، لە بڵاوکراوەکانی دیداری جیهانیی مەولاناخالیدی نەقشەبەندی 3، ل:411، 458، 2009.

حاجی قادر دەكات و دەگاتە ئەو ئەنجامەی كە لە شیعری حاجیدا هەست ناكەیت لە پایتەخت ژیابێت. مامۆستا جەعفەر، دەنووسێت: (حاجی قادر كاتێک ڕووی كردۆتە ئەستەمووڵ، پیاوێكی كامڵ بووە. گەر خەملاّندنی تەمەن و ساڵی كوردستان بەجێ هێشتنی تەواو دەرچێت و سەرلەنوێ سێبەری گومان نەخرێتە سەر بەڵگەكانی مامۆستا مەسعود محەمەد، ئەوە ساڵی 1824 لە دایک بووە و پاش ساڵی 1863 بۆ پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی سەری خۆی هەڵگرتووە. واتە: ئەو كاتە تەمەنی نزیكەی چل ساڵ بووە... چل ساڵ.. ئیدی بۆ فێربوون و خۆڕاهێنانی بنەڕەتی، هەروا ئاسان نیە و مێشک و ئامادەیی وەرگرتی وەكو هەڕەتی لاوی نامێنێ.. حاجی قادر لەم دەستوور و ڕێسایە بەدەر نەبووە.)[1].

هەرچەندە پەیوەندیی شوێن و هەستەكانی مرۆڤ، كەمتر پەیوەندیی بە تەمەنەوە هەیە و مرۆڤ لە هەر قۆناغێكی تەمەنیدا پەیوەندییەكی تایبەت لەگەڵ شوێنە جۆربەجۆرەكان دەبەستێت، بەلاّم دیسانەوە ئەم قۆناغەی تەمەن بەپێوەری ئەوسای گەشەی بایۆلۆژی جەستە و

[1] فازیل كەریم ئەحمەد، سەرچاوەی پێشوو، ل: 420- 421.

هەستەکان و ڕێژەی تەمەنی مرۆڤ لەو سەدەیەدا، بۆی هەیە کاریگەریی لەسەر بێزاربوونی حاجی لە شوێن، یان هەستکردنی بە بێ شوێنی کردبێت و هەستی لە شوێنوەرسیی تیایدا خەملاندبێ. ئەوەی لە لێکدانەوەکەی مامۆستا جەعفەردا گرنگە و هەمان ئەو پرسیارانەیە کە من مەبەستمە زیاتر لێیان بکۆڵمەوە، ئەمەیە:
(لە هەندێ بڕگەدا هەست ناکەیت شاعر لە پایتەخت دەژی: شەقام و تەلار و کەناری دەریا و بازاڕ و دوکان و دائیرەی حکومەتی بەدی ناکەیت. ئەو بە لەش لە شارێکی گەورەی نیمچە ڕۆژهەڵاتی و نیمچە ڕۆژئاوایی بە ناچاری گیرساوەتەوە، بەڵام بە دڵ و بە گیان و هەست و نەست لەناو لادێ و بن ڕەشماڵ و دیوەخانی گەورەپیاوانی کوردستانە)[1]. هەروەها لە شوێنێکی دیکەشدا دەنووسێت: (دەنگی شاعیر، دەنگی تاراوگە نیە، ئەو لەکاتی شیعر وتندا ڕووی لە کۆڵان و گەڕەکەکانی ئەستەموول نیە)[2].
لەبەشێکی زۆری ئەم لێکدانەوەیەدا ڕاستییەکی تەواو هەیە. ونبوونی پایتەختی عوسمانی، کە ئەوسا پێشنموونەکەی پاریس بووە، وەک بەشێک لە ونبوونی

---

[1] فازیل کەریم ئەحمەد، هەمان سەرچاوە، ل: 421-422
[2] هەر ئەوی، ل: 423

شوێن، جێی پرسیارە. هەرچەندە تەمەن و هەستی شوێن و یادوەریی لەسەر شوێن، لە تەمەنێکدا ناوەستێت مەگەر مرۆڤ بچێتە دۆخی بێهەستییەوە، بەڵام هیچ لەو ڕاستییە ناگۆڕێت کە بۆچی ئەزموونی شاری ئەستەمبووڵ ئەوەندە لە شیعری حاجیدا ونە.

لە ڕووی تیۆرییەوە، پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن، وەک پەیوەندیی مرۆڤ و کات، پەیوەندییەکی بەردەوامییە. مرۆڤ بە جەستەی ئەزموونی شوێن دەکات و تایبەتمەندیەکانی شوێن (دیمەن، بۆن، جێگەکان، چێژ، کەسەکان..) لە یادوەریی خۆیدا نیشتەجێی دەکات، بە هەمان شێوەش کاتێک جەستە شوێنگۆڕکێ دەکات، بەتایبەتی ئەگەر شوێنەکان زۆر جیاواز بن وەکئەوەی جیاوازیی هەبووە لە نێوان کۆیێ و ئەستەمبووڵدا، ئەوە جارێکی دی کراوەیە بۆ ئەزموونکردنی شوێنی نوێ و جێگەکانی. لەم ڕوانگەیەوە، هەروەکو پێشتریش لە توێژینەوەیەکی دیکەدا باسمکردووە، شوێن مانایەکی کولتووریشی هەیە و بریتە لەو شوێنانەی کە مرۆڤ لە فەزای گشتی جیایان دەکاتەوە[1].

---

[1] ڕێبوار سیوەیلی: شوێن و شوناس. خوێندنەوەیەکی دیاردەناسانە بۆ شاری سلێمانی. ل: 90- 95.

بەلای هەندێک لە توێژەرانەوە، بوونی شوێن بریتیە لە هەبوونی مرۆڤ لەو شوێنەدا و کردنی بە شوێنێک بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتیی و هەستەکیەکان. بەمجۆرەش شوێن شوێنێکی بەرهەمهاتووە لە ناو بۆشایی فەزادا. هەر بۆیەش گوتراوە، شوێن بریتیە لە بەشێک لە فەزا کە بەهۆی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانەوە دەستنیشان دەکرێت. ئەم بۆچوونە جەخت لەسەر تێگەیشتنە دیاردەناسییەکانی هایدەگەر دەکاتەوە بۆ شوێن، وەک شوێنی نیشتەجێبوون و تێدامانەوەی مرۆڤ[1].

ڕاپاپۆرت، لەو بڕوایەدایە شوێن یەکێکە لەو چوار ڕەگەزەی کە بەهۆیەوە دەتوانین پێناسەی فەزا، یان ژینگە بکەین، ئەوانیش بریتین لە: (مانا، کات، پەیوەندییەکان و دەوروبەر)، (ئامۆس راپاپورت: مانای دەروبەری دروستکراو، 2005). بەمجۆرەش، سەرقاڵیی تاک بەو دەروبەر و فەزایەوە کە تیایدا دەژی، دەبێتە هۆی دروستبوونی شوێن و ئەمەش تا ئەو سنوورەی کە ئەم شوێنە لە شوێنەکانیتر جودا بکەینەوە.. شوێن

[1] لەم بارەیەوە و بۆ تێگەیشتن و بەدواداچوونی زیاتر سەبارەت بە بیروبۆچوونەکانی هایدەگەر لەبارەی شوێن بە گشتیی و تەلارسازی بە تایبەتی، بڕوانە ئەم وتارە درەخشانە: کریستیان نوربرگ-شولتز: *اندیشه‌های هایدگر در باب معماری* در: معماری: معنا و مکان. ترجمە: ویدا نوروز برازجانی، تهران: نشر جان جهان، 1382، صص: 59-84

دەسازێنرێ و بینادەکرێت و لە فەزا جیا دەکرێتەوە. هەروەک ئەوەی هایدەگەر لە وتاری (دروستکردن نیشتەجێبوون و هزرین)دا ڕوونیکردۆتەوە[1] و پاشتر لێی ورد دەبمەوە.

ئەم بۆچوونە پێماندەڵێت: پەیدابوونی شوێن بەرهەمی چالاکیی و کار و بیرکردنەوە و هەوڵدانە، کە بەهۆیەوە مرۆڤ ڕووبەرێک لە بۆشایی و دەوروبەری خۆی لە پانتاییەکی گشتییەوە دەکاتە شوێنێکی تایبەت و بینای دەکات.

کەواتە شوێن بەرهەمی گۆڕینی بەشێک لە فەزایە بۆ پانتاییەک، یان ڕووبەرێک کە تیایدا مرۆڤ هەڵدەستێت بە هەڵسوکەوتە ماناەدارەکانی خۆی و دروستکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسانیتر و ئەو دەوروبەرەی تیایدا دەژی.

بەم پێیەش بوونی مرۆڤ لەسەر شوێن، یان لە شوێندا، پێشمەرجی مانابەخشینە بەو شوێنە وەک شوێنێکی تایبەت. ئەوە پەیوەندیی تاک و گرووپە مرۆییەکانە بەو شوێنانەوە کە لەسەریان دەژین، کە ئەو شوێنانە دەکاتە

---

[1] مارتین هایدیگر: شعر، زبان و اندیشەی رهایی. مترجم: دکتر عباس منوچهری. تهران، انتشارات مولی، ص: 16-17و بەرەودوا.

شوێنی تایبەت و بەو جۆرەش جیایاندەکاتەوە لە شوێنە بیابانی و چۆڵەکان.

مرۆڤ وەک پێویستییەکی بوونگەرایانەی خۆی لەگەڵ شوێن یادوەریی دەبێت، پێوەی پابەند دەبێت، هەست بە ئارامی و ئاسوودەیی و دڵنیایی دەکات، هەست بە ئاسایش و متمانە دەکات و بەوجۆرە. بۆیە شوێن بۆ ئەو دەبێتە شوێنێک کە وەک بەشێک لە شوناسی خۆی دەیبینێ و ئەم شوێن وەک شوناس بینینە بیرکردنەوەی ئەویش دەگرێتەوە. چونکە مرۆڤ کاتێک بیر لە خۆی دەکاتەوە، لە پەیوەندیی بەو شوێنانەوە خۆی بیر دەکەوێتەوە، کە هاوشوناسی لەنێوانیاندا دروستبووە[1].

مامۆستا فازیل کۆی قسە و لێکدانەوەکانی بۆ ونبوونی شار، پایتەخت، یان شوێن لە ئەزموونی حاجی قادردا دەگێڕێتەوە بۆ پابەندبوونی ئەو بە پەروەردە و پێگەی چینایەتیانە و پەیوەندییە باوکسالارییەکانی و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ونبوونی ئەستەمبووڵ لە ئەزموونی حاجی و ئامادەیی و ناوهێنانی گوندەکانی نێوان تەقتەق و کۆیێی ناوەڕاستی سەدەی 19 هەروا بە ڕێکەوت بە تەنیشت یەکەوە ڕیز نەکراون. ئەمە ئەنجامی ئەو

---

[1] د. مصطفی بهزادفر: هویت شهر. نگاهی به هویت شهر تهران. تهران، نشر شهر، 1390، ص: 65-66

ڕاچەڵەکین و حەپەسان و سەرسوڕمانە بووە کە حاجی خۆی تێدا بینیوەتەوە[1].
بێگومان ڕۆڵ و کاریگەریی پەروەردە و پێگەی چینایەتی و هزری باڵادەستی باو، نەقشیان هەیە لە دروستکردنی تێگەی شوێن لە بیرکردنەوەی مرۆڤدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی بەتەواوی شوێن دەخاتە چوارچێوەی ئەزموونی تاکەکەسەوە، بوونی ئەو کەسەیە لەو شوێنە وەک جەستەیەکی سەربەخۆ. بۆیە هەر شوێنێک بۆی هەیە ببێتە شوێنێکی مانادار بەبێ ئەوەی مانای شوێن بە شێوەیەکی ناچارەکی و جەبری پابەند بێت بە ڕابردووەوە. شوێن لە هەر ئێستایەکی ژیانی بکەردا، بۆی هەیە مانابەخش و دروستکەری شوناس و شوناس وەرگر بێت لەلایەن مرۆڤەوە. مادامەکی حاجی قادر وەک مرۆیەکی زیندوو و خاوەن هەست لەو قۆناغەی تەمەنیدا لە ئەستەمبووڵ بووە، ئەزموونکردنی ئەو بۆ شوێن، یان شار شتێکی حەتمیە، بەڵام هۆکاری ڕەنگنەدانەوەی ئەم ئەزموونە جێی مشتومڕە. هەندێکیان پەیوەندییان بە بێزاریی لە شوێنەوە هەیە، هەندێکیتریش بەو سنوورانەی

---

[1] فازیل کەریم ئەحمەد، سەرچاوەی پێشووتر، ل: 438.

هەندێ شوێنی تایبەت لەبەردەم ئازادیی تاکەکەسدا قوتیاندەکەنەوە.
لە دۆخی حاجی قادردا هەردوو ئەم هۆکارە ئامادەن، واتە هەم لە ئەنجامی ئەو ڕاچەڵەکین و حەپەسان و سەرسوڕمانە بووە کە مامۆستا فازیل گوتویەتی حاجی دووچاری بووە و ئەمەش ئەوی لە ناخدا بەسەرخۆیدا شکاندۆتەوە کاتێ بەراووردی کۆیێ و کوردستان و ئەستەمبووڵی کردووە[1].
ئەو بەراووردکردنە شتێکی سرووشتییە و پرۆسەیەکی ناخەکیشە کە مرۆڤ لەکاتی شوێنگۆڕکێ و بەجێهێشتنی شوێنی یەکەم، لەگەڵ شوێنەکانی دیکە بەراووردی دەکات. بۆ ئەوەی حاجی هاوسەنگییەکیش لە ئاستی هەستەکیدا دروستبکات و وەڵامی هەندێ پرسیار و خۆدواندنئامێزی ناخی خۆی بداتەوە، هاتووە بە جەختکردنەوەی لەسەر جوانیی سرووشتی کوردستان، جوانیی شارستانیانەی ئەستەمبووڵ و دیاردەشارییەکانی

---

[1] بۆ باسێک لەبارەی هەڵوێستی کورد لە شار، بڕوان: مارتین ڤان برونسن الكرد والمدينة الترجمة عن الإنكليزية: راج آل محمد. http://www.medaratkurd.com

دیکەی ڕەتکردۆتەوە و قەرەبووی دواکەوتوویی کۆمەڵگای کوردی پێکردۆتەوە.. لە هەمان کاتیشدا، پێناچێت ئەستەمبووڵ وەکئەوەی بۆ ئەورووپایی و میللەتانی سەردەستە، بەهەشت و شارێکی سەرسووڕهێنەر بووبێت و هەمیشە لە پێگەی خەڵکی خاوەن ژیاری پێشکەوتوودا، پێشوازیی لێکردوون[1]، بۆ خەڵکی ژێر دەسەلاتی پاشکۆی عوسمانی، کورد و ئەرمەن و میللەتانی دیکە، ئەو بەهەشتە بووبێت و زیاتر لە گیتۆیەک (شوێنی دەستبەسەربوون)، چووە، کە تیایدا ئەو پێگە و پیشە و پلە کۆمەلایەتیەی پێداون، کە بەشێوەیەکی جەبری لە دۆخی پاشکۆییدا بیانهێڵێتەوە.

ڕەنگە ئەم جەبرە لە ئاستی سیاسی و لە تێڕوانینی فەرمیی عوسمانییەکاندا شوێنگەلێکی تایبەتیشی بۆ کەسانی سەر بە میللەتە ژێر دەستەکان، پێشنیار کردبێت و لە ئاستی شوێن و جێگەی مانەوەشدا، هەمان جەبر کاری خۆی کردبێت و ئەو کەس و گەلانەی ناچار کردبێت تەنیا لە شوینگەلێک و ناو فەزایەکی کاری و ژیانی پیشەییدا بمێننەوە..

---

[1] برنارد لويس: أستنبول و حضاره الخلافه العثمانيه. تعريب: د. سيد رضوان علي. دار السعوديه للنشر و التوزيع، 1982، ص: 135

## پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن:

ئامانجی من لەم باسەدا، ئەوەیە لە پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن لەسەر بنەمای ئەزموونی شیعریی حاجی قادری کۆیی، بکۆڵمەوە.

ئەدەبیات و شیعر، بە دەر لە ناوەڕۆکە مانایی و ئیستاتیکیەکانیان، کە ئەدەب و شیعریان پێوە دەناسرێتەوە، گەلێک پەیوەندیی مرۆڤ و دیاردەی دیکەش ڕووندەکەنەوە، لەوانەش کات و شوێن. ئایا دەروونمایەی کات و شوێن چ شتێکی گرنگمان لەسەر ئەزموونی حاجی بۆ ئاشکرا دەکات و چ یارمەتییەکیشمان دەدات لەبارەی تێگەیشتن لە شیعرەکان و جیهانبینییەوە؟ شوێن لە ئەدەبیاتدا چۆنچۆنی دەخرێتە ڕوو، یان ڕەنگدەداتەوە و توێژەران و بیرمەندانی بواری شوێنناسی چ پۆلێنکارییەکیان بۆ پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن هەیە.. لەسەروو هەموو ئەوانەشەوە، ئەزموونی حاجی ئەزموونێکی زۆر تایبەتە، چ ئەو بەشەی ژیانی کە لەکوردستانی سەردەمی خۆیدا و بەجەستەی خۆیەوە بینیویەتی ئەزموونی کردوە، چ ئەو کاتەش ئاوارەی دوورەوڵاتی دەبێت لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە بەدواوە، تا کۆچی دوایی لە شاری قوستەنتینیە، یان ئەستەموولی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی سەر دەنێتەوە.

من لەم کارەشمدا و لە کارەکانی دیکەشمدا لەسەر هەردوو شاعیران، نالی و مەحوی[1]، ئەنگیزەیەکی فەلسەفیشم هەیە و لەو بڕوایەدام کە ئەم گەورە شاعیرانەی کورد، چەندین چەمک و دەستەواژە و بیرۆکەی فەلسەفییان لە بەرهەمە شیعرەکانیاندا خستوونەتە ڕوو، کە ڕەخنەی ئەدەبیی کەمتر خۆی لە هەندەر توێژینەوەیان داوە. حاجی قادر لە هەردوو بواری چەمکی کات و شوێن، ئەمکارەی کردووە و تێگەیشتن لەم بیرۆکانە هەم پلەی شاعیریتی و هەم شیعری بیرمەندانەی ئەو دەباتە سەرێ.

## جۆرەکانی پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن:

مرۆڤ بوونەوەرێکی شوێنژیی و شوێنبووە. کورد پەندێکی هەیە، دەڵێت: (*بزن بۆ شەوێکیش جێی خۆی خۆشدەکات*). ئەم پەندە باسی ئاژەڵ ناکات، هێندەی ئەوەی وانەیەکە بۆ مرۆڤ. لە ڕاستیدا ئاژەڵ و

---

[1] هەروەک ئەوەی لە (کتێبی نالی)، چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی و دەزگای زەریاب، 2015 و هەروەها لە زنجیرە وتاری (خود و شوناس: خوێندنەوەیەکی بوونخوازیانەی عیرفانی مەحوی، 2014)، ئەنجامم داوە.

خشۆکەکانیش پەیوەندییەکی تایبەتیان بە شوێنەوە هەیە، چ بۆ مانەوە، چ بۆ هێلکە دانان و چ بۆ زاووزێ. لەبەر ئەوە ئاژەڵ و خشۆکەکان لەم ڕووەوە پێشنموونەن بۆ مرۆڤ کە چۆن پەیوەندی لەگەڵ شوێندا دەگرێت. لە پەندە کوردییەکەدا بزن بۆتە سەرمەشق، بۆ ئەوەی مرۆڤ هەمان شت بکات کە بزن دەیکات و شوێنی حەوانەوەی خۆی دابین بکات. لەگەڵ ئەوەشدا شوێن، تەنیا هەر شوێنی حەوانەوە نیە، شوێنی نیشتەجێبوون نیە، بەڵکو شوێنی بەردەوامیدانیشە بە ڕەگەزی مرۆیی و شوێنێکی تایبەتیشە کە تیایدا تاکە مرۆڤ لەگەڵ خۆی و مرۆڤەکان لەگەڵ یەکتر دەکەونە پەیوەندییەوە.

مرۆڤ لە مێژوودا بە یەک شێوە پەیوەندیی لەگەڵ شوێن، سرووشت، شوێنی کۆمەڵایەتی، کولتووری، یان جوگرافیایی نەبەستووە. سرووشتی پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن، ڕێگە بە جیاوازیی و فرەیی دەدات. هەرچەندە هیچ هاوڕاییەک لەسەر پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن و جۆرەکانی نیە، بەڵام زۆربەی شوێنناسان و فەلسەفەکاران و توێژەرانی ئەم بوارە، لەسەر جیاوازیی ئەو پەیوەندیانە کۆکن. بەگشتییش باس لە سێ جۆر پەیوەندیی دەکرێت کە بەهۆیانەوە مرۆڤ و شوێن لە

پەیوەندیدان، بەبێ ئەوەی چۆنایەتی ئەو پەیوەندییە دەستنیشان بکرێت.
هۆکاری ئەوەی کە پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن یەکئاراستەیی نییە و ئەزموونی مرۆڤیش لە شوێندا چوونیەک نیە، هەر بە تەنیا ناگەڕێتەوە بۆ بەهێزی و لاوازیی توانای ئەو لە دەربڕینی ئەو هەستە خودییەدا کە دەیبەستێت بە شوێنەکانەوە، بەڵکو شوێنەکانیش لە بەدەنگهێنانی هەستەکانی مرۆڤدا بۆ خۆ دەربڕین، کاریگەریی خۆیانیان هەیە. مرۆڤ لە کوێ دەژی و ئەزموون دەکات، یان کوێ جێدەهێڵێت و کوێ لە بیرەوەریی خۆیدا لەگەڵ خۆی دەبات و لە کوێوە بیری کوێ دەکات و نۆستالیژیانە و مێژووییانە و کولتووریانە بەرهەمی دەهێنێتەوە، یان کوێ دروستدەکات و بۆچیی بەکاریدەهێنێت، هەموویان بەشدارن لە بەهێزی ئەو پەیوەندییەدا کە مرۆڤ دەبەستێت بە شوێنەوە. هەر بۆ نمونە: مرۆڤ لە شوێندا ماڵ چێدەکات، لە ماڵدا ژوورەکان کە هەریەکەیان ئەرکێکی هەیە. لەهەر ژوورێکدا جێگە تایبەتەکان، (کونج و دەلاقە و کورەخانە و ئاگردان و تاق و پەنجەرە و..)، هەریەکەیان ئەرکێکی تایبەتیان هەیە و بۆ مەبەستێکی تایبەت دروستدەکرێن و

ئاستێکی تێگەیشتن و جیهانبینی و کولتووریی مرۆیی پەرچ دەکەنەوە.
بەمجۆرەش شوێن هەر تەنیا ڕووبەرێکی جوگرافیایی نیە کە ئێمە لە ساتەوەختێکدا کە پێویستە و توانای مادیی و بەدەستهێنانی کەرەستەمان هەیە، خانووێکی لەسەر دروستدەکەین. شوێن بۆخۆی ڕەنگدانەوە ئەو جیهانبیی و کولتوورەشە کە ئێمە بەهایەکی تایبەتمان بۆی هەیە و لە ساتی بیناکردن و جیاکردنەوەی شوێنە تایبەتیەکان لە ڕووبەرە جوگرافییەکان و فەزا، ئەو بەهایانەش بەرجەستە دەکەین کە کولتوورێکی گشتیی تایبەت بە پاشخانە ئەفسانەیی، کولتووری و مێژووییەکەیەوە، تیاماندا نیشتەجێی کردووە. بۆیە ئەو خانووەی ئێمە درستیدەکەین، هەر تەنیا قەبارەیەک نیە بۆ نیشەتەجێبوون، بەڵکو ڕەنگدانەوەی ئەو بەهایانەشە کە ئێمە لە ژیاندا گرنگییان پێدەدەین و لە ڕێگەیانەوە حەوانەوەی خۆمان دەستەبەر دەکەین و لە فۆرمی ئەو قەبارە مادییەدا کە خانووە، یان شوێنی نیشتەجێبوون، بەرجەستەمان کردووون.
لەم ڕوانگەیەوە، ئامۆس ڕاپاپۆرت، لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤ بەردەوام لە هەوڵی ڕێکخستنەوەی فەزای دەوروبەریدایە و ئەمەش پێشمەرجی ناسینی ژینگەی

دەوروبەرە. (زەینی مرۆڤ هەمیشە پێویستی بەوەیە فەزا لەسەر بنەمای پۆلێنکاری و ناونان و جیاکردنەوەی جێیەکان (فەزاکان) لەیەکتری، پۆلێنکاری و جیاکردنەوە، کە بناخەکانی ناسین و ماناداركردنی بوونن، ڕێکبخاتەوە)[1].

توێژەرانی وەک (کریستین نوربێرگ شولتز، ئیدوارد ڕۆڵف، ئیدوارد هاڵ، ویسلی کورت، هێنری لوڤیفر ئامۆس ڕاپاپۆرت و..) هەریەکەیان و تا ڕاددەیەکی زۆر بە شوێنپێهەڵگرتنی هایدەگەر، بە جیا لە جۆرەکانی شوێن و فەزا و پەیوەندیی مرۆڤ پێیانەوە، توێژینەوەیان کردووە. بۆ نمونە ڕۆڵف، لە کتێبەکەیدا باس لە چەند جۆر شوێنی جیاواز دەکات و بەپێی پەیوەندیی مرۆڤ بەو شوێنانە و ناوەڕۆکی پەیوەندییەکەوە، ناویان دەنێت: شوێنی (*سەرەتایی، ئیدراکی، بوونایەتی، پیرۆز،* جوغرافیایی، *بیناسازیی، مەعریفی و شوێنی ئەبستراکت*)[2]. کریستین نوربیرگ شولتز، لە کتێبە نایابەکەیدا: (*ڕۆحیی شوێن:*

---

[1] ایموس راپاپورت ."*خاستگاه های فرهنگی معماری*" ترجمه صدف ال رسول و افرا بانک، فصلنامه خیال، شماره 8، زمستان 1382، ص: 64

[2] ادوارد رلف: مکان و بی مکانی. ت: د. محمد رضا نقصان، د. کاظم مندگاری، مهندس زهیر متکی، تهران، انتشارات ارمانشهر، 2002، صص: 14-37.

*بەرەو دیاردەناسیی تەلارسازی)*[1]، باس لە شوێنی (*سرووشتی و شوێنی مرۆڤساز*)، دەکات و ئەوەی یەکەمیان بە سەرەتاییترین ئەزموون و پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شوێن دادەنێت[2]. ڕاپاپۆرت لەو بڕوایەدایە کە مرۆڤ بەردەوام شوێنەکان بەبێی ئەو کولتوور و بەهایانەی هەڵگریانە، بەرهەمدەهێنێتەوە[3]. هەندێکیتر، باس لە سێ جۆر شوێن و فەزا دەکەن، وەک (زەینی، *یان خۆماڵی، بابەتی، یان جیهانی و کولتووری یان بەکۆمەڵی*). ئەمە جگە لەوەی کەسانێکیش لەسەر ئاستی دابەشبوونی جوگرافیاییەوە، شوێنەکان لێکدی جیا دەکەنەوە: "بەرینترین ڕووبەری شوێن بریتیە لە ئاستە مەزنە جوگرافیاییەکە، کە دیمەن و بەرز و نزمییەکانن. ڕووبەری ناوەندیش بریتیە لە ناوچەی شاران. لە

---

[1] کریستین نوربیرگ- شولتز: روح مکان. به سوی پدیدارشناسی معماری. ت: محمد رضا شیرازی، تهران، رخداد نو، 1388 (2009).

[2] کریستین نوربرگ- شولتز: روح مکان. 2، مکان طبیعی، ص: 43-77.

[3] راپاپورت، آموس)1384)، معنی محیط ساخته شده: رویکردی در ارتباط غیرکلامی، ترجمه فرح حبیبی، تهران، انتشارات پردازش و برنامه ریزی شهری.

نزمترین ئاستیشدا فەزای بچووکی حەوانەوە و نیشتەجێبوونی کەسەکان دەبنێرێ"[1].

دابەشکردنی شوێن و فەزا بەشێوە کۆمەڵایەتیە مێژووییەکەی، لەلای هەنری لۆڤیفر دەبێتە سێ ڕووبەر: (*ڕووبەری جیهانیی، یان گلۆباڵ*)، (*ڕووبەری شارنشینی*) کە پێشتیدەگوترێت (*ڕووبەری تێکەڵ*) و ڕووبەری (*ژیانی ڕۆژانە، یان ڕووبەری تایبەت*)[2]. دابەشکردنێکی دیکەی شوێن و فەزا ئەوەیە کە باس لە فەزایەکی (گەردوونی)، یان (گشتی) دەکات، پاشان فەزای (کۆمەڵایەتی)، یان (سیاسی) و ئەمجا فەزای (تایبەت) یان (دەروونی)[3].

مرۆڤ بوونەوەرێکی گەردوونیە و لەمڕووەوە هیچ جیاوازییەک نیە. یەکەمین شوێن و فەزای کە مرۆڤ خۆی تیدا دەبینێتەوە، فەزایەکە لە ئاست بوونی ئەودا (پێشینە، بەرزترە و مرۆڤ و ئەو بونیادانەش دەگرێتە خۆی کە ژیان ڕێکدەخەن)[4]. بۆیە فەزای گەردوونی لە هەمان کاتیشدا گشتییە. ئەم ئاستە لە پەیوەندیی مرۆڤ و

---

[1] وسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن. ت: فرناز گنجی و دکتر محمد باقر اسماعیل پور. تهران: اوند دانش، چ: اول، 1391 (2012)، ص: 230.

[2] Henri Lefebvre :*The Production of Space*.Translated by Donald Nicholson- Smith. Blackwell Publishing1991.

[3] وسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن. (2012)، ص: 232.

[4] وسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن، ص: 45

گەردوون پەیوەندییەکی ڕاستەخۆیشی لەگەڵ سرووشتدا هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا مرۆڤ پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و سیاسیی خۆی هەیە و ئەمەش پەیوەندیی مرۆڤەکان بە یەکتر و پەیوەندیی مرۆڤ بە یاسا کۆمەڵایەتیەکانەوە دەگرێتە خۆی.

سێیەمین پەیوەندی مرۆڤ و شوێن لەسەر ئاستی تایبەت و کەسی، یان دەروونییەوەیە. ئەمە ئەو پەیوەندییە نزیکە دەگرێتەوە، کە مرۆڤ لە سەرەتاوە، لەگەڵ شوێن دروستیدەکات و شوێن پەیوەست دەبێت بە یادوەریی و نائاگایی هەر مرۆڤێکەوە[1].

هەموو ئەم دابەشکردن و پۆلێنکارییانە گرنگیی خۆیان بۆ باسەکەی ئێمە هەیە، چونکە دەبنە سەرەتایەک بۆ تێگەیشتنمان لە چۆنێتی ڕووانگە و پۆلێنکاریی حاجی قادر بۆ شوێنەکان. هەروەها ئەو ڕاستییەمان بۆ ڕووندەکەنەوە، کە لە هەموو ئاستەکانی دابەشکاریدا، (شوێنی تایبەت، جوگرافیایی و دروستکراو)، بە نەگۆڕیی دەمێننەوە. مرۆڤ لە فەزایەکی بایۆلۆژی و پێش ئاگاییدا

---

[1] ئەم سێ ئاستە دووبارە دارشتنەوەی ئەو دابەشکارییەیە کە لەم سەرچاوەیەی خوارەوەدا هاتووە: وسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن. (2012)، ص: 45-46

چاو دەکاتەوە و  دێتە ناو شوێنێکی سرووشتییەوە و لەوێدا شوێنی گشتی، یان کۆمەڵایەتیی خۆی چێدەکات و پاشان لەناو خۆیدا شوێنێک بەرهەمدەهێنێت، کە شوێنێکی زەینیی و ڕۆحییە. پاشان ئەو ڕاستییەشمان بۆ ئاشکرا دەکەن، کە پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن دوو پێشمەرجی نەگۆڕی هەیە: لەلایەکەوە هەموو پەیوەندییەکی مرۆڤ و شوێن، پەیوەندییەکی فیزکییە. مرۆڤ بە جەستەی خۆیەوە، لەگەڵ شوێندا پەیوەندیی دروستدەکات و بەبێ ئامادەیی جەستەیی لە شوێندا، پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن دروست نابێت. لەلایەکیتریشەوە، بۆ پەیوەندیگرتن لەگەڵ شوێندا هەر تەنیا ئامادەیی فیزیکی بەس نیە، چونکە پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن لایەنێکی مەعنەوی و ڕۆحیشی هەیە.

حاجی قادری کۆیی، هەم باسی گەردوون، جیهان و هەم باسی سرووشت و هەم باسی کۆیێ و گوندەکانی دەوروبەری کردووە، ئەمەش لە کاتێکدا ئەو باسکردنانەی دەکەونە ئەو بەشە لە ژیانییەوە کە لە ئەستەمبووڵ ژیاوە و بە دەگمەن نەبێت باسی ئەو شارەی نەکردووە، مەگەر بۆ تانەلێدان و لەبەرچاوخستن و شکاندنەوەی نەبێت، ئەمەش لە کاتێکدایە ئەو ماوە زۆرەی حاجی قادر لە ئەستەمبووڵ ژیاوە، ئەو شارە

زۆرترین گەشەی شارسازیی بەخۆیەوە بینیوە و مەڵبەندێکی کولتووریی گرنگ بووە..

لەناو پەیوەندییەکانی حاجیدا بۆ نمونە بە کوردستانەوە، پەیوەندیی حاجی بە باشووری کوردستان بەهێز تر و لەوێشدا پەیوەندیی حاجی بە کۆیێ و دەوربەرییەوە لە هەموویان بەهێزترە. پەیوەندیی حاجی بە کۆیێ و دەوروبەرییەوە، هێندەی ئەوەی پەیوەندییە بە شوێنە سرووشتی و دیمەنەکانییەوە، ئەوەندە پەیوەندییەکی سیاسی جوگرافیانە نیە. پەیوەندیی حاجی بە کۆییێوە وەک شار، پتر پەیوەندییەکی زمانیی و کولتوورییە، ئەو بە زمان و شێوەزاریی ئەو شارە نووسیویەتی و ئەمەش ئینیتمای ڕۆشنبیریانەی ئەو بەو شارەوە ئاشکرا دەکات. بەڵام پەیوەندیی حاجی بە دەوروبەری کۆییێوە، لەوانەش شوێنی منداڵیی خۆی، بەتایبەتی بە گوندی گۆرقەرەج و ناوچە و گوندەکانی دەوروبەرییەوە، پەیوەندییەکی خەیاڵی و وێناکراوە و پەیوەندییەکی پێشزمانی و پێش ڕۆشنبیرییە.

ئەو وێنە و دیمەنانەی حاجی باسی ئەم ناوچانەیان پێدەکات زۆر هەستەکین، نەک زەینی و ڕۆشنبیری و ئەبستراکت و ئەندازەییانە. حاجی لە وەسفی ئەم شوێنانەدا لە ئەزموونی پێشینەی خۆیەوە کە لە

یادوەرییدا هەڵیگرتوون، یان بەرهەمیان دەهێنێتەوە، دێتە دەنگ. وێنەکان پڕن لە دەنگی بیسراو، لە دیمەنی بینراوی ڕەنگاوڕەنگ. بەڵام ئەو وێنانەی حاجی بۆ وەسفی کۆیێ وەک شار دەیانکێشێت، لە سەرچاوەیەکی هزری و لە پاشخانێکی ڕۆشنبیرییەوە دەیانهێنێت و لە وەسفی گەڕەک و سەیرانگا و قەڵاکانی کۆیێ و دەوروبەری، نیگایەکی ئەندازیارانە، جوگرافیانە و مێژووییانەی هەیە..
پەیوەندیی جوگرافیانەی حاجی زیاتر بە کوردستانی گەورەوەیە، کە ئەو هەمووی ئەزموون نەکردووە و نەیبینیوە. لەدوای ئەمانەش، پەیوەندییە زەینیی و دەروونییەکانی حاجی بە کۆیێ و دەورەبەرییەوە، زۆر بەهێزترن وەک لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتوورییەکانی. ئەو ڕەخنەگرێکی ڕاشکاو و سەرسەختی کولتووری باڵادەستی شارەکەیە. بۆیە ئەم پەیوەندیانە وەک تایبەتیترین بەشی پەیوەندییەکانی حاجی بە شوێنەوە، دەمێننەوە، لە کاتێکدا ئەو چێتر لەو شوێنانە ناژی و ئەو شوێنانەی (بە دەروونیکردوون) دوائیەوەی بە جەستە ئەزموونی کردوون. بۆیە بۆ ئەوەی باس لە پەیوەندیی مرۆڤ بە شوێنە تایبەتییەکانەوە بکەین، مەرج نیە ئەو مرۆڤە بە کردەیی لەو شوێنانەدا بژی، بەڵکو پێویستە لە چۆنێتی

بەرهەمهێنانەوەیان لە زمان و دەقەکانیدا، یان لە بەرهەمەکانیدا، تێبگەین.
من سەرەتا لیستی ناوی زۆربەی شوێنەکان بەپێی پۆلێنکردنێکی سیانەیی، لە شیعرەکانی حاجییەوە دەردەکێشم. پاشانیش لەسەر سێ ئاستی پێشنیارکراو، لێیان دەکۆڵمەوە و ئەو پەیوەندییانە دەدۆزمەوە کە حاجی دەبەستن بەم شوێنانەوە. ئەمکارە وەک سەرەتایەک و دەستگیرۆییەکی خوێنەر دەبێت، بۆ تێگەیشتنێکی گشتیتر لە چەمکی شوێن لە شیعری حاجیدا، کە لە بەشەکانیتردا توێژینەوەی وردتریان لەبارەوە دەکرێت. ئەمەش لەو پێناوەدا کە خۆمان بەدوور بگرین لە سەپاندنی هەر جۆرە تیۆریەکی پێشوەخت کە لەزەمینەیەکی کولتووریی دەرەوەی ئەوەی شیعری حاجی بانگەشەی دەکات، لەبابەت ناسیۆنالیزم، کە دەستنیشانکردنێکی ئایدیۆلۆژیانەیە نەک کولتوریانە و هەستەکی.

## لیستی ئاماژەکانی شوێن/شار
## لە شیعری حاجی قادردا

**زارەوەکانی شوێن و ناوی جێگە و شتەکان:**

(ئەرز، زەوی، فەلەک، خاک، جێ، شوێن، ئەولا، ئەملا، مەکان، کونج، کۆلان، شار، دێ، دیهکەدە، مولک، بازاڕ، باغ، کەلاوە، خانە، خانی، بێ خانی، بارەگا، مەلعەبە، خان، کولبە، سەدد، خەندەک، جەننەت، گەمی، گەرمێن، کوێستان، تەکیە، مزگەوت، ماڵ، دار، دەر، دەیر، دیار، دەرگە، وەتەن، سەرا، مەدرەسە، مۆڵگە، مەسجید، میحراب، مینبەر، مەرقەد، تاق، ڕەواق، ڕەشماڵ، دێ، قەندیل، تەخت، سەفینە، مەیخانە، ئەدەبخانە، قەسر..)

**ناوی شوێنی سرووشتی و**
**شوێنی جوگرافی و هەرێمەکان و شار و ناوچەکان:**

(شاخ، داخ، چیا، کێو، کەژ، کانی، قەڵات، خیتتە، جیهان، ویلایەت، طور، بەحر، خۆشناو، ئاکۆ، دەماوەند، سەفینە، دەشت، قوستەنتەنیە، ڕۆما، ڕۆم، بەغدا، فرانسز، جەزیرە، وان، مەرعەش، ئەرمەنستان، سەنەندوج، سنە، ڕەواندوز، خێوە، بوخارا، تاران، کوردستان، هێندستان، مازندەران،

یەمان، یەمەن، ئوروپا، سوودان، بولغار، سێرب، یۆنان، ئەرمەن، قەرەتاغ، مەککە، مەدینە، ژاپۆن، عێراق، داغستان، قازان، شیراز، ئەسفەهان، حەریر، گودینگان، موسڵ، سولەیمانی، بەردەشان، سابڵاغ، ڕەی، بانە، جەزیرە، بۆتان، عوممان، بەحری عوممان، باڵەک، سنگوڕە، لاجان، ئاکۆ، دەشتی بیتوێن)..

ناوی شوێنەکانی کۆیێ و دەوروبەری (بەبێ گۆڕقەرەج):
(کۆیێ، گۆلەشین، تەکەڵتوو، قوشخانە، ئیچ قەڵات، قشڵە، چنارۆک، حەمامۆک، کەکۆن، هەیبەسوڵتان، شیوی ڕەزان، هاموون، حاجی قەڵا، ئاوەگردە، ئیچ قەڵا، قۆچ پاشا..)

کاتێک لەم لیستانە ورد دەبینەوە، دەبینین کە بە شێوەیەکی گشتی شوێن لەلای حاجی قادر دابەشبووە بەسەر سێ جۆردا، یەکەم شوێنی گشتی، شوێنی تایبەت و شوێنی خودی. یان لە پۆلێنکردنێکی دیکەدا، کە پتر لە بواری ئەم توێژینەوەیەوە نزیکە، حاجی قادر بە سێ جۆر باسی شوێنی کردووە: شوێنی (هزرکراو)، یان (خەیاڵلێکراوە)، شوێنی (ئەزموونکراو) لەگەڵ بەکارهێنانی (زاراوەکانی شوێنناسی). دەبێت ئەوەش بڵێم، کە حاجی

له شیعرەکانیدا باسی فەزا، یان (سپەیس)یشی کردووه و جیای دەکاتەوه له شوێنی سرووشتی و شوێنی دروستکراو، ئەمه جگه له جیاکارەی ئەو بۆ شوێن و جیگا.:

یەکەم): شوێنی هزرکراو، یان خەیاڵلیکراوه:

فەلەک به تیر و کەمانێ له ئێمه چوویته کەمین
شکارگاهی زەمینه، له چنگی کێوه دەچین!
(دیوان، ل: 104)

ئەم خەیمه که شەمسییەیی شاهەنشەهی ئەرزه
تا چادری نیلووفەری سەر تەپڵەکی بەرزه
ئەتنابی وەکوو توولی ئەمەل لاموتەناهی
ئەوتادی وەکوو کێوی ئوحود مەرکەزی فەیزه.
سەقفی وەکوو گەردوونه، شکافی وەکوو ئەنجوم
پەردەی وەکوو ئەدواری سەما ئەتڵەسی سەوزه.
(دیوان، ل: 119)

هەر دوێنی ئەهلی "سووودان" هەستانه پێ وەکوو شێر
بولغار و سێرب و یۆنان، هەم ئەرمەن و قەرەتاغ..
(دیوان، ل: 99)

هیند و داغستان و قازان و قەزەم
خێوە و هیند و بوخارا و خوارەزم
(دیوان، ل: 204)

مەنزڵی مەئمەن نەماوە ئێستە کە ئەییامەکە
ڕاحەتی مومکین نییە نەچییە مەدینە یا مەکە
(دیوان، ل: 267)

ئەمانە هەندێک نمونەی ئەو شوێن و فەزا و جێگە و ناوی وڵات و شارانەن، کە حاجی ناویان دەهێنێت و دەچنە خانەی شوێنی هزرکراوەوە و مەبەستی من لە شوێنی هزرکراو، یان خەیاڵلێکراوەی حاجی قادر، ڕوونتر دەکەنەوە.

شوێنی هزرکراو، مەبەست لەو شوێنانەیە کە حاجی قادر لە سەرچاوەکانی ڕۆشنبیریی خۆیەوە، (خوێندنی مەلایەتی، گەڕیدەیی و بیستن و خوێندنەوە و مەجلیسی زانایانی سەردەمی خۆیەوە، ناسیونی)[1] کە ئەم شوێنانە پانتایی جوگرافیایەکی گەورە داگیر دەکەن و تیایدا ناوی چەندین مەڵەبەند وڵات و قەڵەمڕەو و شوێن دێت کە

---

[1] بۆ باسی سەرچاوەکانی ڕۆشنبیریی حاجیی قادر بڕوانە: د. خانزاد عەلی قادر: زمانی شیعری حاجی قادری کۆیی و مەحوی و شیخ ڕەزای تاڵەبانی. بڵاوکراوەکانی ئەکادیمای کوردی، 2013، هەولێر، لە لاپەڕە 157-179.

حاجی هەندێکیانی لە سەفەرە کانی خۆیدا بینیون و تیایاندا ماوەتەوە، بەڵام هەندێکیشیانی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ نەبینیون و ئەزموونی نەکردوون. لەگەڵ ئەوەشدا دەیانکاتە بەشێک لە ناوەڕۆکی شیعرەکانی و لیستێکی دەوڵەمەندیان لە ناوی شوێنی ئەفسانەیی، مێژوویی، جوگرافی لێدروست دەکات و زۆربەشیان پێگەیەکی پێشینەییان لە ژیانی حاجیدا هەیە.

لەم ڕووەوە و بۆ ئاشکراکردنی ڕۆشنبیریی حاجی قادر، توێژەر مامۆستا جەعفەر، دەنووسێت: (شاعیر لە ژێدەری جیاوازەوە بیستویەتی، زانیارییەکەی لە دەستی دووەم و سێیەمەوە بە گوێزانەوە پێ گەیشتووە. بیستن و خوێندنەوە دەوری خۆیان لە دروستکردن وفراوانکردن و قووڵکردنەوەی (هۆش) هەیە، با نەگاتە ئاستی بینین و نزیکبوونەوە لە پێست)[1].

ئەم بەشە لە جوگرافیای شوێنناسیی حاجی قادر، هەرچەندەش نەبۆتە بەشێک لە ئەزموونی سۆبژەکتیف و بەرکەوتنی جەستەیی لە نێوان شوێن و خودی حاجیدا وەک ئەزموونکەرێکی شوێن، دروستنەبووە، بەڵام گرنگییەکەی لەوەدایە کە ئاشکرای دەکات، حاجی قادر

---

[1] فازیل کەریم ئەحمەد (مامۆستا جەعفەر): مێژووی بیری کوردی. "*حاجی قادری کۆیی و پرۆسەی ویستەرنیزەیشن*"، ل: 434.

مرۆڤێکی گوێبیست و خوازیاری فێربوون بووە و ئەوەی فێری بووە لە پرۆسەی بەرهەمهێنانی شیعریی خۆیدا بە شێوەیەکی گونجاو و پێویست، بەکاریهێناوە.
بۆیە شوێنناسی حاجیی قادر هەمیشە شوێنناسییەکە، کە تیایدا حاجی شوێنی ئەزموونکراو، یان بیستراو، لە شوێنی جوگرافییەوە دەگوێزێتەوە بۆ شوێنێک لەناو خەیاڵ و هزرینی خۆیدا. بەمجۆرەش، بکەر، یان سوژە بۆخۆی دەبێتە مانابەخش بە شوێن و شوێنە دەرەکییەکان، یان شوێنە جوگرافییەکان بە هۆی ئامادەیی خودێتی بکەر لە ناویداندا، مانای دیکە بەخۆیانەوە دەگرن.
لێرەوە (فەزا و شوێن، بەهۆی ئامادەیی سوژەوە شێوەی خۆیان وەردەگرن، ئەمەش بە مانای ئەوەیە شوێن و فەزا پابەندن بە ئامادەیی مرۆڤەوە، چ ئەو ئامادەییە مەجازی بێت، یان ئەزموونکراو)[1].
ئەم بۆچوونە بەتەواوی بۆ ئەو شوێنانەی دەکەونە خاکی کوردستانی گەورەوە، لە ئەزموونی حاجی قادردا،

---

[1] حمیدرضا شعیری: *نوع شناسی مکان و نقش ان در تولید و تهدید معنا*' لە دکتر فرهاد ساسانی: نشانەشناسی مکان، مجموعه مقالات نقدهای ادبی-هنری. (مجموعه مقالات هفتمین هم اندیشی نشانەشناسی)، تهران: انتشارات سخن، 1391 (2012)، ص: 98.

ڕاستن، وەلێ ئەو شوێنانەی کە دەکەونە دەرەوەی جوگرافیای کوردستانەوە، بۆ حاجی گرنگییان لەوەدایە کە وەک نمونە بۆ (پیاهەڵدان، سەربەخۆیی، چاولێکەری، یان نشوستی و بەکەم تەماشاکردنیان)، ناویان دەهێنێت و لە ئەنجامی بەدەروونیکردنەوە، یان بە جەستەییکردنەوە نین. واتە حاجی هیچ بیرەوەری و یادگارییەکی لەسەر و لەگەڵ ئەو شوێنانە نیە و تەنیا هەندە زانیارییەکیان لەسەر دەزانێت.

دووەم): شوێنی ئەزموونکراو:

(مەپرسە دەردی غەریبی و لەززەتی وەتەنم
ئەوی لە دەستی دەگریام ئەمێستە بۆی دەگریم).
(دیوان، ل: 88)

**لە غوربەت بە شاهی لە بیر ناکرێ**
**زەمانی جوانی و یادی وڵات**
**لە "قوشخانە"وە تا دەمی "ئیچ قەڵا"**
**لە "بایزاغە"وە تا مەحەللەی "قەڵات"**
(دیوان، ل: 60-61)

ئەمانە و چەندین نمونەی دی، ئەو شوێنانەن کە حاجی بۆ خۆی لە قۆناخە جیاوازەکانی تەمەنیدا، بەتایبەتیش لە

قۆناخی منداڵیی و لاویێتیدا ئەزموونی کردوون و پێکهێنەری زیهنیەت و میزاج و هابیتۆسی (تەبع)ی حاجین. ئەم شوێنانە ئەو شوێن و جێگایانە دەگرێتەوە کە حاجی بە جەستەی خۆی ئەزموونی کردوون و هەستەکانی تێکەڵیان بوون و لە یادوەریی خۆیدا (بۆن و ڕەنگ و دیمەن و چێژ و هەستیان)ی پاراستووە و لە سەردەمی دیکە و لە ئەزموونی دیکەدا، بە شێوەیەکی نۆستالیژیانە یادی کردوونەتەوە. ئەزموونی حاجی لەگەڵ ئەم شوێنانە تەنیا ئەزموونێکی دیداریی و بینراو نیە لە ڕێگەی چاوەوە، بەڵکو هەستەکانی دیکەی وەک پێست و بیستن و بۆنکردنیش بەشدارییەکی چالاکیان هەیە لە ئەزموونکردنی حاجیدا بۆ ئەو شوێنانە. سەندنەوەی پشکی سەرەکیی لە چاو و بەشدارییپێکردنی هەستی بیستن، پێست و دەست، بۆن و چێژ، لە ئەزموونەکەیدا، دەلاقەیەکی وردمان لەسەر چۆنێتی ئەم ئەزموونە و پەیوەندیی مرۆڤ و شوێن و دیاردە شوێنییەکان، بۆ دەکاتەوە[1]. سەندنەوەی باڵادەستیی لە چاو و بەخشینی

---

[1] بۆ باسێکی ئاوا لەبارەی هەستەکانەوە، بڕوانە: ئەم بەرهەمانەی یۆهانی پالاسما: -- دست متفکر. حکمت وجود متجسد در معماری. ت: علی اکبری. تهران: پرهام نقش، 1392. – چشمان پوست: معماری و ادراکات حسی. ت: رامین قدس. تهران:پرهام نقش. 1390. هەروەها: محمد رضا شیرازی: معماری حواس و پدیدارشناسی ظریف یوهانی پالاسما. تهران: رخداد نو. 1391.

دەسەڵات بە هەستەکانی دیکەی مرۆڤ، دەستکەوتێکە لە شیعری حاجی قادردا، کە جیای دەکاتەوە لە گەورە شاعیرانی پێشخۆی، بۆ نمونە (نالی)، کە هەستی بینین و تەماشا لە شیعرەکانیدا زۆر باڵادەستە.

لەناو ئەمانەشدا زنجیرەی ئەو شوێنانەی کە لە منداڵییەکی زوودا بوونەتە دروستکەری هەستی شوێن و شوناسی شوێنناسیانەی حاجییان پێکهێناوە، کە زۆربەیان پەیوەندییان هەیە بە ناوچەی کۆیێ و دەوروبەرییەوە. ئەم شوێنانە لە تەمەنی حاجیدا پێگەیەکی گرنگیان لە ڕووی مێژووییەوە هەیە، چونکە بەشێکن لە شوناسی تایبەتی حاجی قادر و دەیبەستنەوە بە شوناسێکی گەورەترەوە کە کوردبوونی ئەوە. هەروەها لەڕووی دەروونیی و ڕۆحییەوە گرنگ و هێز و وزە بە حاجی دەبەخشن لەو کاتانەدا کە لە ڕووی دەروونی و ڕۆحییەوە هەست بە بێ شوێنی دەکات، پەنایان بۆ دەبات و لە ڕێگەی ناوهێنان و بیرهاتنەوەیان، قەرەبووی ئەو دۆخە ڕۆحییەی خۆیان پێدەکاتەوە و لە هەستکردن بە بێ شوینی ڕزگاری دەکەن[1].

---

[1] ئەم زاراوەیە لە کتێبەکەی ئێدوارد ڕۆڵف، شیکردنەوەی وردی بۆ کراوە و یەکێکە لە سەرچاوە هەرە گرنگەکانی ئێمە بۆ قسەکردن لەمبارەیەوە، بڕوانە: ادوارد رولف.:

هەروەها ئەم شوێنانە، لە جیهانی خودێتی حاجیدا، پێگەیەکی بوونخوازانەیان هەیە لە ڕووی کەسایەتی و شوناسەوە، چونکە بە شوێنی یەکەمی ژیانی ئەو دادەنرێن. بەجۆرێ کە بوونی خۆی لە پەیوەندیی بەم شوێنانەوە دەبەستێتەوە و هەر بە بنەما وەرگرتنی ئەم شوێنانەشە کە بوونی خۆی لە ئاست بوونی ئەوانیتردا (کڵاوسوور و کڵاوڕەش، یان عوسمانی و سەفەوی)، کە لە ڕوانگەی حاجییەوە، هەڕەشەن لەسەر بوونی، بەرجەستە دەکاتەوە[1].

حاجیی ئەم شوێنانەی تا ئاستی (پیرۆز)یی بەرز کردوونەتەوە و بوونەتە شوێنی نۆستالیژیک، کە حاجی دواجار لە هەر شوێنێک بووبێت، لەگەڵ خۆی بردوونی.. بۆیە مەسعود محەمەد بە وردیی ئەمەی پێکاوە و نوسیویەتی: (حاجی نەیویستووە لە کۆیێ بەولاوە بۆی

---

مکان و بی مکانی. مترجمین: دکتر محمد رضا نقصان محمدی، دکتر کاظم مندگاری، مهندس زهیر متکی. تهران: انتشارات ارمانشهر، چ: اول: 1389 (2002).

[1] حاجی هەندیجار بوونی خۆی لە بەرامبەر بوونی ئەوانیتردا، بەتایبەتی تورکی عوسمانی (کلاوسوور) و فارس (کڵاوڕەش) و (ئەرمەنەکان) پێناسە دەکات و هەندیجاریش بوونی خۆی لە ئەنجامی ئاماژەدان بە چین و توێژەکانی کۆمەڵگای ئەوسای کوردییەوە، کە حاجی ڕوانگەیەکی ڕەخنەگرانەی لە ئاستیاندا هەبووە، بەتایبەتیش دەستەی (شێخ، مەلا، دەرویش و هتد)، پێناسە و بەرجەستە دەکات. جاریش هەیە حاجی ئەم خۆپێناسەکردنەوەیە دەباتە ئاستی بەراووردیی شوێن و وڵاتان و ئاماژە بەو میللەتانە دەکات کە تیایاندا دەژین.

بە مەفتەن حیساب بکرێ)[1]. هەروەها توێژەری بەناوبانگی مێژووی ئەدەب، د. مارف خەزنەداریش جەخت لەسەر پابەندبوونی حاجی بە کۆییەوە دەکاتەوە و دەنووسێت: (حاجی گیرۆدە و دڵبەندی شاری کۆیێ بووە تا گەیشتووتە پلەیێک لێی بووە بە هەوەس. کۆیێ نیشتیمانی بچووک و یەکەمی بوو)[2].

هەردوو ئەم بۆچوونە ڕاستییەکی گرنگییان تێدایە، بەڵام بەو مەرجەی مەبەست لە وشەی (کۆیێ) تەنیا چەقی شارەکە نەبێت، بەڵکو ئەوە لە پێشچاو بگرین، کە شێوەگرتنی هەستی شوێنناسی حاجی لە گوند و ناوچە و زێدی لەدایکبوونی خۆیەوە بووە، لە سرووشتێکی ناشارییەوە بووە و ئەمەش دەکەوێتە پێش ڕۆشنبیریی و هەستی شوێنەوە لە شاردا. بۆیە ئەوە ڕاستە کە کوێێ وەک شار، لە پێگەیاندن و ڕۆشنبیریی حاجیدا نیشتیمانی یەکەمییەتی، بەڵام هەستی ئەو بە شوێن لەسەرەتای منداڵییەوە لە ناشار و ناوچەی گوند و ناو سرووشت و لە کەشی ژیانێکی نیمچە کۆچەری و ئاژەڵداریدا، کە

---

[1] مەسعود محەمەد: حاجی قادری کویی. بەشی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، هەرێمی کوردستان، چ: دووەم، 2010، ل: 53

[2] دکتۆر مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی. بەرگی چوارەم، نیوەی دووەمی سەدەی نوزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم 1851–1914، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ل: 135، 2004.

پەیوەندییەکی نزیک لە نێوان مرۆڤ و سرووشتدا دەهێنێتە ئاراوە، گەشەی کردووە.

لە ڕوانگەی شوێنناسی و پەیوەندیی شوێن بە ناخ و دەروونی تاکەکەس و گرنگیی شوێن لە دروستکردنی شوناس و تێکەڵبوونی هەستەکان بە شوێنەوە، بەپێی ئەزموونە خودییەکان و مانەوەی ئەم ئەزموونانە لە بیروەریدا، ئەم پابەندبوونەی حاجی قادر، جگە لە هەر لێکدانەوەیەکی ئایدیۆلۆژی و دیارگەرایانە و نەتەوەییانەی حاجی قادر، ڕێگە بە ڕاڤەکارییەکی شوێنناسیانەش دەدات. لەوەدا کە مرۆڤ زۆرێک لە ڕووداوەکانی ژیانی و ئەزموونەکانی لە شوێنی تایبەتدا، تەی کردوون و لە یادوەرییدا ماونەتەوە. بۆیە سەبارەت بە حاجی قادر، ڕووداوێکی وەک مردنی زووی باوک و مەرگی پاشتری داییک[1]، کەندڕ و بۆشاییەک لە ژیان و کەسایەتی حاجی قادردا دروستدەکەن، کە خۆشەویستی

---

[1] ئەم زانیاریانە لە نوسراوێکی (مەلا عەبدوڕڕەحمانی کوری ئەحمەدی کوڕی محەمەدی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەورە)، کە مەسعود محەمەد، لە کۆتایی بەشی دووەمی کتێبەکەیدا: حاجی قادری کۆیی، بەغدا، 1974، ل: 329-334، بڵاوی کردۆتەوە. زانیارییەکانی نێو ئەم نووسراوەیەی مەلا عەبدوڕڕەحمان لە لایەن گەلێک نووسەری دواترەوە، ڕاگوێزراون و هەریەکەیان بۆ بەدەستهێنانی پشتیوانی بۆ بۆچوونی خۆیان لەسەر حاجی قادر، سوودیان لێوەرگرتووە. بۆیە من لەم نووسینەدا، گەڕامەوە سەر ئەسڵی نووسراوەکە، نەک بۆچوونی کەسانیتر لەبارەیەوە.

بۆ نیشتیمان و بەتایبەتیتر بە خۆشەویستی و پێوەچەسپین بە جوگرافیای منداڵییەوە لە ناوچەی کۆیێ، باربووی دەکاتەوە..

بەمجۆرەش، هەستی شوێنناسی حاجی قادر لە سەر بنەمای ئەزموونییەوە لەو شوینانەدا و ئەوەی لەیادوەریدا لەبارەیانەوە تۆماری کردوون، دروستبووە. هەربۆیەش ئەم جۆرە شیعرانەی بایەخێکی تایبەتییان هەیە بۆ تێگەیشتن لە ژیان و ناخی ئەو. هەروەها ڕێگەشمان پێدەدەن کە بڵێم: هەستی نیشتیمانپەروەریی و ئەگەر بڵێم: *ناسیۆنالیستیانەی* حاجی، بەرەنجامی هووشیارییەکی پاشترە و ئەو هەستە سەرەتاییەی حاجی لە منداڵیدا بۆی دروستبووە هەستێکی دیارگەرایانەیە و پاشتر کردویێتیە بناخەیەک بۆ دامەزراندنی بیرۆکە و هەستە نەتەوەییەکەی.

گرنگیشە ئەم دوو دۆخە لە ژیانی حاجیدا لێکتر جیا بکرێتەوە: ئەو لە پێشدا دیارگەرایە و هەستی شوێنناسی ئەو هەستێکی ئەزموونگەرانەی پێش هووشیارییە و پەیوەندیی بە منداڵی و پرۆسەی بە دەروونیکردن و بە جەستەییکردنی شوێنەوە هەیە لە سەرەتای منداڵێتییەوە. بەڵام پاشان بەپێی شوێنگۆڕکێی و پەروەردەی ڕۆشنبیرانەی لەشاری کۆیێ و پاشتر لە شوێنەکانیتر و

پاشانیش ئەزموونی دوورەوڵاتیی، حاجی لەسەر بناخەی ئەزموونی یەکەم و سەرەتاییانەی خۆیەوە لەبارەی شوێنەوە، ئەم ئەزموونە لە بۆتەیەکی نەتەوەخوازیانەی هوشیارانەدا دادەڕێژێتەوە و نیشتیمان وەک بابەتێکی کولتووری و ئایدیۆلۆژی بەرهەمدەهێنێتەوە.
جیاوازیی نێوان دیارگەرایی، یان (ڕیگیۆناڵیزم) و بەناو (ناسیۆنالیزم)ی حاجی قادریش هەر لەمەدایە. دیارگەرایی ئینتیما و پابەندبوونی تاکەکەسە بە شوێنی سەرەتایی و منداڵیی خۆیەوە وەکئەوەی لە هەستەکانیدا ئەزموونی کردووە. بەڵام ناسیۆنالیزم وێناکردنی نیشتیمانە بەپێی کۆمەڵێک پرانسیپی سیاسیی و ئایدیۆلۆژی.

سێیەم) زاراوەکانی شوێنناسی:
بەدەر لە شوێنە جوگرافی و شوێنە ئەزموونکراوەکان، حاجی قادر چەندین دەستەواژەی شوێنناسییش بەکار دەهێنێت و بە وردیی لێکتریان جیا دەکاتەوە. هەستی ئاگایی لەسەر شوێن لەلای حاجی ئاستێکی بەرزی هەیە، بۆیە بەکارهێنانی ئەو بۆ زاراوەکانی شوێنناسی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی حاجی هووشیارییەکی تایبەتی لەمبارەیەوە هەبووە. جیاکردنەوەی زارەوەی (شوێن)، لە (جێگە) و (جێ) و (کونج)، (مەعمورە) لە (کەلاوە)، (ئەزر) و (عالەم)

و (فەزا) بەدیارخەری ئەم ڕاستییەن. حاجی لە بەستنەوەی شوێن بە ئاوەدانی و گرنگیی شوێن بۆ ژیان، بە وردیی ڕۆچووە و تەنانەت بەشێوەیەکی ئەدەبی، پێش هەر بیرکردنەوەیەکی تیۆری و فەلسەفیی لەم پەیوەندییە، دەستپێشخەری کردووە:

(مەکانە، شەوقی بە عێلاتە، پەشمە کۆنە هەوار

حەیاتە، زەوقی بە ئەحبابی، بایە ئاب و هەوا)[1]

وێنەی ئەم بەیتە بەتەواوی گوزارش لە شێوەژیانی شوانکارەیی و نیمچە کۆچەریانەی بنەماڵەی حاجی قادر دەکات. وشەکانی وەک (عێل، کۆنە هەوار) لەمەدا یارمەتیدەری ئێمەن بۆ ئەوەی بنەمای خەیاڵلێکراوەی بەیتەکە بەهۆی بەکارهێنانی ئەم وشانەوە، ببەینەوە سەر شێوەژیانێکی هەوارنیشینی و کۆبوونەوەی عێل و خێزانەکان لە هەمان شوێنی جوگرافیایی ناو سرووشت کە لە بار بێت بۆ ئاوەدانکردنەوە. دەلالەتی سرووشتییش لە بەیتەکەدا بەهێزە کە لە وشەکانی (با، ئاب، هەوا)دا خۆیان بەرجەستە دەکەن.

ئاو و هەوا دوو ڕەگەزی سرووشتی و با ئاماژەیە لە جووڵە. لەم بەیتەدا، شوێن (مەکان)، ئاوەدانییەکەی، یان

---

[1] دیوانی حاجی قادری کۆیی، (سەعید کەرەمی)، ل: 44

شەوقی خۆی لە بوونی ئەو کەسانەوە، (عێلات) وەردەگرێت کە لەسەری دەژین. هەروەک چۆن (کۆنە هەوار)، یان شوێنی چۆڵ، (پەشمە)، واتە هیچ و بێ کەڵکە، ژیانیش (حەیات) لە بوونی ئازیزان و ئەحبابەوە زەوقی خۆی وەردەگرێت. کەشوهەوای شوێنێک هەرچۆنێک بێت، بەبێ هەبوونی دۆستان و خۆشەویستان لەوێدا، وەک با دێت و دەڕوات[1].

ئەمەش ئەوە دەردەخات کە حاجی گرنگیی شوێن لە ئاوەدانی و بوونی مرۆڤ لە شوێندا، دەکاتە پێشمەرجی شوێنایەتی شوێن. لەوەش سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە، کە حاجی قادر بوونی نیشتیمان (وەتەن)یش دەبەستێتەوە بە بوونی ڕەفیقان و دۆستانەوە، ئەگەرنا نیشیتمان بەبێ ئەوان وەک چوونە بۆ شاری (جابولقا)، شوێنێک کە ناوی هەیە و بۆخۆی نیە:

**کە بێی و بچیەوە ئێستا (کأنە) دیسان،**

**سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچیە شاری جابولقا[2]**

ئەم تێگەیشتنەی حاجی قادر هەمان پێشمەرجیی تیۆرییە لە بواری شوێنناسیدا، کە بوونی شوێن دەبەستێتەوە بە

---

[1] وشەی (پەشمە) لە (پەشم)ـەوە هاتووە، بە مانای هیچ، بێ کەڵک. بڕوانە دیوانی حاجی قادر، پەراوێزی یەکەم، لە لاپەڕە 44.

[2] دیوانی حاجی، لاپەڕە: 44، پەراوێزی: 4.

بوونی مرۆڤەوە، کە لە ڕێگەی چالاکییەکانیەوە، مانا بە شوێن دەبەخشێت. شوێنی بێ مرۆڤ، وەک نیشتیمانی بێ هاوڕێ و ئەحباب چۆڵ و هۆڵە، یان وەک شاری جابولقا، ناوی هەیە و شوێنی نیە.

هەروەها، ڕیزکردنی چەندین وشەی وەک (*ئەملا، ئەولا، مەکان، کونج، کۆلان، شار، دێ، بازاڕ، کەلاوە، خانە، خان، ماڵ، دیار، دەرگە، مەدرەسە، مۆڵگە، تاق، ڕەواق، تەخت، مەیخانە، ئەدەبخانە* و قەسر و هتد..) هەموویان دەلالەتن لەسەر ئامادەیی زەینییەتێکی هوشیار بە زارەوەناسیی شوێن و بەکارهێنانی دروستیان بۆ بەرجەستەکردن و جیاکردنەوە و هێنانەپێشچاوی تایبەتمەندییەکانی هەر یەکێک لەو شوێن و جێگە و بابەتانەی ناویان دەبات.

## دابەشکاریی شوێن لەلای دەربەندییەکان:

لایەنی مێژوویی بنەماڵەی حاجی قادر ناکەوێتە چەقی توێژینەوەکەی منەوە. لەگەڵ ئەوەشدا بۆ بەستنەوەی زۆرێک لە بیرۆکە و تێڕوانینەکانی حاجی قادر و تێگەیشتنێکی بونیادیتر لە ئەزموونە شیعرییەکەی، پێویستیمان بە ئاماژەکردن بۆ مێژوو و پێکهاتەی تیرەکە هەیە، کە تیرەیەکی چینایەتین و پێگەی جۆربەجۆری هەر چین و گرووپێک لەناو کۆی تیرەکەدا، تەنانەت دوای ئاوارەبوونیشیان و گیرسانەوەشیان لەناوچە نوێیەکەدا، تا ڕادەیەک پارێزراو بووە. ئەوەندەی بتوانین پۆلێنکارییەک بکەین، دەتوانین سێ دەستە و چین، یان پێگەی جیاواز لەم تیرەیەدا بدۆزینەوە، کە هەم سەرچاوەکان و هەم شوێنەوارەکان و هەم ژیانی کردەیی پاشماوەکانیشیان ڕێگە بەم پۆلینکردنە دەدەن.

یەکەم: *دەستەی جەنگاوەران، (دەستەی سوپا و سەرکردەکان)،*

دووەم: *دەستەی ڕۆحانیی و خوێندەوارەکانیان،*

سێیەم: *دەستەی ئاژەڵدار و جوتیارەکان.*

لەم ڕوانگەیەوە، بنەماڵەی حاجی قادر، لە بنەماڵە خوێندەوارەکانیان بوون، نەک شوانکارەکان، یان

دەسەڵاتدارەکانیان. هەر بۆیەشە لە هەڵبژاردنی شوێنی ژیانیشدا، لەو ناوچە نوێیە ئەم دابەشکارییە چینایەتی و کولتووریە، دووبارە بۆتەوە.

دەستەی سوپا و جەنگاوەران کاریان پاراستنی ناوچەکانیان و چاودێریکردنیان بووە لە پەلاماری دوژمن و بەرزاییەکانی دەروبەری ئەو شوێنانەیان کردۆتە جێگەی خویان[1]. خوێندەوارەکان لە ناوچەی گوند و ئاوەدانی ژیاون و درێژەیان داوە بە سرووتە ئایینیی و کردنەوەی مزگەوت و حوجرەکان و دەستەی جوتیار و ئاژەڵدارانیش لە ئەشکەوتەکان و دەشتاییەکان ماونەتەوە

---

[1] ئەم لەبەرزایی و بلندیی نیشتەجێبوونەی جەنگاوەرانی دەربەندی و تیرەکە لە مێژووی نویشدا دووبارە بۆتەوە. بەپێی گێرانەوەکانی (عبدالكريمی حاجی سۆفی حاجی عومەر) و (حمدەمین شیرین) کاتێک (عەزیزاغای خەرابە بەناوی حەمە زیادی کوڕی حەماغای کۆیە لە سالانی 1930-1950 چەندین جار دەچێتە ئومەرگومەت و سێگردکان، بۆ کۆکردنەوەی خەرجی و زەکاتی ئەم گوندانە و داگیرکردنیانەوە، گەنجەکانی تیرەی دەربەندی لەسەر گردە بڵندەکان و لەسەر لوتکە بەرزەکان لە هەر چواردەوری سنووری دەربەندییەکان چەکداریان دانا، شوێنی بەرگرییان قایم کرد، بە شێوەیەک شەری مان و نەمان بکەن، لەلایەن پیاوە گەورەکان و بە ئەزموونەکانیشەوە بەرنامە و پلانیان بۆ دادەرێژرا. چەند کەسێکیش تایبەت کرابوون بە گواستنەوەی نان و کەل و پەل و ئاوو پێداویستیەکانی شەرکردن، بۆ ئەوە کەسانەی لە بەرزاییەکان خەریکی پاسەوانی و بەرگری بوون). بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵلا: لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، مێژوو. (مانەوەی کولتوور و شێوەزار). لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتیە لەسەر ڕەچەڵەک، شێوەزار، کولتوور و داب نەرێت، درەختی خانەوادەی تیرەی دەربەندییەکان). سلێمانی: چاپخانەی کەمال، چاپی یەکەم، 2015، ل: 195، 198-199.

هەمووشیان پێکەوە لە تێکەڵیی و پەیوەندیی بەردەوامدا بوون و نهێنی تیرەکەیان پاراستووە[1].

یەکێک لەو خاڵانەش ئەوەیە کە ئەوان هەتا ئێستاش لەناو خۆیاندا بەشێوەزاری خۆیان دەئاخڤن و ئەو شێوەزارە نیشانەی یەکتر ناسینەوەیانە و زمانی دەربڕین جۆرێ لە حەشارگەی مەعنەوی ئەوان و سنووری خۆ جیاکردنەوەیانە. لەمەشدا هەمان ترسی مێژوویی دەبینرێتەوە، هاوکات بەوەش توانابییەکی زۆریان لە خۆگونجاندن لەگەڵ شوێن و ناوچە نوێیەکە پیشانداوە. بۆ نمونە ئەگەر تەماشای زمانی حاجی قادر بکەین، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە پاش هەشتا ساڵ زیاتر لە هاتنی باووباپیرانیان بۆ ئەم شوێنەی ئێستا، بە زمانی ستانداری شیعری کلاسیک، یان شێوەی موکری (سۆرانی) ناوچەی کۆیێ، شیعری نوسیوە. لە ئێستاشدا خەڵکی ئەم ناوچەیە بە هەمان ڕەوانیی کە بە شێوەزاری خۆیان دەئاخڤن، بە شێوەی کۆییێش بە هەمان ڕەوانیی قسە دەکەن و دەنووسن. بەمجۆرەش توانایی ئەوان بۆ

---

1 سەبارەت بەوەی ئەم تیرەیە نێهنی پارێز بوون و شتی خۆیان بۆ کەس نەدرکاندووە و ئەمەش وەک کولتوورێکی گشتی لێهاتووە لەناو خۆیاندا، بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵلا: لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل: 11.

خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگە کولتووری و جوگرافییە نوێیەکەمان بۆ دەردەکەوێت.
لە پەیوەندیی بە ژیان و ئەزموونی حاجی قادر لەم نێوانەدا، هەمان ئەو ترسە مێژوویی و نادڵنیاییە کولتوورییە دەبینرێتەوە. چونکە مێژووی منداڵیی حاجی قادر لەو مەڵبەندەیا کە ئێستاکەش ئەم تیرەی دەربەندییە تیایدا دەژین، لە مێژووی ئاوارەبوونیان بۆ ئەم ناوچەیەوە نزیکترە: لە 1731وە کە ئەو تیرەیە لەو ناوچەیەی ئێستایاندا گیرساونەتەوە تا 1816/1815 کە حاجی تیایدا لەدایک بووە، دەکاتە 84 ساڵ و ئەگەر حاجی قادر لە تەمەنی سێ ساڵیشەوە کاریگەریی لەو ژینگەیەوە وەرگرتبێت و شوێنەوارەکانی لە یادوەرییدا تۆمار کردبن، ڕێگەی ئەوەمان پێدەدات قسەر لەسەر کاریگەریی و شوێنەوارە دەروونیی و ترسەکانی ئەو کۆچەی دەربەندییەکان بکەین، کە لە ڕێی گێڕانەوەی دەماودەمەوە، پێی گەیشتوون و منداڵەکانیان پێ گۆش کردوون. بۆیە نەک هەر ناڕاستەوخۆ حاجی کاریگەریی ئەو کۆچ و ئاوارەبوون و گێڕانەوانەی وەرگرتوون، بەڵکو ئەو شێوە ژیان و کولتوورەش کە تیرەی دەربەندی و بنەماڵەکانی لەسەر بنەمای ئەو کۆچ و ئاوارەبوونە مێژووییەوە بەرهەمیان هێناوەتەوە،

کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر دەروونی حاجی بەجێهێشتووە. یەکێک لە بنەماکانی ئەو شێوەژیان و کولتوورەش بریتیە لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ شوێن و هەڵبژاردنی شوێن بۆ ژیانە نوێیەکەیان.
تیرەی دەربەندی خۆیان دەبەنەوە سەر کەسایەتییەک بەناوی (جومعە دەربەندی)، کە لە بنەمادا لە ناوچەی (دەرە تەنگ، دەروەند شاهو) بوون. (لە کاتی هێرشەکانی نادر شادا بۆ سەر کرماشان و سەرپێڵی زەهاو، چەقی دەرنە، لە ساڵی 1731ی زایینیدا، هەموو ئەو دەسەڵات و میرنشین و عەشیرەتانەی لەو ناوچەیە بوون لەبەرامبەر ئەو هێرشانەی نادرشادا خۆیان پێنەگیرا، بەناچاری ناوچەکانی خۆیانیان بەجێهێشت، کۆچیان کرد بۆ سنوورەکانی ژێر دەسەڵاتی میرەکوردەکان لە ناوچەکانی باشووری کوردستان)[1].
یەکێک لەو ڕاستیانەی لەم مێژووە دەسەلمێت و کەسانی وەک شەرەفخانی بەدلیسی[2] لە مێژوونووسە کۆنەکان و

---

[1] ئیدریس عەبدوڵڵا: لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، مێژوو. (مانەوەی کولتوور و شێوەزار). لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتیە لەسەر ڕەچەڵەک، شێوەزار، کولتوور و داب نەریت، درەختی خانەوادەی تیرەی دەربەندییەکان). سلێمانی: چاپخانەی کەمال، چاپی یەکەم، 2015، ل: 41.

[2] شەرەف خانی بەدلیسی: شەرەف نامە. وەرگێرانی: هەژار. هەولێر، دەزگای ئاراس، 2006، ل، ل: 415 و بەرەودوا.

ئەمین زەکی بەگ[1] و محەمەد عەلی سوڵتانی لە مێژوونووسە نوێیەکان[2]، پشتڕاستی دەکەنەوە، ئەوەیە: کە دەربەندییەکان دانیشتووی ڕەسەنی خۆرهەڵاتی کوردستان بوون، بەتایبەتی ناوچەکانی (کرماشان و سەرپێڵی زەهاو- درەتەنگ)، کە هەر لە کۆنەوە فەرمانڕەوایەتی ئەو ناوچەیان کردووە. بەڵام لەبەر پێگەی جوگرافیایی دەرە تەنگ لە نێوان دوو دەسەڵاتی سەفەوی و عوسمانییدا، کە هەمیشە لەژێر مەترسی پەلامار و هێرشی هەر یەک لەم دوو دەسەڵاتە بووە، ئەوە ناوەندەکانی دەرە تەنگ و زەهاویش بەردەوام لە نێوان عوسمانی و سەفەوییەکاندا دەستاودەستی پێدەکرا[3].

ئەم مێژووە هەر تەنیا جۆرێک لە شوێنگۆڕکێی ناچارەکی ناسەپێنێت، بەڵکو جۆرێکیش لە تێڕوانین و نیگا بۆ شوێن بەرهەمدەهێنێت، کە مرۆڤ لێوەی مامەڵە لەگەڵ شوێن

---

[1] محەممەد ئەمین زەکی بەگ (سەرجەمی بەرهەم، بەرگی چوارەم): خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا ئیمرۆ. ئامادەکردنی: ڕەفیق سالح، بنکەی ژین، سلێمانی: 2006، ل: 154.

[2] محمد علی سوڵتانی: جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرمانشاهان (*ایلات و طوایف کرمانشاهان*)، جلد، دوم، جلد سوم، چاپ دوم، تهران: بانک ملی ایران، 1381، ل: 883- 893

[3] ئیدریس عەبدوڵلا: لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، مێژوو. (پێشووتر)، ل: 44.

دەکات. بۆیە ئەگەر ئەو مێژووە کاریگەریی هەبووبێت لەسەر هەڵبژاردنی شوێنی حەوانەوەی نوێی ئەم تیرەیە لە ناوچەی کۆیێ، ئەوە کولتووری دەربەندییەکان بە گشتی و تێڕوانینیان بۆ شوێن بەتایبەتی، هەم ڕەنگدانەوەی ئەو کۆچە ناچارەکیی و ئەو کولتوورەیە کە لەسەر بنەمای خۆپاراستن و ترس لە دوژمنەوە دروستبووە، هەم ڕەنگدانەوەی دابەشبوونە چینایەتی و ئەرکمەندیی هەر چینێکیشە لە ئاست تیرەکەدا. بۆ نمونە چین و دەستەی سوپا، ئەرکیان پاراستنی نامووسی تیرەکە بووە[1]، جوتیار و ئاژەڵدارانیان ئەرکیان بەرهەمهێنانی و دابینکردنی بژێوی ژیان بووە و دەستەی ڕۆحانی و خوێندەوارەکانیشیان ئەرکیان بەڕێوەبردنی ڕێ و ڕەسمە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان بووە.

---

[1] یەک لەو داستان و ئەفسانانەی تیرەی دەربەندی کە ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت، ئەو بەسەرهاتەیە کە دەگێڕێتەوە، نادرشا لە هەڵبڕینی ئەم تیرەیەدا توانیویەتی یەکێک لە کچەکانی سەرۆکی تیرەکە (جومعە دەربەندی) بەناوی کەتان بفڕێنێت. بو سەندنەوەی شکۆی تیرەکە، دوو کەس لە براکانی ئەم کچە ودەتوانن خۆیان بحزێننە ناو دەرباری شاوە و لە شێوەی خزمەتکاردا دڵسۆزیی خۆیان بنوێنن و بتوانن کچەکەیان و یەکێک لە خانمەکانی بنەماڵەی شا بەناوی (زیبا) لەگەل خۆیان بفڕێننەوە و بیانهێننەوە بۆ ناو بنەماڵەکەی خۆیان و تەنانەت ناوی زیبا بگۆڕن بە زەینەب. ئەم گێڕانەوەیە چ ڕاستییەکی مێژوویی بێت، یان ئەفسانەیەکی ئەم تیرەیە، باس لە گرنگیی نامووس دەکات لەلایان، بەو پێیەی فیگەری ژن سیمبوولی نامووسی تیرە و نەتەوەیە لە کولتووریی خۆرهەڵاتیدا. سەبارەت بەم گێڕانەوەیە بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵلا ئومەر گومەتی: لە دەروەندەوە تا ئەیرە. ل ل: 86-88

هەمووشیان پێکەوە هەمان ئەرک و پیشەی ئەوانیتریان دووبارە کردۆتەوە و لە پاراستنی کۆمەڵگەی خۆیاندا ئەرکی هاوبەشیان بینیوە..

## کۆتان (ماڵی یەکەم، هەوار):

یەکێک لە پێکهاتە شوێنییەکانی تیرەی دەربەندی بریتیە لە (کۆتان). کۆتان یەکەیەکی شوێنیە کە ئامادەیی تیرەکە لەسەر جێگەیەکی تایبەت دەسەلمێنێت و بەمجۆرەش تیرەکە لەسەرەتای نیشتەجێبوونیانەوە لەم ناوچەی ئێستای کۆیێ، جێگەیەکیی تایبەت بە خۆیان، لە فەزا و ڕووبەری جوگرافیایی جیا دەکەنەوە و دەیکەنە نیشتیمانە بچکۆلەکەی خۆیان. کۆتان لەم ڕوانگەیەوە، یەکەمین مانا بەخشینی مرۆڤە بە شوێن. کۆتان لە زماندا بە مانای هەوار، یان *ماڵی سەرەتایی* دێت.. بۆیە کۆتان ئەو شوێنەیە کە گرووپەکانی ئەم تیرەیە خۆیانی تێدا دەگرنەوە و تیایدا جەم دەبنەوە، "چ بە شێوەی تاکە خێزان بێت، یان چەند خێزانێک بن"[1].

کەواتە کۆتان مانای یەکەمین مۆڵگە و هەواری دەربەندییەکانە لە دوای دەربەدەریی و ژیانێکی سەخت و

[1] ئیدریس عەبدوڵلا نومەر گومەتی: لە دەروەندەوە تا ئەیرە، ل: 139.

پەرتەوازەبوونیان، کە تیایدا ئەزموونی وەرزەکانی ساڵیان کردووە.
پێش ئەم شوێنە، ڕووبەری عەردیی و جوگرافیاییەکان جگە لەوەی بەسەریاندا لە دەستی دوژمن ڕابکەن و خۆیانی تیدا بشارنەوە، هیچ مانایەکی دیکەی نیە.



سەرنجڕاکێشی لەوەدایە، چ وەک ئەوەی سەرچاوەکان باسی دەکەن و چ بەوجۆرەش کە من بۆخۆم لە سەردانی مەیدانیدا بینیم، جێگەی (کۆتانەکان)یشیان، پڕە لە ڕەنگدانەوەی ئەو یادوەریی و ترسەی ئەم تیرەیە هەیانبووە لە دووبارەبوونەوەی تراژیدیاکەیان: ئەوان هەوار و کۆتانەکانیان لە شوێنی چاڵایی و نەدیو دروستکردوون. بەجۆرێ تا نەچیتە سەر لێواریی

بەرزاییەکان نازانیت ئەوەی لە خوارەوەیە شوێنی نیشتەجێبوون و هەوارە[1]، بەڵام ئەوان بۆخۆیان بە ئاسانی هاتنی ئەوانیتریان بینیوە. لەمەشدا دانایيەکی زۆریان بەکارهێناوە بۆ خۆپاراستن لە هێرش و پەلامارەکان[2].

بەڵام لەوە ئەچێت ئەم شوێنە وردە وردە ببێتە شوێنی هەمیشەیی تیرەکە و دروستبوونی پەیوەندییەکی شوناسبەخشانە لەو ناوچەیەدا. چونکە لەگەڵ دروستکردنی یەکەمین (کۆتان)ەکانیان، کە پاشتر دەیانکەنە ***گوندی هەمیشەیی*** و تیایاندا نیشتەجێ دەبن[3]، یەکەمین دڵنیاییەکان بۆ ئەم تیرەیە دەگەڕێتەوە و ڕووبەری زەوی بۆ ئەوان مانایەکی ژیانەکی بەخۆیەوە دەگرێت، دوایئەوەی لە گەشتە تراژیدیەکەیاندا هیچ ڕووبەرێک نەبوو، ئەوان ئاسوودەیی و دڵنیایی خۆیانی تێدا بدۆزنەوە.

ئەمەش لەگەڵ ئەو بۆچوونە تیۆرییەدا یەکدەگرێتەوە کە پەیوەندیی شوێن و شوناس بەرجەستە دەکات: "لە دروستبوونی شوناسدا دەوروبەری فیزیکی، یان شوێن

---

[1] ئیدریس عەبدوڵلا ئومەر گومەتی: لە دەروەندەوە تا ئەیرە، ل: 141

[2] هەر ئەو سەرچاوەیە، لاپەڕە 141-142

[3] هەمان سەرچاوە، ل: 140

کارگەریی بەرچاوی هەیە. *شوناس لە شوێندا بەرجەستە دەبێت و شوێن بۆ شوناس دەوروبەرێکی ماناداره،* کە ڕەفتار و ئەزموونەکانی مرۆڤ ئەو مانایەی پێدەبەخشن.
دەوروبەر بریتیە لە چەندین وێستگەی ڕەفتاری کە پەیوەندییان لەگەڵ یەکتر هەیە و لە زۆر شتیشدا هاوبەشن. هەندێ لە توێژەران دەڵێن، لەوانەش: (ئاموس ڕاپاپۆرت:2005): (دەوروبەر، بەرهەمی پەیوەندییە ماناداره‌کانە. بۆیە ڕەنگە دەوروبەر بریتی بێت لە زنجیرەیەک پەیوەندیی نێوان شتەکان خۆیان، نێوان شتەکان و خەڵک و نێوان خەڵک خۆیان).
لەمەوە دەکرێت بگوترێ، مرۆڤ بەهۆی پەیوەندییەکانی لەگەڵ دەوروبەر، خۆی دروستدەکات و مانا بە ژیانی دەبەخشێت. لە ڕوانگەی دەروونناسیی دەوروبەرەوە، پەیوەندیی و کارلێکی نێوان مرۆڤ و شوێن، لەلایەکەوە دەبێتە هۆی: گۆڕانکاریی و دەستکاریکردنی شوێن و لەلایەکیتریشەوە شوێن و دەوروبەر لە گۆڕینی ڕەفتاری مرۆڤ و شێوەی بیرکردنەوەیدا کاریگەرییان هەیە[1].
هەر بۆیەشە سەرەتای ئەم دڵنیابوونەوەیە بۆ دەربەندییەکان، لە ئاسوودەیی خۆیان و

---

[1] ڕێبوار سیوەیلی: دیاردەناسیی شوێن و شوناس. خوێندنەوەیەکی دیاردەناسانە بۆ شاری سلێمانی، غەزەلنووس، سلێمانی، 2015، ل: 85-86

دەستپێکردنەوەیان بە ژیان، پەیوەندییەکی توندی هەیە بە شێوە ژیانی ئاژەڵداریانەی ئەوانەوە و بەردەوامییان لە مانەوەی خۆیان و ئاژەڵەکانیان و ئاشتبوونەوەیان لەگەڵ زەوی و سرووشت و دروستکردنەوەی ئاوەدانیی و ماناداركردنی شوێن بەهۆی ئەم چالاكیانەیانەوە.. واتە لەگەڵ دڵنیابوونەوەیان بە ئاسوودەیی و ڕەوینەوەی ڕێژەییانەی ترسی لەناوچوون، هەمان ئەو شێوەژیان و بۆچوونە كولتووریانەی خۆیان لەسەر شوێن، وەک شوێنێکی مانادار بەرهەمدەهێننەوە.



لێرەشەوە، وشەی (کۆتان) زیاتر خۆی ئاشکرا دەکات و مانای (شوێنێکی بەپیت و گونجاو بۆ خۆیان و

مەڕومالاتەکانیان)[1]، لەخۆی دەگرێت تا بیکەنە (هەوار). "وشەی هەوار وەک وار war مانای جێی ژیان و دانیشتنە"[2] و شوێنی حەوانەوە لەسەر شوێنێک، کە ئەوانی لەخۆ گرتووە و بوونییان دەپارێزێت..

بەڕێوەبردنی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەربەندییەکان، بەشێوەکی پێکڤەیی و بە کۆمەڵی بووە. بەرزترین دەسەڵات لە تیرەکەدا دەسەڵاتی ئەنجومەنی تیرەکە بووە[3]. ئەمەش وایکردووە، پەیوەندیی دەربەندییەکان و شوێن پەیوەندییەکی خاوەندارییانە نەبێت و هیچ دەسەڵاتێکی تاکڕەوانە حوکمیان نەکات. پەیوەندیی ئەوان بە قەڵەمڕەوی نیشتەجێبوونی خۆیانەوە، پەیوەندییەکی ژیانەکی بووە. شوێن بۆ ئەوان شوێنی دروستکردنی شوناسە لە ڕێگەی چالاکیی هەمەلایەنەی بەرهەمدار و مانادارەوە. هەر بۆیەشە ئەم تیرەیە شوێن وەک *شوێنی هاوبەش* دەبینێت، کە تیایدا هەر چین و ڕەگەز و دەستەیە بەهۆی چالاکییەکانیانەوە،

---

[1] ئیدریس عەبدوڵلا ئومەر گومەتی: لە دەروەندەوە تا ئەیرە، هەمان لاپەڕە.

[2] د. جەمال نەبەز: وشەنامەکی ئێتیمۆلۆژیای زمانی کوردی. کۆبەرهەم ژ (8)، چاپی یەکەمی ئەلیکترۆنی، 2008، ل: 163

[3] ئیدریس عەبدوڵلا: هەمان سەرچاوە، ل: 194 و 211.

ئەو کارانە دەکات کە دواجار دەچنە خزمەت گشتەوە و پیشاندەری ئەرک و پەیوەندیی ئەوانە بە شوێنەوە.
دابەشکردنی کار لە نێوان ڕەگەزیی نێر و مێی ئەم تیرەیەدا، شتێکی ئاسایی بووە، بەڵام ئینتیمایان بە شوێنەوە چوونیەک بووە: (لە سەرەتای وەرزی بەهاری هەموو ساڵێک هەر سێ چوار ماڵێک دەچوونە هەوارێک لە سنووری زەوەییەکانی ئاقاری گوندەکە. پاشان پیاوەکان دەچوونە بناری ئەو چیایانەی سەرەوە بۆ ئەوەی تێراو، دووگوێو کۆڵەگە و کاریتە)یان دەهێنا. ژنەکانیش بە تەشی ڕستن، بەنیان دروستکردووە و بەهۆی ئەوەشەوە چیغیان بۆ گرتنی دەوری ماڵەکیانیان شەتەک داوە. ئەمە جگە لە دروستکردنی حەسیر و ڕایەخ لە قامیش و مەشکەژەندن[1].



---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.



ڕەنگدانەوەی هاوبەشێتی لە پەیوەندییان بە شوێن و هاوبەرژەوەندییان لە بەرهەم و چالاکیی هەرەوەزییان لە ماناداركردنی ژیانیاندا، لە شێوازی مامەڵەكردنیشیان لەگەڵ زەوی، دەبینرێت: لەكاتی چونە هەوار هەر چەند ماڵە و بەیەكەوە دەچوونە هەوارێك نزیك زەوییەكانی خۆیان، بۆ ئەوەی هەر مانگە و لەناو زەویی ماڵێك بن، بۆ ئەوەی زەوییەكە بە حەیوان و پاشماوەی ماڵاتەكان



زبڵ بکەن[1]. ئەم شێوازی مامەڵەکردنە لەگەڵ زەوی، جگە لە ڕەهەندە ئەفسانەییەکەی کە جووتبوونەوە و خۆڕواندنەوەیە لەسەر زەوی بە مەبەستی زۆربوون و بەردەوامیی و بە پیتکردنی، نیشانەی ئەو دڵنیابوونەیە کە دوای تراژیدیاکەیان ئەزموونی دەکەن. ئەمەش سەرەتای ئەو کولتوورە پتەو دەکات کە مرۆڤ دەبەستێت بە شوێنەوە و دەیکاتە شوێنی بوونی خۆی. جیف ماڵپاس نوسیویەتی: "شوێن ڕەهەندی بنەمایی بوونە و بوونیش هەردەم لە ڕێگەی شوێنەوە بەیاندەکرێت.. لەبەر ئەوە، شوێن هەم وەکو زاراوەیەک و هەم لەشێوەی دیاردەیەکی پەیوەست بە ئەزموونەوە، تواناییەکی زۆری هەیە بۆ پەیوەندیگرتن لە نێوان خۆی و کۆمەڵگا و زەویدا و هەر بەو جۆرەش دەتوانیت ئەوەی خۆماڵیی و تایبەتە و ئەوەی ناوچەیی و جیهانیە پێکەوە گرێ بدات"[2]. لێرەوەیە، کە ڕەنگدانەوەی ئەو ترسە کولتووریی و مێژووییەی تیرە، هەروەها ئەو پێکەوە بەستنەوەی خۆماڵی و لۆکاڵییە بە گەردوونییەت و جیهانەوە، لە ئەزموونی شیعری حاجیدا، بە جەختکردنەوەی زۆری حاجی لە پاراستنی کوردستان و سەربەخۆبوونی لە

---

[1] ئیدریس عەبدوللا: ل: 141

[2] ادوارد رولف: مكان و بی مكانی. ص: 19-20

داگیرکەرانی و داوای بەردەوامی بۆ یەکگرتوویی کوردەکان و پشتگیریی بۆ میللەتانی ڕاپەڕیو لە ستەمکاریی، ڕەنگیداوەتەوە. وەکئەوەی حاجی لە ژێر کاریگەریی و ترسی نائاگایانەی بە میرات بۆ جێماوی تیرەکەیدا، کە بەردەوام ئاوارەیی و لەدەستدان و هێرشی دوژمنانی بیر دەخاتەوە، بیەوێت دنەمان بدات بۆ دروستکردنی کوردستانێک بە تایبەتمەندیی و سەربەخۆییەکانی خۆیەوە و لەم ڕێگەیەوە خۆی لەو ترس و دڵەڕاوکێ میراتییە بپارێزێت.

شوێنی پیرۆز:

لە زۆرینەی کولتوورەکانی مرۆڤایەتیدا و لە گشت قۆناغەکانیدا، هەر گۆڕانێکیش ڕوویدابێت، شوێنی پیرۆز هەبووە. شوێنی پیرۆز زاراوەیەکە بۆ جیاکردنەوەی ئەو شوێنانەی "بەرجەستەکەری هێما و ڕەمز و پەرستگا و



شتگەلێکی پڕمانایە و بۆ کەسێکی بڕوادار ئەم شوێنانە بەشێکن لە فەزای مەعنەوی و ئەزموونکردنی ئەو شوێنانە یەکەمین ئەزموون و یەکسانە بە ئەزموونی تێگەیشتن لە جیهان"[1].

*(وێنەکە: مەرقەدی ئومەرگومەت 2016)*

---

[1] ادوارد رلف: مکان و بی مکانی، ص: 21.

(مێرسیا ئیلیادە)، گەورەتوێژەری بواری ئایینناسیی دیاردەناسانە[1]، لەو بڕوایەدایە تێگەیشتن لە ڕەمز و تایبەتمەندیی شوێنە ئایینیەکانی وەک پەرستگا و ماڵەکانی خودا و مرۆڤ، "پێش هەموو شتێک پەیوەستە بە فامکردنی چۆنێتی بەهابەخشین بە فەزا و شوێنەوە، بە مانایەکی دیکە بریتیە لە ناسینی پێکهاتە و ئەرکی فەزا یان شوێنی پیرۆز"[2]، لە ژیانی مرۆڤدا.

بەمجۆرەش، وا نیە کە شوێن لە خۆیدا هەمیشە پیرۆزییەکی هەیە و ئەم پیرۆزییەش پەیوەندیی هەبێت بە ئایینێک لە ئایینەکانەوە. پیرۆزیی شوێن دەگەڕێتەوە بۆ چالاکیی مرۆڤانە و ئەو بەهایەی شوێن لە ئەنجامی ئەو چالاکییە مانادارەوە پیرۆزیی بەو شوێنە دەبەخشێت. بەمجۆرەش مرۆڤ بە هۆی ئەنجامدانی بۆنە و سرووتەکانەوە جێگەیەک لە شوێن و فەزای گشتیی جیا دەکاتەوە و تایبەتمەندیی خۆی پێدەبەخشێت لە

---

[1] یەکێک لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ئیلیادە، کە تیۆرەی ئەفسانەی گەڕانەوەیی نەمر، یان هەمیشەیی و کتێبەکەش هەر بەو ناوەوەیە، تێدا خستۆتە ڕوو بریتیە لە: میرچا الیادە: أسطورەء بازگشت جاودانە. ترجمەء: بهمن سرکاراتی، تهران، انتشارات طهوری، چاپ: دوم، 1384 (2006).

[2] میرچا الیادە: "معماری قدسی و رمزپردازی". لە: أسطورە و رمز در اندیشەی میرچا الیادە. ترجمە: جلال ستاری، VI، چ: اول، 1381 (2002)، تهران: نشر مرکز، ص: 177.

پەیوەندیی بەو چالاکییە ماناداره‌وه، کە بۆ ئەوانەی بڕوایان بە چالاکییەکە هەیە و بە پیرۆزی دەزانن، جێیەکە لە شوێنێکی ئاساییەوە دەبێتە شوێنێکی تایبەت و پیرۆز. ئەمەیە کە شوێنی پیرۆز لە شوێنی گشتی هەڵداوێرێ و سنووری خۆی بۆ دادەنێت و دەیکاتە شوێنێکی ناوەند لە دڵی شوێن و فەزای گشتیدا. ئیلیادە دەنووسێت: "فەزای پیرۆز خاوەنی سنوورێکی دەستنیشانکرا و و بەتەواوی بونیادمەند و بە چەق بووە"[1].

گرنگترین تایبەتمەندیی شوێنە پیرۆزەکان ئەوەیە، کە ئەم شوێنانە ئەزموونێکی ژیانەکی دەخەنە ڕوو بە جۆرێ کە گشت شتێک *بەرەو شوێنە پیرۆزەکان ئاراستە بکرێت* چونکە "شوێنە پیرۆزەکان سەنتەرەکانی جیهانن"[2]. من ساڵانێک پێش ئێستا، لە لەلای (نالی)یش بە جۆرێکی دیکە ئەم پرۆسەیەم باسکردووە کە چۆن لە قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)دا، نالی لە هەوڵدانێکی بەردەوامدایە بۆ ئەوەی شاری سلێمانی بکاتە چەقی

---

[1] میرچا الیادە: هەمان سەرچاوە، ل: 177.

[2] ادوارد رلف: مکان و بی مکانی، ص: 21

گەردوون وەک پیرۆزترین شوێن، بۆ سەرلەنوێ پێکەوە بەستنەوەی (خود)ـە دوولەتبووەکەی خۆی.[1]

حاجی قادریش شتێکی لەو جۆرە دەکات، بەڵام لە پانتاییەکی زۆر فراوانتردا لەوەی نالی بیری لێدەکردەوە. مرۆڤی کۆن لە میانەی چالاکییە مانادارەکانییەوە، گەردوون و جیهانی بەسەر دوو بەشی سەرەکیدا دابەشکردووە: بەشێکی دنیایی و بەشێکی باڵا و قودسی و ئەم دوانەش لە ڕوانگەی مرۆڤی دێرینەوە دوو شوێن و فەزای جیاوازن. *شوێنی پیرۆز پەیوەندیی بە شوێنی جیهانییەوە نیە و باڵاترە لە شوێنەکانی دیکەی جیهان. ئەوێ شوێنێکی واقیعی و ڕاستەقینەیە و ڕەنگدانەوە و تەجەلای بوونە*.[2] وەک پاشتریش دەیبینین، ئەزموونی حاجی قادر زۆر بە وردی ڕەنگدانەوەی ئەم تێگەیشتنەی مرۆڤە لە جیاکارەیی نێوان شوێنەکاندا. حاجی سەرەتا، شوێنە پیرۆزەکانی ناوچەی دەربەند و شوێنی یەکەم و منداڵیی خۆی بەرجەستە دەکات و پاشان **کۆیێ** دەکاتە شوێنێکی پیرۆز و لە ئەنجامیشدا هەموو ***کوردستان*** وەک شوێنێکی پیرۆز لێدەکات و جیهانناسییەک لەسەر بنەمای

---

[1] ڕێبوار سیوەیلی: کتێبی نالی. لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی و دەزگای زەریاب، هەولێر، چاپی دووەم، 2015، ل: 72-78.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: 178.

پیرۆزکردنی شوێنە جیاوازەکان و جیاکردنەوەیان لە شوێنەکانی دیکەی جیهان بەرهەمدەهێنێت و دەیکاتە چەقی جیهان.. وەک ڕۆلف لە شییکردنەوەکەیدا بۆ لێکدانەوەکەی ئیلیادە، دەڵێت: "شوێنە پیرۆزەکان چەقەکانی جیهانن. ئەو پنتانەی کە تیایاندا پەیوەندیی نێوان زەوی، بەهەشت و دۆزەخ پێکدێت"[1].

ئەمە هەمان شتە کە حاجی قادر بە وردیی و بە بەکارهێنانی هەمان وشەکانی وەک (بەهەشت) و (جەهەننەم)، گوزارشی لێکردووە. لە خوێندنەوەی ئەم نمونانەی پاشتردا سەرنج بدەن چۆن حاجی هەمیشە پەیوەندیی شوێن و ئاوەدانی و شوێن و مرۆڤە ئاشناکان پێکەوە دەبینێت و کونجی (تۆی دۆست)ی لێدەبێتە مەعموورە و (شاری) پڕ لە بێگانەی لێدەبێتە (کەلاوە). چۆن نزیکی مرۆڤ لە کۆییەوە، ئەو شارە دەکاتە بەهەشت و دوورییش لێیەوە، وەکئەوەیە کەسەکان لە دۆزەخدا بن، کە ئەو بە وشە کوردییە کۆنەکە: واتە جەهەننەم[2] گوزراشی لێدەکات.

---

[1] ادوارد رلف: مكان و بی مكانی، سەرچاوەی پێشووتر، ل: 21.

[2] جەهەنەم، دۆزەخ، وشەیەکی کوردییە. جەهەنەم لە (جەه) واتە جێی و نم واتە نزمەوە هاتووە، کە لە قورئاندا بە أسفل السافلين ناوی بڕاوە. بڕوانە جەمال نەبەز، 2007، ل: 96

ئەم دابەشکارییە بێ هۆ نیە و دەبێت پاشتر لە ئاستیدا بوەستین. هەروەها سەرنج بدەین چۆن شیعر و بەیتەکانی خۆی دەکاتە هۆکاری کۆبوونەوەی مرۆڤەکان لە دەوری کۆیێ و بەو جۆرەش بە سەنتەرکردنی شارەکە بۆ گشت. دیسانەوە بە گەڕانەوەی بۆ ئەفسانە و ئایین و بە ناوهێنانی دوو پەیامبەر، یەکیان یەهوودی (سموەئیل) و ئەویدیکەیان (ئیسماعیل) و بە چەقکردنی چیای قەندیل، چ هەوڵێک دەدات بۆ بەسەنتەرکردنی کوردستان.

لە یادکردنەوەیەکیشیدا بۆ سەفەرێکی بەناو کوردستان و مەڵبەندەکەیا لەگەڵ هاوڕێیەکی، هەژاریی خۆی بیر دەخاتەوە کە بە پێی خاوسی بەسەر خاکی (باڵەک)دا ڕۆیشتووە و دڕک و داڵ و داری ئەو خاکە لە ژێر پێیدا وەک مەخمەڵی نەرم و قاڵیی وابوون. جگە لەو زیادەڕۆییە لە هەوڵداندا بۆ *نەرمکردنەوەی* شوێنەکانی کوردستان، *پێخاوسبوونەکەش* هەڵگریی دەلالەتی خۆیەتی، نەک لەبەر ئەوەی باری ئابووریی ئەوسای حاجی قادر ئاشکرا دەکات: ئەوە دەردەخات کە چۆن حاجی نایەوێت پیشانی دات لە نێوان خۆی و جەستەی خۆی و شوێنە پیرۆزەکەیدا (کوردستان)، هیچ سنوورێکی جیاکەرەوە هەبێت. ئیدی دواجاریش، حاجی

(وەتەن) لە شێوەی مەحبووبێکدا دەبینێت کە دەبێتە جیاکەرەوەی دین و ئیمان و خۆیشی بە وێنەی ئادەم بە نەوەی ئەو خاکە دەزانێت. هەموو ئەمەش ڕەوەندێکە بەبێ سەرکێشییەکی بێ وێنە تێپەڕ نابێت: حاجی چەندە مەفتەنی منداڵی خۆی و کۆیێ و کوردستانی گەورە بەپیرۆز دەکات و بە سەنتەریان دەکات، ئەوەندەش جیهان و ئەستەمبووڵ و شوێنەکانی دی بچووک و ڕەزیل دەکات و شەق لە قوبەی (کشمیری سەرووی ڕۆژئاوای هیندستان)، هەڵدەدات:

لە مەیدانی بەهارا شارەکەی "کۆ"

قوبەی کشمیری دا بەر شەق وەکوو گۆ

(دیوان، ل:247)

یان بزانە چۆن شاری ڕۆما، یان ئەستەمبووڵ، بە پێچەوانەی لێکدانەوەی دیوانەکەیەوە، *بەژن* دەکات و لەو ڕێگەیەوە و بەپێی میکانیزمەکانی پیاوسالاری بە شاری ژنانی ناو دەبات:

مەڵێن: بێ کارە بوو "حاجی" لە ڕۆما

ئەمن پیاوم لە نێو شاری ژنانم

(دیوان، ل: 85)[1]

---

[1] لە دیوانەکەی حاجیدا ئەم بەیتە وەها لێکدراوەتەوە گوایە باسی بێ ژنی و بێ منداڵی حاجی دەگرێتەوە، بڕوانە: دیوانی حاجی قادری کۆیی، پەراوێزی 1. ل: 85.

هەروەها بنۆڕە چۆن بە خۆڕایی بوونی مەتاع لە شاری ڕۆما (ئەستەمبووڵ)، هێشتا گران دەبینێ:

**لە ڕۆما گەر مەتاعێ بێ تەماعی**

**بە خۆڕایی بدەن هێشتا گرانە**

(دیوان، ل: 136)

یاخود ئەم شکاندنەی ڕۆمییەکان بە زمانێکی زبر:

**ناگەن بە حیز و ڕیگری ئێمە لە موڵکی ڕۆم**

**عەللامەیی ویلایەت و شێخی ویلایەتی**

(دیوان، ل: 164).

هەروەها لە پرۆسە سەرکێشییەکەیدا بۆ گەورەکردنی کوردستانی گەورە بە شاری جەزیرەی بۆتان بەبێ ڕوودەرباسی، دەڵێت:

**ئێستاکە جزیرە بێ موحابا**

**مەعمورەیی ئەوەڵە لە دونیا** (دیوان، ل: 198)، کە هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی ئەمە وەک ڕاستییەک، پشتڕاستناکاتەوە.

بۆیە لەم پرۆسەیەدا هەمیشە جۆرێ لە گەورەکردن و بچووککردنەوە دەبینین، جۆرێ لە سەنتەر و پەراوێز دەبینین و جۆرێک لە سووککردن و بەهادارکردن دیارە.

بەتایبەتی کە بە پێی هەمان میکانیزم و لە پەیوەندیی بە تۆی دۆستەوە، کە لێرەدا مەبەستی کەیفی شاعیری هاوڕێیەتی، کوێرە دێیەک دەکاتە فیردەوس و شاری قوستەنتینییە دەکاتە جەهەننەم و دەنووسێت:

لە کوێرە دێیێ کە کەیفی تیا بێ فیردەوسە
جەهەننەمە کە نەما کەیفی شاری قوستەنتین
(، ل: 106)

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت ئایینی لاجان
ئاهێستە بڕۆ نەک وەکوو دێوانەیی هەرزە
(دیوان، ل: 120)

بەیادی کونجی تۆ "حاجی" وەکوو بووم
لە مەعموورە دەچێتە ناو کەلاوە
(دیوان، ل: 123)

ئەی موحەممەد! وەی ئەمینوددەولە! ئیمڕۆ کۆیێ تۆ
جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکەوتەوە
(دیوان، ل: 126)

هەروەکو شارانیتر کەس ئاشنای کۆیێ نەبوو
شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسەر کۆکردەوە
(دیوان، ل: 134).

له وەفا سموەئیل و ئیسماعیل
عەهد و پەیمانیان چیای قەندیل
(دیوان، ل: 212)

بە فیکرت دێ زەمانێ چووینە "باڵەک"
بە پێ خاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەک
لەبەر پێم دڕک و دار و شاخ و باری
وەکوو مەخمەر بوو نەرمی یا نە قاڵی
کە چووینە "سینگوورە" سینەم گڕی بەست
وەکوو "قەندیل"ی سەرگەردان، وەکوو مەست
(دیوان، ل: 244).

نمونەی جەننەتە شیوی "ڕەزان"ی
بەهاری شامە ئەییامی خەزانی
(دیوان، ل: 248)

وەتەن مەحبووبەیێکە حوجرە ئارای
نیشانەی دین وئیمانە تەمەننای
لە "ئادەم" بگرە تا دەورانی ئێستا
یەکێکە "حاجی" لەو خاکە هەڵستا
(دیوان، ل: 250)

لە هەموو ئەو نمونانەدا، حاجیی قادری کۆیی ناوی هەندێ شوێنی پیرۆز دەهێنێت کە پەیوەندییان بە فۆرمێکی ئاییندارێی و ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، هەیە و هەڵگریی ئاماژەی کولتووریی و تیرِوانینی تایبەتن، ئەمە وێرای ئەوەی هەڵگریی نیشانەکانی شوێنگەلێکی تایبەتیشن لە پەیوەندیی بە ژیانی سەرەتایی حاجی قادرەوە.

لێرەوە دەتوانم بڵێم: ناوهێنانی ئەو شوێنە پیرۆزانە و بەپیرۆزکردنی شوێنەکان، ئەوەندەی پەیوەندییان هەیە بە یادوەریی سەرەتایی حاجی قادر بە شوێنی یەکەمەوە[1]، ئەوەندە پەیوەندییان نییە بە بەستنەوەی حاجی قادر بە بیروڕایەکی ئایینیی تایبەتەوە. بۆ ئەمەیان بەڵگەی زۆرمان بە دەستەوەن کە چۆن حاجی ئاییندارێی لە ئاستە پراکتیکیەکەیدا و وەکئەوەی لەلایەن هەندێ شێخ و

---

[1] بۆ باشتر تێگەیشتن لە بەستنەوەی یادوەریی تایبەت و کۆ بە ڕووداوو و شوێنێکی تایبەتەوە و ئەو ڕووداوانەی لە ژیانی کەسان و مرۆڤەکاندا ڕوویانداوە و بە ڕووداوی یەکەم هەژماریان دەکەن و وەزیفەی ئایدیۆلۆژیانەی ئەم یادکردنەوانە، بڕوانە وتارە گرنگەکەی پۆل ڕیکۆر:

- پۆل ڕیکۆر: "*خەیاڵی کۆمەڵایەتی و مەسەلەی ئایدیۆلۆژیا و یۆتۆپیا*". لە: ئازاد سوبحی: دەنگ و سێبەر. کۆمەڵە وتار. چاپی یەکەم، هەولێر: لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری نما (8)، 2002، ل: 215-217.

دەرویش و مووریدی کوردانەوە جێبەجێکراوە، ڕەتدەکاتەوە.

من تەواو لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە دەڵێت: "حاجی قادر بە گشتی ڕەخنەی لە هەموو شێخانی تەریقەت نەگرتووە، بەڵکو لەوانەی گرتووە کە خەریکی فڕوفێڵ، ساختەبازی و خیچاندنی مرۆڤی ساویلکە و نەفام بوون"[1]. بەڵام ئەم ڕاستییە ئەو ڕەهەندە ڕەخنەگرانەیە لە شیعری حاجیدا ناشارێتەوە، کە *لە ڕەخنەگرتن لە نوێنەرانی ئایینییەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە شوێنە ئایینیەکان و لەوێشەوە بۆ خودی ئایینەکە درێژ دەبێتەوە*. لەم ڕووەوە، کتێبەکەی مامۆستا خالید دلێر: (*ستەمکردن لە حاجی قادری کۆیی تاوانە* (1998)، کە لە ڕوانگەیەکی چەپیانە و بە بەرجەستەکرنی ئەم لایەنە ڕەخنەییەی حاجی قادر لە وەڵامی سیانەییەکەی مامۆستا مەسعود محەمەد دا، نوسیویەتی، بایەخی تایبەتی خۆی هەیە[2]. ئەمە جگە لەوەی بۆ پتەوکردنی ئەو سەرنجەم کە باس لە ڕەخنەی حاجی لە ئایین دەکات، پێویستە ئەو بەیتەش لەبیر نەکەین کە

---

[1] د. جەمال محەمەد فەقێ ڕەسوڵ باجەلان: "*ڕۆڵی حوجرەی مزگەوتەکانی کوردستان لە سەر ژیان و هزر و بەرهەمی حاجی قادری کۆیی*" لە: دیداری حاجی قادری کۆیی (2016)، تەقتەق، ل: 50-51

[2] خالید دلێر: ستەمکردن لە حاجی قادری کۆیی تاوانە. سلێمانی، چاپخانە و ئۆفیسی سەفوەت، 1998.

تیایدا حاجی خۆی بە فەقێیەکی دەستکورت ناودەبات، بەڵام خۆی بە دەوڵەمەند دەزانێت چونکە سیپارە (سیی جزمەی قورئان)ی لە باخەڵدایە:

**من فەقێم و غەیری سیپارەم لە باخەڵدا نییە**
**ئەو کەسەی ساحێب قرانە ئیدعای غازی دەکا**

پاش ئەمەش دەڵێت:

**ساغی لەم ڕێگایەدا کاری لە دین چی؟ سادیقە**
**هەرکەسێکی عاشیقە ئەلبەتتە ئەنبازی دەکا**

(دیوان، ل: 50)

حاجی لەم بەیتەدا و لە بەیتەکانی پێشووتردا، پارە و مادە و سیحر و ئیعجاز ڕەتدەکاتەوە و عەشق دەکاتە پێوەری ساغیی و ڕاستگۆیی و هاودەردی و دۆستایەتی، نەک ئایینێکی تایبەت. حاجی بە مانایەک دین سۆبژەکتیڤە دەکاتەوە و بە پەیوەندییەکی ڕۆحیی و مەعنەوی نێوان مرۆڤ و خودای دەزانێت و (حەق تەعالا) دەکاتە شایەتی خۆی، هەر بۆیەش باکی نیە بە بۆچوونی کەسەکان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا:

**تاکی دونیا مایە پوختەی هەر هەیە**
**لەم کەر و خامەی کە هەن باکم نییە**
**با بڵێن: ئەم شێتە قەحپە مردووە**
**چەند وەڕیوە، چەند وڕێنەی کردووە!**

## حەق تەعالا واقیفی ئەحواڵمە
## "خالصا للە"یە تەرقیمی ئەمە
## (ل: 207)

هەروەها لە بەیتێکی دیکەیدا، ناوهێنانی پەیامبەری مسوڵمانان بە کەسێکی سیاسی و ئیداریی ناو دەبات، نەک پەیامبەرێک:

**ئەی موحەمەد! وەی ئەمینوددەولە! ئیمڕۆ کۆیی تۆ**
**جەننەتێکە کەوتە دۆزەخ هەرچی لێی دوورکەوتەوە.**

ناوهێنانی پێغەمبەر لەم دەقەدا، بەناوی خۆیەوە، نەک پێگە و پیشەکەی و بینینی وەک سەرکردەیەکی متمانەپێکراوی دەوڵەت، کە دەوڵەتیش شتێکی مادییانە و ماتەریاڵیزەبووە، نەک ناوهێنانی وەک پێشەوای ڕۆحی، پرسیار بزوێنن. ناوهێنانی بەبێ ناردنی درووود بۆی، وەکئەوەی لە نەریتی زارەکیی و نووسراوی ئیسلامیدا باوە، هەروەها بە جەننەت (فیردەوس، یان بەهەشت)، لە قەڵەمدانی کۆیێ لە دۆخی ئامادەبوون تیایدا و کردنی بە دۆزەخ لە دۆخی دوورکەوتنەوە لێی، بە لەبەرچاوگرتنی پێگەی بەهەشت لە ئایینی ئیسلامدا وەک شوێنێکی وادەپێدراو، هەروەها بەپیرۆزکردنی شوێنێکی کۆنکرێتی

وەک شاری کۆیێ و بەراووردکردنی بە بەهەشت، بەڵگەی ئەو ڕاڕاییە ئیمانداریيەی حاجی پتەو دەکەن. ئەڵبەت لە شیعری دیکەیدا، حاجی لەسەر ئەم بیروڕایەی دەڕوات و پێغەمبەر وەک قارەمانی ئیمانێکی ڕاستەقینە دەخاتە ڕوو، لەبەرامبەر ئاینداراني ساختەکار و چاوبەستکەردا، کە پاشان لێی دەدوێم.

ئەمە جگە لەوەی حاجی لە تێکڕای شیعرە نیشتیمانییەکانیدا ڕەوتێکی ئیرادەگەرانە و هاندانی مرۆڤی کورد دەگرێتە بەر بۆ یەکگرتن و زانست و پێشکەوتن و هاندانیان بۆ دروستکردنی دەوڵەت وەک بەرەئەنجامی ئیرادەی مرۆڤانەی خۆی، بە ئاشکرا دیارە. ئەمەش لەگەڵ ڕەوتی ئایینی ئیسلامدا کە مرۆڤ هاندەدات چارەنووسی پێشتر بڕیار لەسەردراوی خۆی پەسەند بکات و هیچ ویستێک، جگە لەوەی لە چارەی نووسراوە، پەسەند نەکات، لەگەڵ بنەما دینییەکان و ئایینداریی باوی سەردەمەکەی خۆی، تەواو پێچەوانەیە:

**پاڕانەوە و تەوەککول لەم عەسرە پارە ناکا**

**تیرە دوعای "جەوشن"، پەیکانە "حیرز"ی[1] مەیدان**

(دیوان، ل: 97)

---

[1] وشەکانی جەوشن و حیرز دوو وشەی عەرەبین و بە مانای (زرێی ئاسن و جۆرە دوعایەک) دێن، بڕوانە دیوان، ل: 97، پەراوێزی یەکەم.

لە ڕەخنەی شێخەکاندا دەنووسێت:

بێ مینەتە گەر خوانی وەلی نیعمەتی "حاجی"
ئەم شێخە چییە؟ "قونچکی پیازە، سەری سیر (ل: 69)

پاشان وەک پێداچوونەوە بە ڕۆژگاری گەنجێتی خۆیدا و وەک ڕەخنەگرتن لە ئاستی هووشیاریی خۆی لەو ڕۆژگارەدا، دەنووسێت:

کە دەیگوت شێخی من: من دەستگیرم
لەلام وابوو لەبەر جەهل و جوانی
کە پیر بووم تێگەیشتم دەستی گرتم
لە کەسب و کاری تەحسیلی مەعانی
بەڵێ شێخ قوتبە ئەمما قوتبی ئاشە
بە ئاو و نیعمەتی خەڵکە گەڕانی
(دیوان، ل: 153)

ڕێگر و حیز و دزە، ژن هەڵگر و ماڵان بڕە
فائیدەی چی نێو و کونیەی خۆی مسوڵمان دادەنێ
وا دەزانێ قەومی خۆی وەک دایە بەر شیر و تفەنگ
قەسری دین ئاوا دەکا، بونیادی ئیمان دادەنێ

سائیلێکی[1] مەککەیی دێت و بە مەکتووبی درۆ
حیشمەتێک پەیدا دەکا، ماڵی فراوان دادەنێ
(دیوان، ل: 183)

خانەقا و شێخ و تەکیەکان یەکسەر
پێم بڵێن: نەفعیان چییە ئاخر
غەیری تەعلیمی تەنبەڵی کردن
جەمعی ئەملاک و خەزنە کۆکردن
دەفعەیەک ئیمتیحانیان ناکەن
تێ بگەن زەهرە یا نە تریاکن
(دیوان، ل: 188)
سۆفی وەک تیشنە بوو لە زیکری هەتاو
سەد نوێژی دەدا بە کاسەیەک ئاو
شیعی وەک تیشنە بوو لە سینە زەدەن
بە دوو قەترە دەدا حوسەین و حەسەن
(دیوان، ل: 191)

هەروەها حاجی بە ئاشکرا باس لە جۆرێ لە ڕێژەگەرایی دینی دەکات و عیلم و فەن و عیرفان دەکاتە مەرجی چوونە بەهەشت:

تۆ وەرە فەننێ فێر بە چیتە لەوە

[1] سائیل واتە سواڵکەر، بڕوانە دیوان، ل: 183، پەراوێزی 2.

## گاورە، هیندووە، وەیاخۆ جووە

**ئەهلی جەننەت نە شوان و گاوانە**
**ساحیبی فەنن و عیلم و عیرفانە**
(دیوان، ل: 190)
**لە جۆشین و لە نێشا مێشی هەنگن**
**بە من چی کافرن یانە فەرەنگن**
(ل: 231).

ویرای ئەمانەش کاتێک بیروڕای حاجی لەسەر کات و دۆخەکانی شییدەکەینەوە و بۆمان دەردەکەوێت کە دۆخی (ڕابردوو) بۆ حاجی هەمان بایەخی نیە لە چاو (ئێستا)دا و کاتێکیش بۆمان دەردەکەوێت کە (داهاتوو)یەکیش مرۆڤ بە ویستی خۆی دروستیکات گرنگترە لە هەر کاتێکی دی، کە مژدەی پێدراوە، ئیدی زۆر شتمان لەسەر نەگوتراوەکانی حاجی لەبارەی دینەوە بۆ ئاشکرا دەبێت و هەرگیز نەچوونە حەج و هەرگیز نەبوونە مەلایەتییەکەی ڕاپێچمان دەکەنە ناو لێکدانەوەی دیکەوە. کاتێک هەموو ئەمانەش لەگەڵ هەڵوێستی ڕاستەوخۆی حاجیدا لەسەر نوێنەرانی ئەم دینە لە کوردستانی ئەوسادا، بەراوورد دەکەین کە چەندە

ڕەخنەیی و تیژ و زبر ڕووبەڕوویان دەبێتەوە، گومان لە جۆرێک لە تووڕەیی حاجی لە ئاست ئاییندا ناهێڵنەوە. ئەو دێڕەشی کە ئایین بە تلیاک دەچووێنێت، نەک بۆ ئەوسا، بۆ ئێستاش بوێرانە و جێی مەترسییە.

بەمجۆرەش ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرەی لەم دێڕانەی خوارەوەدا خۆی بەرجەستە دەکات، هیچ گومان لەسەر ئەوە ناهێڵێتەوە کە حاجی سەرەتا لە ڕێگەی قسە وتن بە و ڕەخنەگرتنی لە شێخ و دەروێشەکان، هەڵوێستی خۆی لە ئاییندارییی دەردەبڕێت، بەڵام دوایی ئەم ڕەخنەیە ئاراستەی دین خۆیشی دەکات. (پێشتر لە شیعری کوردییدا شاعیران ڕەخنەی پیاوانی ئایینیی و ئاییندارییی ڕەشەخەڵکیان کردووە، هەر بۆ نموونە *مەحوی* و *شێخ ڕەزا*، پێش ئەوانیش *نالی* و *سالم* و *کوردی* هەمان شتیان کردووە، هەمیشە لە شیعری ئەواندا ئیدیۆمی وەکو «وشکەسۆفی، زاهید و شێخ» هێما بوون بۆ ئەو مرۆڤانەی ئاینیان کردووە بە کاڵایەک و بازرگانییان پێوە کردووە، بەڵام هیچ کات نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی کە ڕەخنەی خودی ئایین خۆی بکەن، یان ڕەخنەی دامەزراوە

ئایینییەکان بکەن، ئەم کارە بۆ یەکەمجار لەلایەن حاجی *قادرەوە* دەکرێت)[1] :

**شەریعەت گەر بزانی یا نەزانی**
**وەکوو کەر دەچنە بن باری گرانی**

(دیوان، ل: 254).

بەشێکی زۆری شیعری (تاجی بیسم الله) ئەم پەیوەندییە ڕەخنەگرانەیەی حاجیمان بە دین و ئاییندااران و چۆنێتی جیاکردنەوەیان، بۆ ڕوون دەکاتەوە. ئەو لەم دەقەدا (ماجەرا) و بەسەرهاتی پەیوەندیی خودا و پێغەمبەر باس دەکات. خودا بە (بانی)، یان وەستای نۆ تاقی ئاسمان (قوببەی بێ ستوون)، ناو دەبات کە چۆن (کەعبە)ی بۆ کردووینەتە ڕێنموون و سەنتەری ژیانێکی دیندارانە. لەمەشدا دەلالەتێکی جوانی شوێنناسیانە هەیە، پشتیوانەی قسەکەشی بە فەرموودەیەکی پێغەمبەر بەهێز دەکات:

**قاسیدی پەیغامی فەرمووی "مەن بەنا**
**مەسجیدەن، یوبنا لەهو بەیتون کەما**

(ل:202)

---

[1] یاسین عومەر ئیبراهیم: مۆدێرنە و ڕەخنەکردنی کۆمەڵایەتیانەی ئایین لە هەرێمی کوردستاندا. ماستەرنامە (بڵاو نەکراوەتەوە)، زانکۆی سلێمانی، بەشی کۆمەڵناسی، 2016، ل: 66

پاشان ئەم فەرموودەیە بە یەکێکیتر، بەڵام *گەردوونناسیانە*تر و مەعنەویانەتر، پشتئەستوور دەکات:

**باز فەرمووی: سەربەسەر ڕووی زەمین**

**مەسجیدە بۆ زیکری "رب العالمین"**

**یەعنی هەر ماڵێ کرابێ بۆ خودا**

**کەعبەیی عەلیایە بۆ زیکر و دوعا**

وەکئەوەی حاجی بیەوێت فەرموودەی یەکەم، کە (هەرکەس مزگەوتێ دروست بکات، لە بەهەشتدا خانووێکی چەشنی ئەوی بۆ دروستدەکرێت)، بخاتە پەراوێزەوە، چونکە بەپێی بەیتی دواتر، دەکرێت سەرجەمی زەوی شوێنی یادکردنەوەی خودا بێت. لێرەدا ڕووداوێکی گرنگ ڕوویداوە کە تێگەیشتنی سۆبژەکتیڤانەی حاجیمان لە دین بۆ ڕووندەکاتەوە. سەرەتا لە زمان پێغەمبەرەوە ئەوەی پێڕاگەیاندین کە ئەو کەسەی مزگەوتێک دروست بکات، پاداشتەکەی لە بەهەشتدا وەردەگرێت. مزگەوتیش بە شوێنی عیبادەت و یادکردنەوەی خودا ناو دەبات.

بەڵام بۆ ئەوەی عیبادەت بکەین، چ پێویستە چاوەڕێی پاداش بین؟ لێرەدا حاجی لە *ئیمانباوەڕی پاداشتویستانەوە*، کە *مرۆڤی مشەخۆر* لەبواری ئیماندا دروست دەکات، دەگوێزێتەوە بۆ ئیمانباوەڕیی بێمەرج لە

پێناوی ئیمان خۆیدا. بۆیه له بەیتی دواتر ئەم چاوەڕوانییه له دروستکردنی مزگەوت به ڕەتکردنەوەی (دروستکردن) وەک مەرجێک بۆ (پاداشتکردنەوە)، دەسڕێتەوە، چونکه بۆ بڕوادارێک بیەوێت *زیکری خودای خۆی بکات و عیبادەت بکات، پێویستی به بینایەیەکی تایبەت نیه، بەڵکو سەراپای زەوی جێگەی عیبادەته.* لێرەشەوه مانای کەعبه و مزگەوت له ماجەراکەی حاجیدا، گۆڕانیان بەسەردا دێت: سەرەتا کەعبه لەو شوێنەی که هەیە، جێگەیەکی تایبەته و پنتی ڕێنموونی ئێمەیە. پاشان هەموو زەوی دەبێته (مەسجید) و پاشانیش هەر (ماڵ)ێک دەبێته (کەعبەیەک)، که ئیماندار دەتوانێت عیبادەتی خۆی تێدا بکات:

**یەعنی هەر ماڵی کرابێ بۆ خودا**

**کەعبەیی عەلیایه بۆ زیکر و دوعا** (ل: 203)

بەمجۆرەش هەر شوێنێک پەیوەند بەوەی عیبادەتی تێدا دەکرێت، ماڵی خودایه و شوێنی یادکردنەوەی و هیچ شوێنێک بەتەنیا نیه که شوێنی ئەم عیبادەته بێت. لێرەدایە، حاجی شوێنەکانی دیکەی وەک (تەکیه) و (خانەقا)کان، که گوایه شوێنی عیبادەتن، (جگه له ڕەهەنده میعمارییەکەیان)، ڕەتدەکاتەوه و به شوێنی ڕیایان دەزانێت:

شکڵی تەکیە و خانەقاهی شێخەکان
واقیعەن ڕەنگینە ئەمما بۆ ڕییان
لەم هەموو شێخ و موریدانەی ڕیا
فەردەکی ناچێتە مزگەوتی خودا
مەسجید و میحراب و مینبەر بێ کەسە
هەم مەپرسە حاڵی چۆنە مەدرەسە
شەیخەنا گەر ئەم قسەت نایێتە گوێ
سەیری وا چۆڵە کەری تێدا بگێ (ل: 203)

لە بەیتەکانی دیکەدا، حاجی قادر باسی دوو نمونەی شوێنیی دیکە: (مەرقەد) و (قوببە)ی ئەهلی ڕاز، دەکات و خەمیان بۆ دەخوات، کە ئەوانیش شوێنی عیبادەتی ڕاستەقینەن، بەڵام لەبەر هێرشی ئمیانباوەڕانی پاداشتخواز و مشەخۆر، چ لە دنیا و چ لە ئاخیرەت، ئەوانیش بەو دەردەچوون کە چوون:

مەرقەدی ئەقتاب و قوببەی ئەهلی ڕاز
بۆتە جێگەی گاگەل و مۆڵگەی بەراز
(ل: 204)

لە دینباوەڕیی بێ ڕییایانەی حاجیدا، جگە لە قوتبەکانی وەک (مەولانا خالید) و (ئەهلی ڕاز) و کەسانیتر کە لە

شیعرەکانیتری دیکەیدا ناوی هێناون، تەنیا پێغەمبەر قارەمانی سەرەکییە. بۆیە حاجی قادر لەبەرامبەر دەستەی ڕیکاران و نومایشکارانی ئاییندا، کە (موعجیزە و کەشف و کەرامات و دوعا و تەزبیح و میسواک و خەرقە و تەیلەسان)، دەکەنە ئامرازی ئیمانباوەڕییە پاداشتخوازییەکەیان بۆ چاوبەستکردن و لە ژێرەوە تەڕکدان لە خەڵک: (ئەم ئیشارانە بە جێگایە و بە ڕێ/ نەک وەکوو چاو بەستە تەڕکی بن بەڕێ)، (ل: 206)، کەسایەتی پێغمەبەر خۆی دەکاتە نمونە و پێوەری ئیمانی ڕاستەقینە، کە چاوەڕێی هیچ پاداشتێک لە ئیمان ناکات، چونکە ئیمان خۆی پاداشتەکەیە:

موعجیزە و کەشف و کەرامات و دوعا
بۆچی نەیبوو فەخری عالەم مستەفا؟
جیسمی نوورین و ددانی گەوهەرین
ئەو شکا، ئەمیان بووە جێگای برین
سەبحە و میسواک و خەرقە و تەیلەسان
بوونە پابەندی جیهادی غازییان (ل: 204)

من ئیتر لەسەر ئەم شیعرەی حاجی ناڕۆم، چونکە پێموایە ڕوونکردنەوەی پێویستم لەسەر بۆچوونەکانی خستە ڕوو. جیاکارەکانیم ئاشکرا کرد و قارەمانە

ئیماندارەکانی حاجیم لە ڕیاکارانی ئایینی جیا کردەوە. ئەم بەڵگە و قسانە هیچیان بۆ ئەوە نەبوون حاجی بەبێ ئیمان ناونووس بکەم. بەڵام ئیمانی حاجی قادر تایبەت و خوداناسییەکەشی خوداناسییەکی کوردیانەی زۆر گرنگە. خوداناسیی حاجی قادر، خواناسییەکی نەریتی نیە. ئەو پیڕەوی لە خوداناسییەکی پاکژ دەکات، کە تیایدا خودا لە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆدایە لەگەڵ کەسی ئیمانداردا. ئیمانداریش کەسێکە، نەک جەماعەتێک. لە مەشدا تێگەیشتنێکی مۆدێرنی حاجی هەیە بۆ مەسەلەی ئیمان و بەستنەوەی بە تاکەکەسەوە و سۆبژەکتیڤەکردنی دینەوە وەک ڕێگایەک بۆ دەربازبوون لە ئایینباوەڕیی ئاپۆرەیی. بۆ تێگەیشتن لە خوداباوەڕییەکی ئەوتۆ لەلای حاجی قادر، هیچ شیعرێکی ئەوەندەی دەقی (ئەی بێ نەزیر و هەمتا) بە گرنگ نابینم. پێشئەوەی باسەکەشم لەسەر شوێنی پیرۆز، تەواو بکەم، کەمێک لەسەر ئەم دەقەش دەوەستم بۆ ئەوەی گومانێک لەسەر بڕواداریی سۆبژەکتیڤانەی حاجی دروستنەبێت.

## ئەی بێ نەزیر و هەمتا

پێناسەی حاجی قادر بۆ خودا، لە بێنموونەیی و بێ هاوتایی خوداوە دەست پێدەکات، کە لە هەمان کاتیشدا

بوونێکی بەرقەرارانەی هەیە. بوونێکی بێدارانە و پایەدارانە، بەبێ ئەوەی شوێنێک، یان دار و دیارێک هەبێت ئەم پایەدارییەی تێدا بێتە ئەنجام. پێشتریش حاجی گوتبووی خودا لە هەر جێیەکە و سەراپای زەوی شوێنی عیبادەتی خودایە:

**ئەی بێ نەزیر و هەمتا هەر تۆی کە بەرقەراری**
**بێ دار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری**




(وێنەی بەشێک لە مزگەوتی ئومەرگومەت)

پایەداریی خودا پەیوەندیی بە شوێنەوە نیە. بوونی ئەو دەرەکات و دەرە شوێنە. بگرە پێش کات و پێش شوێنە. ئەو بوونێکی تەجەلایانەی هەیە، چ لە سرووشت و چ لە ڕەگەزەکانیدا. حاجی ئینکاریی نەبوونی جیاکارەی چینایەتی لە مەملەکەتی خوادا ناکات، بەڵام بوونی ئەو بۆ هەمووان وەکو یەکە. بوونی خودا دابەش و پارچەپارچە

نابێت، تا بەشێکی بۆ دەوڵەمەندەکان و بەشێکی بۆ هەژاران بێت. ئەو نیشانەکەی پاشایانەیە، بەڵام لە شوێنی پاشاکان ناژی و سنوورێکی پەردەیی خودا لە مرۆڤ جیا ناکاتەوە، خودا لە نێوان خۆیی و مرۆڤدا پەردەداری ناوێت:

**بۆ باغی مەردی باغی سەرمایەکەی خەزانی**
**بۆ مەزرعەی فەقیران سەرمایەکەی بەهاری**
**تۆ پادشا نیشانی بۆ هەر سەوادی ئەعزەم**
**بێ سەدر و شانشینی، بێ پەردە و پەردەداری**

لە قۆناغێکی دیکەدا، خودا وەک بکەر بۆ حاجی بەدەر دەکەوێت: ئەو داهێنەر و خەللاقە. سوڵتانێکی بێ کەم و کورە. نەک تەنیا لە پەیوەندیی بە مرۆڤ و ئەو شوێنانەی بەپێتیی سرووشت دەیانگرێتەوە لەسەر زەوی، بەڵکو لە ژێر زەوی و لەو شوێنانەش کە دێمەکارن. خودا بۆ ئەوەی بەمجۆرە بێت کە حاجی باسی دەکات، دەبێت دوو سیفەتی دیکەیشی تێدا بێت: یەکەم (ڕەزاق) و بەخشندە بێت بۆ ئەو بوونەووەر و مار و مێرووانەی لە ژێر زەوی دەژین، دووەمیش (ئاودێر)ی ئەو شوێنانە بێت کە دێمەکارن و ئاو نایانگرێتەوە. لەوەدا کە خودا بە سوڵتان دەچوێنێت، پێگەیەکی (بەرزی)ی بۆ دەستنیشان دەکات،

بەڵام سوڵتانێک کە ئامادەیە بێتە (خوارەوە) بۆ ئاستی مارومووری ژێر عەرد و ببێتە تەڕایی بۆ دیمەکاریی ناوچە وشکاییەکانیش. بەمجۆرەش، خودای حاجی تەنیا چەمکێک نیە و بەس، بەڵکو بوونێکی کردەکیشی هەیە:

**خەللاقی بێ فتووری، سوڵتانی بێ قسووری**
**ڕەززاقی مار و مووری، ئاودێری دێمەکاری**

لەبەرامبەر ئەم هێنانە خوارەوەیە بۆ ئاستی مارومێروو، خودای حاجی وەدیهێنەری سەقفی شینی ئاسمانیشە، کە یاقووتەکەی ڕۆژ و ئەستێرەکانیش دووڕڕەکەین. ئەمەش دەلالەت لە بوونی ئەو لە هەموو جێیەک دەکات لە کاتێکدا بۆ خۆی بێ جێی و بێ مەکانە و لە هەمان کاتیشدا، دەلالەت لە توانای بەرینی خودا لە ئەفراندندا دەکات:

**فەیرۆزە تەختی گەردوون مەسنوعی نەقشی تۆیە**
**یاقووت و لەعلی ڕۆژە ئەستێرەکان دەراری**

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەرچی جێگە و شوێنێک کە هەبێت و هەر شەووڕۆژێک کە هەڵبێ و ئاوا ببێ، دەستکردی ئەم خودایەن، بەبێ ئەوەی بۆخۆی لە شوێن و جێگەیەکی

تایبەت و بەبێ ئەوەی ئەم شەووڕۆژ هەڵهاتن و ئاوابوونە، لە خۆشی هەڵبێن و ئاواش ببن:

**جێ و مەکانی تۆیە بێ جێ و بێ مەکانی**

**لەیل و نەهاری تۆیە بێ لەیل و بێ نەهاری**

بەمجۆرەش جیاوازیی شەو و ڕۆژ کە نیشانەی تێپەڕبوونی کاتە، خودا ناگرێتەوە. چونکە ئەو چۆن لە هیچ شوێن و جێگەیەک نیە، ئاواش هیچ شەووڕۆژێکی بۆ نیە. بوونی ئەو لە دەرەوەی شوێن و جێ و لە دەرەوەی ڕۆژ و شەوە. ئەو بەرقەرارە و وەک خۆی هەیە، کە بوونەکەی پەیوەست نیە بە بوونی شتێکیترەوە لە دەرەوەی خۆی.

ئەم خودایە کە سوڵتان و شا بوو، هەر تەنیا بکەرێکی کردەیی نیە، هەر تەنیا ئەفرێنەرێک نیە، بەڵکو فەرماندەیەکیشە کە هەر فەرمانێکی مەداری کاروباری جیهان هەڵدەسووڕێنێت بەبێ ئەوەی هیچ وەزیر و سەرۆکوەزیرێکیشی هەبێت. دەستی درێژکراوەی ئەو، تیشکی نوورەکەیەتی (الله نور السماوات والارض)، کە بەهۆی خورشید (خۆر) و مانگەوە وەک دوو هاوسێی گەڕیدە بە جیهاندا سەفەر دەکەن، بەبێ هیچ کەژاوەیەک:

**هەر ئەمری تۆ مەدارە بۆ کار و باری عالەم**

**هەرچەندە بێ وەزیر و بێ سەدر و کار و باری**

سەحرانەوەردی شەوقت خورشید و ماهی تابان
دوو جارییەن شەو و ڕۆژ بێ مەحمەل و عەماری

حاجی قادر لە کۆتاییدا پەیوەندییەکی سەرنجڕاکێش لە نێوان خۆشەویستی بۆ خودا و خۆشەویستی بۆ زمانی کوردی دەهێنێتە ئاراوە. مەدحی خودایەکی ئاوا مەزن و فراوان، کە نە شوێن لە خۆی دەگرێ و نەکات، کەچی لە هەموو شوێن و کاتێکشدا هەیە، بە هەر زمانێک، نیشانەی فراوانی زمانەکە و دەوڵەمەندییەکەی دەگرێتەوە. حاجی ئەمکارەی کردووە تا بیسەلمێنێت، کە گەورەیی و فراوانیی خودا لە دەوڵەمەندیی زمانی کوردیدا جێگەی دەبێتەوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە پێچەوانەکەشی ڕاستە: ئەوە زمانی کوردییە کە وەک دەفرێک جێگەی وەسفی بەرینی خودا، لە خۆیدا دەکاتەوە، بۆیە دەبێت دەفر لە دەفرکراو بەرینتر بێت!

مەعلوومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی
تا کەس نەڵێ: بە کوردی نەکراوە مەدحی باری
(دیوان، ل: 150-151)

بەمجۆرەش، حاجی لە نێوان خودناسی و کوردایەتی خۆیدا، پەیوەندییەک دروستدەکات و خودا لەناو زمانەکەیدا دەکوردێنێ، یان بەوەی لە زمانی کوردیدا وەسفی خودا دەکات، ئەم زمانەش بەرین دەکات.

من هەموو ئەم شیکردنەوانەم تێهەڵکێش کردن بۆ ئەوەی بچمە سەر باسی شوێنی پیرۆز و نا پیرۆز، لە جیهانبینی باوەڕدارانەی حاجیدا.
وەلێ کاتێک هەموو ئەمانە پێکەوە دەبینین، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، حاجی ناوی شوێنە پیرۆزەکان لە پەیوەندیی بە شوێنە تایبەتییەکانی ژیانی خۆیەوە دەهێنێت، نەک وەک پیشاندانی پیرۆزیی ئەو شوێنانە لە پەیوەندییان بە ئایینێکی تایبەتەوە.
بۆیە هەڵوێستی حاجی بەرامبەر بە شوێنی پیرۆز لە گۆشەنیگایەکی دیکەوە هاتووە نەک لە ئایینباوەڕییەکی ڕیاکارانەوە. خۆ لە ئەستەمبووڵیش حاجی لە هەرکاتێک زیاتر نزیک بوو لە شوێنە پیرۆزەکانی هەمان ئەو دینەوە کە ئەو لەسەر ڕێبازەکەی بوو..
کۆی ئەم نمونە و لێکدانەوانەی شیعری حاجی قادر ئەوە ڕووندەکەنەوە، کە:
یەکەم: یەکێتییەکی بابەتی لە ئەزموونی شیعریی حاجی قادر دا سەبارەت بە ئاییندارانی هەیە و ئەمە تەنیا بابەتێکی پچڕ پچڕ و میزاجیانە نیە. ئەمەش ئەوە ئاشکرا دەکات، کە حاجی تێڕوانینێکی دژەباوی بۆ ئایین هەیە و دین لە نومایشی ئایینی، (ئاییندار‌ی) جیا دەکاتەوە.

دووەم: حاجی قادر ئاینداراتی خۆبەنوێنەری دین کردوو لە یەکتر جیادەکاتەوەو سەرەتا ڕەخنەی ئاراستەی ئایینداران دەکات تا دەگاتە ڕەخنەگرتنێکی شەرمنانە لە دین خۆی و هەوڵدان بۆ کەمکردنەوە لە پیرۆزیی دوو شوێن و شاری ستراتیژیی لە دنیابینی ئیسلامیدا، کە شاری مەککە و مەدینەن و بەپێی شیکارییەکانی مێرسیا ئیلیادە، دەکەونە چەقی گەردووننامسیی ئیسلامییەوە[1].
سێیەم: لە پەیوەندیی بە شوێنەوە، حاجی گشت شوێنەکانی کوردستان بە پیرۆز دەکات و گەورەیان دەکات، لەبەرامبەر ئەمەشدا گشت شوێنێکی دەرەوەی کوردستان و وڵاتی خۆی لە پیرۆزیی دەخات و بچووکیان دەکاتەوە تا ئاستی سووکایەتی پێکردن. بۆ ئەو سەراپای زەوی شوێنی ئیمان و مزگەوت و کەعبەیە.

ئەم ڕوانگەیە بۆ جیهان و شوێن لە کوێوە هاتووە؟ بێگومان لەو جیاکارەیەوە حاجی کردوویەتی لە نێوان شوێن و جیهانی سەرەتای ژیانی خۆیی و شوێن و جیهانی قۆناغی دەربەدەرییەکەی. ئەویان بە جیهان و شوێنێکی مەلەکوتی و بەهەشتیی وێنا دەکات و ئەمیان بە

[1] ئیلیادە ئەمەی لە کتێبەکەیدا أسطورەء بازگشت جاودانە باسکردووە.

جیهانێکی ناسووتی و دۆزەخی، ئەویان وەک پیرۆزییەک لە ژیانی خۆیدا بەرهەمدەهێنێتەوە و ئەمیان وەک پیسییەک و خەوشدارییەک ئەزموون دەکات.
حاجی وەک لە شیعری (*قسەیەکم هەیە دەیکەم*)یشدا بە ڕوونی ئەوەی خستۆتە ڕوو: جیهانی ئێستای خۆی کە جیهانێکی مۆدێرنە، وەک دابڕانێک لە جیهانی پێشووی ئەزموونکراوی خۆی دەبینێت کە ئیتر ناتوانێت لێرەوە دەستی بەویَ بگاتەوە. هەروەک ئیلیادەش دەڵێت: ئەزموونی جیهانیی لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا جێگەی ئەزموونە پیرۆزەکانیان گرتۆتەوە. ئەم ئەزموونە جیهانیانە جۆرە فەزایەک دەخەنە ڕوو کە "پیرۆز نین و بیَ بونیاد و بیَ سەقامگیرین"، چونکە جیهانی ئەمڕۆ چیتر ناتوانێت مرۆڤ بەرەو چەقێکی پیرۆزیی ئاراستە بکات، *ئەزموونکردن لە دنیای ئەمڕۆدا وەکئەوەیە خۆمان لەبەردەم پارچەگەلێکی دنیایەکی شکستخواردوودا ببینینەوە*[1].
حاجی قادر هەوڵێکی زۆری داوە بۆ گەڕانەوە و بەرهەمێهنانەوەی شوێنی پیرۆزی یەکەم و بەپیرۆزکردنی شوێن، بایی ئەمەش لە ئەزموونکردنی

---

[1] ادوارد رلف: مکان و بی مکانی، سەرچاوەی پێشوو، ص: 22

شوێنی ئێستای کە شاری ئەستەمبوولە، خۆی پاراستووە چونکە بە شوێنێکی زانیوە وەکئەوەی بەشێک و پارچەیەک بێت لە جیهانێکی شکستخواردوو، کە لانیکەم نابێت بۆ کوردەکان ببێتە پێشنموونەی چاولێکەری و شوێنکەوتن، وەکئەوەی لە شیعری (قسەیەکم هەیە دەیکەم، مەڵێن بێ تەجرەبەیە) باسیکردووە.
بەمجۆرەش، حاجی قادر توانیویەتی جۆرێک لە ڕاگوێزانی کولتووریی (Cultural transformation) بهێنێتە ئاراوە. خۆی دەکاتە پنتی وەرچەرخان و ڕاگوازتن و ڕایەڵکردنی پردێکی پەیوەندی:

یەکەم: لە کولتوورێکی تیرەگەرییەوە، بۆ بیری دیارگەرایی و کۆییپەرستی و لەوێشەوە بۆ نەتەوەخوازی و لە فۆرمێکی نەتەوەخوازیی بەشەکییەوە (باشووری کوردستان)، بۆ نەتەوەخوازییەکی سەرتاسەری، یان لە کۆیێ و کوردستانی باشوورەوە بۆ کوردستانی گەورە.

دووەم: ئەمە جگە لەوەی حاجی توانیویەتی سوود لە ئەزموونی تراژیدیای بنەماڵە و تیرەی خۆیان وەربگرێت (ئەزموونی سۆبژەکتیڤ)، بۆ بەرهەمهێنانەوە و خستنەڕووی تراژیدیا و کۆژانی نەتەوەیی و کردنی بە

ئەزموونێکی بابەتی. بەمکارەشی خۆی لە شوناسی تیرەکەی، کە کولتووری بێدەنگیی و نێهێنی پارێزیی بەسەردا دەسەپاند[1]، ڕزگار دەکات تاکو وەک کوردێک دەنگ هەڵبڕێت، نەک وەک ئەندامی تیرەیەک..

سێیەم: لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ئەوەیە، کە حاجی قادر شێوەزاری تیرەکەی خۆی جێدەهێڵێت کە دیسانەوە شێوەزارێکە ڕۆڵی خۆجیاکردنەوە و خۆحەشاردان دەبینێت، بۆ ئەوەی زمانی باوی نووسینی سەردەمەکەی بکاتە زمانی شیعریی و شوناسی خۆی.

---

[1] چیرۆکێک لە ژیانی دەربەندییەکاندا هەیە ئەم بۆچوونە پشتڕاستدەکاتەوە کە شێوەزارەکەیان وەک کونجێکی خۆحەشاردان و ئاشکرابوون، بەکار دەهێنن: لە پاییزی ساڵی 1910دا چەند گەنجێکی تیرەی دەربەندی، لە وەرزی کۆکردنەوەی سەرانە و باجدا خۆیان ئامادە دەکەن بۆ لەناو بردنی عەریف سەقا و زەفتییەکانی تورکی عوسمانی. لە تەنگەبەری ئەو ڕێگەیەی زەفتییەکان هاتووچۆیان پێدا دەکرد، بۆسەیەک بۆ تورکەکان دەنێنەوە. بەڵام پێشتر لە کاتی دارشتنی پلانەکەدا، حەمەی مەولود کە یەکێک دەبێت لەو گەنجە ئازا و سوارچاکانە بە هاوڕێکانی دەڵێت: ئەگەر بریندارێش بوون، بە زمانی خۆمان قسە نەکەن کورە، دواتر دەزانن ئێمەین و ئاشکرا دەبین. بەڵام لە گەرمەی تەقەکردن و لێدانی زەفتییەکاندا یەکێک لە گەنجە سوارچاکەکانی ئومەرگومەت بە زمانی خۆیان قسە دەکات و دەڵێت: ئەرەوەڵا داملەی دایکەکەی گایم. عەریف سەقا بە بریندارێ گوێی لەو قسەیە دەبێت و دەزانێت ئەوانە خەڵکی ئومەرگومەت بوون، چونکە تەنیا ئەوان لەم سنوورە ئاخاوتنیان جیاوازە لە ناوچەکە. بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵا ئومەرگومەتی: لە دەروەندەوە تا ئەیرە. ل: 204-205

هەموو ئەمەش ڕوانگەی ئەو لەسەر شوێن دەگۆڕێت: چەندە لە یادوەرییدا شوێنی ئەزموونکراوی سەرەتا، شوێنی منداڵییەکانی، بەرجەستە دەکاتەوە، ئەوەندەش لە خەیاڵیدا شوێنی هزرکراو، یان خەیاڵلێکراوە، بەرینتر دەبێت. چەندە شێوەزاری خۆی دەشارێتەوە ئەوەندەش لە زمانی سەردەستەی شیعری کوردیی ئەوکاتەدا، بەرجەستە دەبێت.
بەڵام ڕێک لەم گواستنەوە و جێهێشتنەدایە کە پەیوەندیە لۆکاڵییەکان بە شوێنەوە، دەبنە پەیوەندیی بەرین بە جیهانەوە: حاجی ئەستەمبووڵ بچووک و سووک و هیچ دەکاتەوە، تا کوردستان و کۆیێ و دەوروبەری گەورە و بەهادار بکات. چەندە خۆی لە ژێر گووشاری فیزیکی و جەستەیی و دەروونی کولتووری ئەستەمبووڵی عوسمانیدا دەبینێتەوە و بەرگەی نومایشەکانی ئەو کولتوور و سیاسەت و مەراسیمەکانی ناگرێت، ئەوەندەش بە خەیاڵێکی ئازادەوە خەون بە کوردستانێکی ڕزگارکراوەوە دەبینێت و لێیدەبێتە بەهەشت و بچووکترین ئەزموونی هەستەکی خۆی بیر دەکەوێتەوە. وەکئەوەی هیچی لەو دەرد و مەینتیانە بیر نەمابێت کە لە وڵاتی خۆی و لەلایەن خوێشانی خۆیەوە بەسەری هێنرابوو.

## جوگرافیای ئەزموونکراوی حاجی لە کوردستان:

ئێمە لە ئەریستۆتالیسەوە دەزانین، کە شوێنگۆڕکێ، بەشێکە لە جولان کە تیایدا هەم شوێن و هەم کات دەگۆڕێن و ژینگەی نوێ، دەبێتە هۆی گۆڕان لە چۆنایەتی ژیاندا[1]. بەمجۆرەش کولتوور و شوێنگۆڕکێ دەورێکی گرنگییان هەیە لەسەر مرۆڤ و ئەو گۆڕانانەی بەسەر بیرکردنەوەیدا دێن، یان جێگیریان دەکات. مرۆڤ بە جەستەیەوە شوێنگۆڕکێ دەکات و ژیانی ڕۆژانەی ئەزموون دەکات. جەستەش وەک مۆریس مێرلۆپۆنتی دەنووسێت، (هۆی بوونی بوونەوەره لە جیهاندا[2].. جەستە شوناس بە جیهانی دەرەکی دەبەخشێت و جیهانی دەرەکی بۆ ئێمە شیاوی تێگەیشتن دەکات. هەر جوڵەیەک ئەوکاتە دەبێتە بەشێک لە ئاگایی، کە بووبێتە ئاگایی جەستە، واتە ئەو کاتەی جەستە کردبێتی بە بەشێک لە جیهانی خۆی، بەجەستەیی کردبێت)[3]..

---

[1] أرسطو: سماع طبيعی (فيزيک)، ت: محمد حسن لطفی، تهران، طرح نو، 1386 (2007)، ص: 96، (b200، a201).

[2] مورس مرلو بونتی: ظواهرية الادراک. ت: د. فؤاد شاهين. معهد الانماء العربي. بيروت، 1998، ص: 78

[3] Maurice M. Ponty: Kroppens fænomenologi. Det Lille Forlag, København, 1994, s: 92

بەمجۆرەش، پەیوەندیی جەستە و شوێن و شوێنگۆڕکێی جەستە بۆ توێژینەوەکەی من لەسەر ئەزموونی حاجی قادر، گرنگیی تایبەتی خۆی هەیە. چونکە من تەنیا باس لە جوڵە و سەفەر و شوێنگۆڕکێی حاجی قادر بەناو چەند پانتاییەکی جوگرافیدا ناکەم، هێندەی ئەوەی باس لە گەشتی جەستەیەکی ئاگای زیندووش دەکەم، کە لە میانەی گەڕانیدا بەناو کۆلتوور و شوێنە کولتووریە جۆراوجۆرەکاندا. لەلایەکەوە ئەو شوێنانە دەکاتە بەشێک لە ئاگایی خۆی و بەجەستەییان دەکات و لەلایەکیترەوە، وەڕسیی خۆی لە هەندێ شوێن پیشاندەدات تا سنووری دەرهاویشتنە دەرەوەیان لە یادوەریی و جەستەی خۆی.[1].

لێرەشەوە، سەرەتایەک دەستپێدەکەم بۆ دۆزینەوەی پەیوەندیی لە نێوان جەستەی گەشتکەر و ئەو وێستگانەی پێیاندا تێپەڕدەبێت و کاریگەریی نێوانیان، ڕەنگدانەوەی لەسەر بیرکردنەوە و ڕەفتاری ئێمە دادەنێت، چونکە: (*بەهۆی ئەندامەکانی جەستەمانەوەیە*

---

[1] بۆ باسێکی وردتر لەسەر جەستە و ئاگایی لە ڕوانگەی مێرلۆپۆنتییەوە، بڕوانە: ڕێبوار سیوەیلی: پییەر بۆردیۆ و کۆمەڵناسیی فەلسەفی. چ: دووەم، 2013، ل: 272-279. هەروەها: داوید لو برتون: جامعەشناسی بدن. ت: ناصر فکوهی. تهران: نشر ثالث، 1392.

*ئێمە لە ڕەوتی بنیادنانی ژیانی ڕۆژانەماندا، کارگەلێک ئەنجام دەدەین)*[1].

بەمجۆرەش جەستەی ئێمە دەبێتە ناوەندێکی پەیوەندیی و نێتۆرکێک و تۆڕێکی پەیوەندیی لە نێوان شوێن و خودێتیماندا. بۆیە جەستە لە شوێنگۆڕکێی مرۆڤدا چەندە جەستەی بایۆلۆژیانەی ئێمەیە، ئەوەندەش دەبێتە جەستەیەکی کولتووری و شوێنەکان جەستە بەرهەمدەهێننەوە، هەروەکچۆن جەستەش کاریگەریی دەکاتە سەر شوێن. کەواتە شوێن، کاریگەریی دەکاتە سەر چۆنێتی شێوەگرتنی جەستە و پەروەردەبوونی زەینی و ئەم کاریگەرییەش لە بیرکردنەوەکانی مرۆڤدا ڕەنگدەداتەوە. بۆیە دەتوانرێ بگوترێ کولتوور، لەوانەش شوێنە جیاوازە کولتوورییەکان، کاریگەریی دەکەنە سەر سرووشت و ناخی مرۆڤ و دەیگۆڕن. واتە جەستەی ئێمە بەهۆی ئەو شوێنە جیاوازانەی کە ئەزموونیان دەکەین و باڵادەستی ئەو فۆرمە کولتوورییانەی ژیانی ڕۆژانە تیایاندا، کولتووریزە دەبێت[2].

---

[1] دیوید انگلیس: فرهنگ و زندگی روزمره. مترجم: علیرضا مرادی، تهران: انتشارات نیسا، 1391 (2012)ص: 55.

[2] هەمان سەرچاوە، ص: 56 و بەرەودوا.

جەستەی ئێمە شوێن بە دەروونیی دەکات و شوێن لە یادوەریدا نیشتەجێ و تۆمار دەکات. من وەها لە زاراوەی (بەدەروونیکردن)ی شوێن تێدەگەم، کە پرۆسەیەک بێت، مرۆڤ لە ئەنجامی مانەوەی لە شوێنە جیاوازەکاندا و بەپێی تێوەگلانی هەستەکانی لەو ڕووداو و ئەزموونانەی لەو شوێنانەدا بەسەری دێن، بەشێوەیەکی خۆبەخۆ و زۆرجار لە نائاگاییەوە، شوێنەکان و یادوەرییەکانیان دەبنە بەشێک لە ئاگایی جەستە و تیایدا تۆمار دەکرێن، بەجۆرێ هەر کات مرۆڤ دووبارە ئەو شوێنانە و شوێنی هاوشێوە ئەزموون دەکاتەوە، یان لە یادوەریدا دێنەوە، جەستە و هەستەکان بەشێوەیەکی زیندوو، ئامادەیی ئەو شوێنانە بەرجەستە دەکەنەوە و ئەمەش کاریگەریی خۆی لەسەر بیرکردنەوە، ڕەفتار و زمانی بکەری ئەزموونکەر دادەنێت، وەکئەوەی، ئەوەی لە یادوەریدا زیندوو دەبێتەوە، هەمان شتە کە ئەو جاری یەکەم پیایدا تێپەڕ بووە. ئەم هەستپێکردنەوەیە نیشانەی ئەوەیە کە جەستە و هەستەکان شوێنەکان و هەر شتێ پەیوەندیی پێیانەوە هەبێت، وەک دیمەن، بۆن، ڕەنگ، تام، ڕووخسار، شت و هتد، لە خۆیاندا دەهێڵنەوە و تۆماری دەکەن، واتە بە دەروونییدەکەن و لەکاتی دیکەدا دەیژێننەوە. بەمجۆرەش

جەستە لە لاشە و لەش جیا دەبێتەوە: لاشە دۆخیی پانتایی جەستەیەکی بێ هەستە، لە کاتێکدا جەستە دۆخی ژیاندنەوەی هەستەکان و سەوزبوونەوەی یادوەرییەکانە. (ئەوەی کە شوێن بریتیە لە ڕووبەرێکی (هەستپێکراو)، گرنگییەکی تایبەتی بۆ ئێمە هەیە. چونکە هەستکردن بە شوێن، یان ئاوێتەبوونی هەستەکانی مرۆڤ بە شوێنێکی تایبەتەوە، گرنگیی ئەو شوێنە لە بەخشینی (شوناس و ئاسایش و متمانە)دا ئاشکرا دەکات.

ئیدوارد ڕۆڵف لەمبارەیەوە نوسیویەتی: شوێن واتە هەبوونی پنتێکی ئاسایش کە دەکرێ لێوەی تەماشای دنیا بکەین. پەیوەندییەکی بەهێزە کە مرۆڤ لە جێگەی خۆیەوە دەبەستێتەوە بە کۆی شتەکانیترەوە، بەدەستهێنان، یان پەیوەندییەکی ڕۆحیی و دەروونییە بە پنتێکی تایبەتەوە)[1].

بەمجۆرەش جەستەی ئێمە لە شوێنە جیاوازەکاندا شوناسی جیاواز بە خۆیەوە دەگرێت.

بەپێی ئەم شیکردنەوانەیە، کە دەبێت لە پەیوەندیی ئەزموونی حاجی قادر و شوێن، بکۆڵینەوە. بۆیە لێرەدا

---

[1] لەبارەی شوێن و شوناس و مانا کولتوورییەکانی شوێن و بەدەروونیکردنی شوێن، بڕوانە: ڕێبوار سیوەیلی: دیاردەناسیی شوێن و شوناس. (خوێندنەوەیەکی دیاردەناسانە بۆ شاری سلێمانی)، سلێمانی، غەزەلنووس، ل: 85-95.

دەبێت، هەنگاوێکی دیکە بهاوین و بزانین حاجی قادر چۆن ئەزموونی شوێنی لە ماوەی ژیانیدا، لە کوردستان و دەرەوەی کردووە. کوێن ئەو شوێنانەی ئەو تیایاندا ژیاوە و ماوەتەوە و بوونەتە هۆی خەملاندنی بیرۆکە شوێنناسییەکانی و ئەزموونی هەستکردن بە شوێنی لە شیعرەکانیدا بەرجەستە کردوون. ئەی لە کوێدا حاجی قادر هەست بەبێ ماڵیی دەکات و لە شوێن وەڕس دەبێت و چۆن قەرەبووی بێ ماڵیی دەکاتەوە؟ بۆ ئەمەش سەرەتا دەبێت دەورێکی هەندێک لەو تیۆریی و فەلسەفە گرنگانە بدەینەوە، کە ئاسانکاریمان بۆ دەکەن لە تێگەیشتنیماندا بۆ پەیوەندیی نێوان شێون و کەس، یان ماڵ و ناخی مرۆڤ تا وەک بنەمایەک بۆ تێگەیشتن لە پەیوەندیی و تێکچوونی پەیوەندیی حاجی قادر بە شوێنەوە، سوودیان لێوەربگرین.

## یەکەم: (ماڵ)

**دەزانن کە من بێ دار و دیارم**
**سەگی مەجنوونم و غەمخواری لەیلا.** (دیوان، ل: 54).

**جیهان بویتە جەزیرەی بەحری گریەم**

بەبێ بوهتان ئەتۆ زین و ئەمن مەم (دیوان، ل: 82)

"سەعدی ئەبیامی خۆی نەبوو نانی
وەکوو من بوو گەڕۆک و بێ خانی (دیوان، ل: 216)

## ماڵ و کولتوور

حاجی قادریش وەک زۆر شاعیری دیکە، هەندێ شیعری هەیە هەستی خۆی لەسەر بابەتی بچووک بەشێوەیەکی گەورەکراو باس دەکات. ئەم سێ بەیتە هەرسێکیان ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخەن. هەر لە بەیتی یەکەمدا، نیوەی دووەمی بەیتەکە جۆرێک لە دووبارەکردنەوەی هەمان شێوازی تێدایە، کە چۆن شاعیر خۆی بە سەگێک دەچوێنێت و لەبەر دەرگای یار، پیشەی خەمخواردنە و ئەم وێنەیەش وێنەیەکی شیعریی باوی ناو ئەزموونی شیعریی خۆرهەڵاتە.

لەم نزیکخستنەوە و خۆخستنەبرییەدا، جۆرێ لە هەوڵدان هەیە بۆ ئەوەی وەک مەجنوون تەماشای بکرێت، بەڵام نیوەی یەکەمی بەیتەکە هیچ موبالەغەی تێدا نیە. حاجی قادر هەر بە ڕاستیی یەکێک بووە لە مرۆڤە بێ ماڵ و بێ دیار (نیشتیمان)ەکان و ئەم دۆخەیشی لە شیعرەکانیتریدا

بەرجەستە کردووە، کە بۆ ئەو بۆتە دۆخێک لە بوونیدا و سێبەری بەسەر چارەنووسییشدا کردووە. حاجی لەم بەیتەدا، نەک هەر پەیڕەوی لە نەریتێکی شیعریی دەکات، بەڵکو ئەوەش لەسەر بێ ماڵیی خۆی دەیڵێت ڕەنگدانەوەی شێوەژیانێکە، کە ئەو چ لە نیشتیمان و چ لە تاراوگە و ئاوارەییدا ئەزموونی کرد. هەرچەندە حاجی بەشێوە کۆنکرێتیەکە، بێ (ماڵ) و بێ (خانی) و دیار بوو، بەڵام نابێت ئەم دەردەدڵی و شکایەتە لە ژیان، تەنیا وەک ڕەهەندە مادییەکەی تێبگەین. ماڵ بۆ حاجی قادر ڕەهەندێکی مەعنەوی و سێمبوولیشی هەیە. دەنا ئەو هەمیشە لە شوێنێکدا ژیاوە، بەڵام هیچ شوێنێک بە مانا هایدەگەرییەکە شوێنی نیشتەجێبوون و حەوانەوەی بۆ بوونی ئەو نەبووە[1].

وەک مامۆستا جەمال نەبەز، شییکردۆتەوە، لە ئاستی شیکاریی ڕەچەڵەکناسیانەی زمانناسییشدا، وشەی ماڵ لە زمانی کوردیدا، یارمەتیدەری ئێمەیە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی مەبەستەکە: "ماڵ (Mal) ، واتە خانوو

---

[1] بۆ تێگەیشتن لە شوێن لە ڕوانگەی هایدەگەر و ماڵ بە تایبەتی پێشنیار دەکەم، خوێنەر بە وردیی وتارەکەی بخوێنێتەوە: مارتین هایدگر: عمارت سکونت فکرت. لە: مارتین هایدگر: شعر، زبان و اندیشەی رهایی. ت: د. عباس منوچهری، تهران، امتشارات مولی، چ: دوم، 1389 (2010).

(xanu)/خانی (xani). له (ماڵ)ی عەرەبییەوە نەهاتووە. ماڵ لە بنەڕەتدا (mar)ە، کە هەتا ئەوڕۆ لە شێوەزاری هەولێر و دەوروبەریدا بەکار دەبرێ. وشەی ماڵ (mal) لە هەمیار (hemyar)و هەمار (hemar)ەوە هاتووە، کە مانای شوێنی لێدانان و کۆکردنەوەی هەم (هەموو) (hem/hemu) شتوومەکە، کە لە فارسیدا بووە بە (انبارenbar) و لە هێندەک شێوەزاری کوردیدا بووە بە عەمارemar (عەمبارembar) . هەواریش hewar کە لە بنەڕەتدا هەو(ڤ)وار (hew(v)war)ە، واتە (هەڤ) hev (هەموو)، لە خۆیدا کۆدەکاتەوە، لەم ڕەگەوەیە"[1].

بەم پێیەش بێت، وشەی ماڵ چەندین مانای هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بە دوو مەبەست بەکار دێت: مەبەستێک ئەوەیە کە لایەنی ماتەریالّی دەگرێتەوە. ماڵ واتە شوێن، خانوو، فەزای ژیان و ئەو کەلوپەلانەی لەوێدان و کۆی ئەو شت و ئاژەڵ و زەوی و درەخت و شوێنانەی وەک بەشێک لە سامانی خاوەنەکەیان هەژمار دەکرێت. لێرەدا وشەی ماڵ لەگەڵ سامان یەک مانا تەواو

---

[1] د. جەمال نەبەز: وشەنامەکی ئیتیمۆلۆژیای زمانی کوردی، 2008، ل: 213-214 چاپی ئەلیکترۆنی. ئەم کتێبە هاوڕێی بەڕێزم لە خۆرهەڵاتی کوردستان، (ئەنوەر عەرەب) قوتابیی ماستەر لە تەلارسازی زانکۆی ئازادی مەهاباد، بۆی ناردم. بۆخۆشی باسێکی قەشەنگی هەیە لەوبارەیەوە: بڕوانە: انور عرب: *پدیدارشناسی "ماڵ" همچون مکانی برای زیستن.* (نمونه موردی روستای "زاواکیو"). بڵاونەکراوە.

دەکەن و دەبنە ماڵ و سامان. لەم مانایەدا، ماڵ و سامان پێوەریی باڵادەستیی و دەستڕۆیشتوویی مرۆڤە و ئەوەی ماڵ و سامانی زۆر بێت، پێگەی کۆمەڵایەتیشی لە سەرەوەیە.
بەکارهێنانی دووەمیش ڕەهەندێکی مەعنەوی هەیە: ماڵ بە واتای شوێنی ئاسوودەیی و ئاساییش. ئەو شوێنەی کە هی خۆمانە و تایبەتە بە ئێمە و ئەمەش پەیوەندیی هەیە بە ماڵ و منداڵەوە، کە هاوسەریش دەگرێتەوە. واتە پەیوەندیی کەس لەگەڵ کەسەکانیتر و ئەو فەزا هاوبەشەدا کە شوێنی ژیانی هەمیشەییە و کۆماندەکاتەوە. ئەم مانایە هیچ پەیوەندیی بە سامان و ڕەهەندە ماتەریالییەکەی هەبوونی شت و کەلوپەلەکانەوە نیە. مرۆڤ دەتوانێت هەژار بێت و خاوەنماڵیش بێت. هەروەکچۆن دەشگونجێت سامانێکی زۆری هەبێت و وەک ماڵدار حسابی لەسەر نەکرێت. ماڵ لەم مانایەیدا هەواری کۆبوونەوەی گشتەکیە.
ئەوەی لە مرۆکەدا دەستنیشانی پێگەی ماڵ لە ژیانی مرۆڤدا دەکات، ستانداردەکانی ئەندازیارین، کە ماڵ تیایدا بۆ ئامرازێکی بەکارهێنان کە لەسەر شێوەی پیشەسازیی جۆربەجۆر دروستدەکرێت، بچووککراوەتەوە، نەک

شوێنێک بێت کە مرۆڤ بەرهەمی دەهێنێت بەپێی پێوەرە مەعنەوییەکان بۆ نیشتەجێبوون[1].

ئەوماڵەی حاجی قادر گلەیی لە نەبوونی دەکات، بریتی نیە لە ماڵ بەشێوە ئەندازیاریەکەی. بەڵکو ماڵ بۆ ئەو، ڕەهەندێکی مەعنەوی و ڕەمزیی هەیە وەکئەوەی لە شیکردنەوەی مانای شوێنی پیرۆز لەلای مرسیا ئیلیادە بینیمان.

لەلای زۆربەی نەتەوە و میللەتان و لە کولتووری گەلانی جیهاندا، ماڵ پێگە و شوێنێکی گرنگی هەیە. ماڵ بەر لەوەی قەبارەیەکی شێوەیی و میعماریی هەبێت، ڕەنگدانەوەی کولتوور و تێگەیشتنێکە لە بوونی مرۆیی و بە کۆنترین شوێنی دروستکراو بۆ ژیان لە قەڵەم دەدرێت کە تیایدا بوون دەبێتە پێکڤەبوونێکی هەمەکی. ماڵ لەم ڕوانگەیەوە، پێشئەوەی بەرجەستەبوونی قەبارەیەکی شوێنیی بێت لە سەر ڕووبەرێک، ناوەڕۆکێکی کولتووریی هەیە و ڕەنگدانەوەی بۆچوون و تێگەیشتنێکی تایبەتی مرۆڤە لەسەر شوێن. "ئەوەی ئێمە دەکاتە مرۆڤ و جۆرەکانمان پێناسە دەکات، کولتوورە، ئەمەش لە کاتێکدا کە هەر کولتوور بەپێی زمان،

---

[1] ناصر براتی، فرزاد زرین قلم: ملاحظاتی در رابطه با زبان، فرهنگ، ادراک و محیط انسان ساخت. تهران: انتشارات پرهام نقش، 1392، (2010)، ص: 117.

مەزهەب، ڕاهاتن لەسەر خواردنەکان، یاساکان و زۆر ڕەهەندی دیکەی کولتوور، ئەمە لە یەکتر جیا دەکاتەوە"[1] و پۆلێنمان دەکات.
بە هەمان شێوە دەوروبەرە هاوشێوەکانیش بۆیان هەیە کاریگەریی جیاواز بکەنە سەر مرۆڤ، کە ئەمەش پەیوەست دەبێتەوە بەو تایبەتمەندییانەیانەوە کە لە کولتوورەوە وەریانگرتوون. بۆ نمونە ئەندامانی ئەو گرووپانەی لەسەر یەکجێی نیشتەجێبوون (sedentary) ڕاهاتوون و ماڵەکانیان لە ڕیزی یەکەوەیە، لە باڵاخانەی چەند نهۆمیدا ناحەوێنەوە، یەکجێ نیشینی بۆ ئەوان، کە ماڵەکانیان لە ڕیزی یەکەوەیە و بەیەکترەوە چەسپیون، یان مەودایەکیان لە نێوانیاندا هەیە، هەستێکی دڵنیایی زیاتریان دەداتێ وەک لەو هەستەی کە ماڵ لە تەلاری چەند نهۆمیدا بە مرۆڤی دەبەخشێت و هەر نهۆمەی لەوانیتر دابڕاوە. ئەم سرووشتی ژیانی لادێیە لە کوردستاندا، لانیکەم بۆ سەردەمی حاجی قادر. بۆیە یەکجێنشینان هەڵگری تێگەیشتنێکی تایبەتن لە شوێن و لە مانای هاوماڵەتی و هاوسێیەتی، کە هەرچەندەش دووچاری شوێنگۆڕکێ و جێهێشتنی شوێنی یەکەم ببن،

---

[1] اموس راپاپورت: فرهنگ، معماری و طراحی. مترجمان: ماریا برزگر، مجید یوسف نیاپاشا. تهران، انتشارات سلفین. چ: اول، 1391 (2012)، ص: 61

وەک کۆچکردن لە گوندەوە بۆ شار، یان بە زۆر ڕاگواستنیان، یان چوونیان بۆ تاراوگە، دیسانەوە هەوڵدەدەن هەمان ئەو مانا کولتووریانە بە شوێنە تازەکانیان ببەخشنەوە، کە کۆدەکانی ئەو کولتوورەیان لە خۆیاندا هەڵگرتووە. بۆ نمونە کولتووری ڕازاندنەوەی تایبەتی شوێنی حەوانەوە، بە هۆی هێما و سیمبوولە لۆکاڵیی و نەتەوەییەکانەوە. یان درێژەدان بە کولتووری خواردن و مۆزیک و ڕەهەندەکانی دیکەی کولتوور[1].

بۆیە هەندێک لە توێژەران لەو بڕوایەدان "ماڵ شتێکی زیاترە لەوەی تەنیا پەناگایەک بێت بۆ ژیان، هێندەی ئەوەی ڕەهەندێکی مەعنەوی و ئایینی و ڕۆحیی هەبووە

[1] لەمبارەیەوە بڕوانە: ڕێبوار سیوەیلی: دیاردەگەرایی تاراوگە. چاپی یەکەم، 1995، انتشارات باران، سوئد. چاپی دووەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، 2002

و ئەمەش لە هەموو قۆناخەکانی دروستکردن و تا سەقامگیربوون و سوودلێوەرگرتنی، لەبەر چاو گیراوە و ڕەنگیداوەتەوە"[1].



وەک ئامۆس ڕاپاپۆرت دەنووسێت: ماڵپێکەوەنان و ماڵ دروستکردن تەنیا پیشەیەک نەبووە، کە بەهۆیەوە ئەو کەرەستە و ئامرازانە بەکار بێن کە قەبارەیەک لەسەر ڕووبەری زەوی بۆ مانەوەی مرۆڤ هەڵدەچنن، بەڵکو پێش هەموو شتێک ماڵ دروستکردن و دابەشکردنی شوێن و شێوە و ڕێکخستنەکەی، پەیوەندیی هەبووە بە

[1] Rapaport, A: House Form and Culture. Englewood Cliffs: Prentice- Hall Saeed, J. I. (2003). Semantics. 2ed edition, Blackwell Pub. لە ناصر براتي و فرزاد زرين قلم وەرگیراوە:

ناصر براتی، فرزاد زرین قلم: ملاحظاتی در رابطه با زبان، فرهنگ، ادراک و محیط انسان ساخت. تهران: انتشارات پرهام نقش، 1392، (2010)، ص: 116.

تێگەیشتنی مرۆڤ لە جیهان و ژیان و کولتووری خۆی. (کولتوور ڕۆڵێکی کاریگەریی هەبووە لە دروستکردنی ماڵدا، چونکە ئەگەر وا نەبوایە، ئەو هەموو فرەڕەنگییە لە دروستکردنی ماڵەکانی جیهاندا نەدەبوو)[1].

زۆرن ئەو فەیلەسووف و تەلارساز و فەیلەسووفانەی تەلارسازی، باسی ماڵ و گرنگییەکەیان بۆ مرۆڤ کردووە، بەڵام کەم کەسیان وەک هایدەگەر و باشلار، بە قووڵیی و گرنگییەوە باسی ماڵییان وەک شوێنێکی تایبەت بۆ مرۆڤ، کردووە. من لە کتێبی شوێن و شوناس (2015)، بەشوێنپێی هەڵگرتنی بیرۆکەی هۆسرەڵ و هایدەگەر لەبارەی شوێنەوە، هەندێ بیرۆکەی هایدەگەرم لەبارەی شوێن و پەیوەندیی بە شوناسەوە، شییکردۆتەوە. لیرەشدا بەتایبەتی بیروڕاکانی ئەم فەیلەسووفەم لەسەر ماڵ وەک شوێنی نیشتەجێبوون و حەوانەوە بۆ گرنگە و پاشانیش دەچمە سەر شییکردنەوەی بیروڕاکانی باشلار. لەم بەشەدا و بۆ تێگەیشتنی زیاتر و وردترمان لەسەر هەستی شوێن و شوێنناسی حاجی قادر، بیروڕای ئەم دوو فەیلەسووفە یەکجار گرنگە. بەتایبەتی کاتێک دەگەینە شییکردنەوە و

---

[1] Rapaport, A : House Form and Culture, P: 47. 119 براتی: ص:

ڕاڤەی گشتی قەسیدەی (وتم بە بەختی خەواڵوو)، لە بۆچوونە هایدەگەرییەکەیدا.
جەختکردنەوەشم لەسەر هەندێ بۆچوونی باشلار لەسەر ماڵ و بیروڕای هەندێ بیرمەندی دیکە لە بواری تەلارسازیدا، کە ئەوانیش بەشێوەی دیکە ئەم پەیوەندییەیان بۆ ڕوونکردووینەتەوە، هەر لەم ڕوانگەیەوە هاتووە.. باشلار گرنگییەکی تەواوی هەیە بۆ تێگەیشتن لە هەندێ لایەنی پەیوەندیی حاجی قادر و شوێن و لەوانەش ماڵ و هەستکردن بە بێ ماڵی. بەتایبەتی کە باشلار پەیوەندییەکی بێ مەودا لە نێوان ماڵ و نەستی مرۆڤ، یان نائاگایی ئەودا دەبینێت.

## هایدەگەر: نیشتەجێبوون و حەوانەوە:

هایدەگەر لە ساڵی 1951دا بۆ یەکەمجار لەبارەی (دروستکردن نیشتەجێبوون بیرکردنەوە) وتارێکی پێشەکەش کرد و لە ساڵی 1954دا بڵاو کرایەوە[1]. ئەو لە ناونیشانەکەدا و لە دانانی نیشانەی فاریزە لە نێوان وشەکاندا، خۆی پاراست بۆ ئەوەی جەخت بکاتەوە سەر

[1] مارتن هایدگر: شعر، زبان و اندیشەی رهایی. ت: دکتر عباس منوچهری. تهران، انتشارات مولی، چ، دوم، 1389، ص: سی و یک.

یەکێتی و یەکپارچەیی ئەم سێ گوزارەیە[1]. ئەم وتارەی هایدەگەر، خستنەکاری ئەو بیرۆکانەی بوو کە لە وتارێکی دیکەییدا بەناوی (شت)[2] خستبوونیە ڕوو. هایدەگەر لەم وتارەدا دوو پرسیاری سەرەکیی دەکات: یەکەم) نیشتەجێبوون چییە و دووەم) چۆن دروستکردن پەیوەست دەبێتەوە بە نیشتەجێبوونەوە؟ هایدەگەر دەیویست هەردوو کردەی دروستکردن و نیشتەجێبوون وەک دوو ڕەگەزی بێ نێوان بخاتە ڕوو کە یەکتریان داپۆشیوە و ئەمەش لە میانەی ڕووبەڕووبوونەوەی مرۆڤەکان لەگەڵ شتەکان و فەزا (شوێن) و هەوڵدانیان بۆ هەستکردن بە فەزا، گونجانێک دەهێنێتە ئاراوە[3]. بەم پێیەش مرۆڤ لە ئەنجامی ئەو چالاکیانەی لە میانی ژیانی خۆیدا و لە مامەڵەیدا لەگەڵ فەزای دەوروبەری خۆی و چێکردنی شوێنەکانی، لەو پەیوەندیەی نێوان دروستکردن و نیشتەجێبوون تێدەگات.

پەرەگرافی یەکەمی وتارەکە ئاوا دەستپێدەکات:

---

[1] ادم شار: هایدگر برای معماران (تأملی بر سنت معماری مدرن). ترجمە و گرداوری: روزبە احمدی نژاد. تهران: انتشارات: طحان/هلە، 1388، ص: 76

[2] ئەم وتارەش لەم کتێبەدا بلاوکراوەتەوە: مارتن هایدگر: شعر، زبان و اندیشەی رهایی. ت: دکتر عباس منوچهری. تهران، انتشارات مولی، چ، دوم، 1389، ص: 27-51. هایدەگەر وتاری (شت)ی لە ساڵی 1950دا بۆ یەکەمجار پێشکەشکردووە.

[3] ادم شار، پێشوو، ص: 77-78

"وا دێتە پێشچاو کە تەنیا لە ڕێگەی دروستکردنەوە بە نیشتەجێبوون دەگەین. نیشتەجێبوون ئامانج و قەسدی دروستکردن پیشاندەدات، لەگەڵ ئەو جیاوازییەدا کە هەر بینایەیەک بۆ نیشتەجێبوون دروست نەکراوە. پردەکان، هۆڵەکان فڕینی فڕۆکەکان، وەرزشگاکان و وێستگەکانی وزە بینان بەڵام بە جێگەی نیشتەجێبوون ئەژمار ناکرێن. وێستگەی شەمەندەفەر و شاڕێ، بەنداو و بازاڕ بینان، بەڵام شوێنی نیشتەجێبوون نین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بینایانە لە سنووری نیشتەجێبوونی ئێمەدان. ئەو سنوورەش زیاتر لە شوێنی بیناکان دەڕوات و سنووردار ناکرێت بە شوێنی نیشتەجێبوون. شۆفێری لۆری کاتێک بە شاڕێدا لێدەخوڕێت، ئەگەرچی هەست دەکات لە ماڵەوەیە، بەڵام لەوێدا پەناگەیەکی نیە. ئەندازیار لە وێستگەی وزە بۆی هەیە هەستی لە ماڵەوەبوونی هەبێت، وەلێ نیشتەجێی ئەوێ نیە. ئەم بینایانە مرۆڤ لە خۆیان دەگرن، بەڵام شوێنی نیشتەجێبوون نین. ئەو لەوێ دەمێنێتەوە بەڵام ئەوێ شوێنی نیشتەجێبوونی نیە، ئەگەر مانای نیشتەجێبوون بریتی بێت لەوەی ئێمە ماڵێک بۆ پەناگرتن هەڵبژێرین"[1].

---

[1] پەرەگرافەکانی نووسینەکەی هایدەگەرم، لە هەردوو ئەو دەقەوە وەرگرتووە کە لە دوو سەرچاوەکەی پێشوودا ئاماژەم پێکردوون و لێرەبەدواوە ژمارەی لاپەڕەی

به پێچەوانەی زمانی داڕشتنی هایدەگەرەوە، کە هەمیشە ئاڵۆز و قورسە، ئەم نووسینەی لە ڕواڵەتدا ڕوون و ئاشکرایە. هایدەگەر دەیەوێت لە ڕێگەی ئەو نمونانەوە کە هەموویان دروستکراون و بینا و تەلارن و هەمووشیان مرۆڤ لە خۆیان دەگرن، جیاوازیی بکات لە نێوان (دروستکردن نیشتەجێبوون)دا و پەیوەندیی نەپساوی نێوانیان ئاشکرا بکات.. ئەوەی دروستدەکرێت مەرج نیە شوێنی نیشتەجێبوون بێت و هەمان ئەرکی (ماڵ)ی هەبێت کە بۆ مرۆڤ پەناگەیەکە. لەگەڵ ئەوەشدا هایدەگەر جەخت لەسەر ئەو ڕاستییە دەکاتەوە کە دەڵێت ئەم دوانە، (دروستکردن نیشتەجێبوون) لێکدی دانابڕێن، هەموو دروستکردنێک ئامانجی نیشتەجێبوونیشی لەخۆیدا هەڵگرتووە، بۆیە "هەموو نیشتەجێبوونێک یان پەناگرتنێک، ئامانجی گشت دروستکردنێکە، دروستکردن و نیشتەجێبوون وەک ئامراز و ئامانج پێکەوە لە پەیوەندیدان"[1].

هایدەگەر بۆ ئاشکراکردنی ئەو پەیوەندییەی لە نێوان دروستکرن و نیشتەجێبووندا پەنا بۆ ڕەگەزدۆزیی وشەکان لە زمانی ئەڵمانی و (ئینگلیزی) کۆن، دەبات و

---

هەردووکیان دەنووسم: (هایدگر: ص 3-4 ادم شار: ص: 29-30).

[1] هایدگر: ص: 4 ادم شار: ص: 30.

لەوێدا دەیدۆزێتەوە و ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە دروستکردن و نیشتەجێبوون لە بنەمادا هەر هەمانن. "لە ئینگلیزیی کۆن و ئەڵمانیدا وشەی دروستکردن (buan) بەمانای نیشتەجێبوون و مانەوەی لە شوێنێکی تایبەت بەکار دەهات. مانای ڕەسەنی کرداری (bauen) کە ئێستا بەکار نایەت، بریتیە لە نیشتەجێبوون"[1].

نیشتەجێبوون بۆ هایدەگەر پەیوەندیی هەیە بە دۆخی مرۆڤبوونەوە لەسەر زەوی. کاتێک ئێمە دەڵێین (من هەم) و (تۆ هەیت) بەو مانایەیە من نیشتەجێم و تۆش نیشتەجێیت. "ئەو شێوەی بوونەی کە تۆ هەیت و من هەم و دۆخێکی کە ئێمەی مرۆڤ لەسەر زەوی هەین، (Buan) نیشتەجێبوونە[2]. بەڵام نیشتەجێبوون لە خۆیدا چییە؟ هایدەگەر بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەگەڕێتەوە بۆ زمان. وشەی (Wunon) لە ساکسۆنیی کۆندا و وشەی (Wunian)ی گۆتیکی هەمان مانای وشە کۆنەکەی (bauen) بە واتای مانەوە و نیشتەجێبوونیان هەیە. بەڵام وشە گۆتیکیەکە بە شێوەیەکی ڕاشکاوتر پێمان دەڵێت کە ئەم مانەوە و نیشتەجێبوونە چۆن ئەزموون دەکرێت. (Wunian) واتە: کامەرانی، گەیشتن بە ئارامی، لە

---

[1] هایدگر: ص: 5، ادم شار: ص: 30-31

[2] هایدگر: ص: 6، ادم شار: ص: 31

ئاسوودەییدا ژیان[1]. بەمجۆرەش نیشتەجێبوون شێوازیی ئاسوودەژیانی مرۆڤە لەسەر زەوی. هایدەگەر دەنووسێت لە ئەڵمانیدا: "وشەی (friede) بە مانای ئارامی وشەی (das Freie،das Frye ) بە مانای ئازاد و وشەی Fry بە واتای: لە ئەماندابوونە لە هەر جۆرە زیان و هەڕەشەیەک... لەم ڕووەیشەوە نیشتەجێبوون بە مانای کەوتنە ئارامییەوە. واتە پانتایی ئازادیی لە ئارامیی دەروونیدا، هەر شتێک لە سرووشتی خۆیدا دەپارێزێت. تایبەتمەندیی بنەمایی نیشتەجێبوون، کە نیشتەجێبوون لە گشتێتی خۆیدا پەرچ دەکاتەوە، ئاگالێبوون و پارێزگاریکردنە"[2].

(دەلاقەی مینبەری مزگەوتی نومەرگومەت کە بەسەر هەردوو چیای بەرامبەریدا دەڕوانێت)



---

[1] هایدگر: ص: 8-9، ادم شار: ص: 33

[2] هایدگر: ص: 9، ادم شار: ص: 33

نیشتەجێبوون بە واتای جێگیربوون لە شوێندا. بە مانای دروستکردنی فەزایەک بۆ ئارامی و ئاسوودەیی بوون تا خۆمان لە هەر جۆرە زیانێک بپارێزین کە زەوتکەری ئاسوودەیی و ئارامیمان بێت. بۆیە هایدەگەر نووسیویەتی: "پەیوەندیی مرۆڤ لەگەڵ شوێن و لەوێشەوە بە فەزاوە، تایبەتمەندییەکی ڕیشەیی نیشتەجێبوونە. پەیوەندیی مرۆڤ بە فەزاوە، شتێکیتر نیە بێجگە لە نیشتەجێبوون کە بە شێوەیەکی بنەمایی شوێنی بیرکردنەوەیە"[1]. لێرەشەوە، وەک لە وشە کوردییەکەشدا ئەو مانایە دەگەیەنێت: "(نیشتە جێ بوون) تایبەتمەندیی بنەمایی بوونە. تایبەتمەندییەک کە مرۆڤە مەرگینەکان بە شێوەیەکی سازگار لەگەڵیدا دەژین"[2].

بەمجۆرەش، بوون لە *نیشتەجێبووندا* خۆی بەرجەستە دەکات و ئەمەش ئەو شوێنەیە کە ئاسوودەیی و بیرکردنەوە تیایدا دێنە دی.

مرۆڤ بۆ ئەوەی بە ئاسوودەیی بژی و لەوێدا بیر لە ژیانی خۆی بکاتەوە، پێویستی بە نیشتەجێبوونە، بۆیە هەموو هەوڵێکی بۆ دروستکردن و شوێنبەخشین بە فەزا و گەڕانی بۆ دۆزینەوەی شوێنێک کە تیایدا نیشتەجێی

---

[1] هایدگر: ص: 20، ادم شار: ص: 42

[2] هایدگر: ص: 24، ادم شار: ص:

ببێت، گەڕان و هەوڵدانە بۆ ئەوەی ژیان و بوونی خۆی تێدا ئیدارە بکات و بە ئارامیی مەعنەوی خۆی بگات. بەمجۆرەش هەموو نیشتەجێبوونێک نیشانەیەکی ڕۆشن و بەرجەستەی بوونە، بوونێک کە مرۆڤ دەزانێت چارەنووسی تیایدا مەرگە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بیر لە نیشتەجێبوون دەکاتەوە وەک ئەنجامێکی بیرکردنەوەی لە شوێن دروستکردن[1].

کەواتە نیشتەجێبوون و دروستکردن لێکدی جودا نابنەوە، لێرەشەوەیە کە هەموو نیشتەجێبوونێک لە شوێندا، هەوڵدانی مرۆڤە بۆ خۆدۆزینەوە و بەدەستهێنانی شوناسی خۆی لە پەیوەندیدا بە شوێن و مرۆڤ و بوونەوەرەکانیترەوە[2]، دوایئەوەی ئەو مرۆڤە ئەو شوێن و دیاردانە لە ئەزموونکردنی خۆیەوە بە دەروونیدەکات و لە یادوەریدا هەڵیاندەگرێت. هەڵگرتن و پاراستنی ئەو ئەزموونە بەدەروونیکراوانە لەو کاتەدا بۆ مرۆڤ بە سوودن کە لە شوێن و کاتی دیکە و ژێر باری هەلومەرجی دیکەدا، بوون و ژیانی دەکەوێتە

---

[1] ناصر براتی، فرزاد زرین قلم: ملاحظاتی در رابطه زبان، فرهنگ، ادراک و محیط انسان ساخت. بررسی پنج حوزهء معنایی به مثابه متن. تهران: انتشارات پرهام نقش. 1392، ص: 118

[2] سیوەیلی: شوێن و شوناس، 2015، ل: 87

مەترسییەوە و ئەو دەیەوێت بە دووبارە سازدانەوەی بوونی خۆی لەسەر بنەمای ئەو ئەزموونانەی پێشتر بەدەروونیکردوون، لە مەترسی بپارێزێت و ئەو بۆشاییەی کەوتۆتە نێوان بوون و خۆیەوە، بە دووبارە نیشتەجێکردنەوەی خۆی لە یادوەرییدا، پڕ بکاتەوە. ئەمەش ئەو دۆخەیە کە حاجی قادر بە سەختی ئەزموونی کردووە و نەبوونیماڵێک بۆ نیشتەجێبوون و دۆزینەوەی شوناسی خۆی لە پەیوەندیی بە جیهان و بوونەوە، خستویێتیە بەردەم هەڕەشەیەکی بەردەوامی هەستکردن بە بێ ماڵی و بێ نیشتیمانی و وەڕسبوون لەو شوێنانەی کە بوونی ئەویان تێدا بەدەست نایەت و ناتوانێت وەک شوێنێکی ئەمین بۆ بوونی خۆی بیریان لێبکاتەوە. دابڕانی بیرکردنەوە لە شوێن وەک شوێنی دروستکردن بۆ نیشتەجێبوون و لەوێشەوە بوونێک لە ئاسوودەیی و ئازادیدا، لە هزر و بیرکردنەوەی حاجیدا ئەوەندە بەرجەستەیە، هەرکات بیر لە خۆی دەکاتەوە وەک کەسێک و وەک کوردێک، ئەم ڕاستییە وەک دڕکێک لە ڕۆحی هەڵدەچەقێت. ئەو بۆ ئەوەی (ماڵێک/ نیشتیمانێک)، یان ماڵەنیشتیمانێکی هەبێت، ئەزموونێکی ئەوتۆی نیشتەجێبوون شک نابات جگە لەوەی لە یادوەریی خۆیدا هەیەتی. بەڵام ئەم ئەزموونە هەمیشە

ئەو دابڕانە بیر دەخاتەوە کە ئەو لە نێوان بیرکردنەوە و دروستکردنی ماڵ/نیشتیماندا هەستی پێدەکات. بەشێکی دیکەی ئەم کێشەیەی حاجی، لە ڕێگەی گاستۆن باشلار و تێگەیشتنی ئەوەوە بۆ پەیوەندیی نێوان ماڵ و نەستی مرۆڤ، تێدەگەین.

## باشلار: ماڵ و نەست.

بەپێی لێکدانەوەکانی باشلار، نائاگایی ئێمە لە ماڵدا شێوە و ناوەڕۆکی خۆی وەردەگرێت. چونکە (ماڵ پەناگای خەونەکانی ئێمەیە و ماڵ پشتیوانی خەونبینە. ماڵ ئەو توانایە بە مرۆڤ دەبەخشێت لە ئاسوودەییدا خەون ببینێت. هزر و ئەزموون بەتەنیا بەها مرۆییەکان ناپارێزن، بەڵکو بەهاکانی پەیوەست بە خەونبینینەوە، نیشانەی قووڵیی مرۆڤانەن.)[1].

ئاسوودەیی لەو شوێنەوە دەستپێدەکات کە ماڵە. ماڵ لێرەدا هەر جێیەک نیە بۆ حەوانەوەی جەستەیی، بەڵکە پێکهێنەری ئەو کەشەیە کە مرۆڤ تیایدا (ئێستا) و (ڕابردوو) و (داهاتوو)ی دەژی. باشلار دەنووسێت: (پێویستە ئەوە پیشاندەین کە *ماڵ گەورەترین هێزکەلی*

---

[1] گاستون باشلار: بوطيقاى فضا. مترجمان: مريم كمالى و مسعود شيربچه. تهران، انتشارات روشنگران و مطالعات زنان، چ دوم، 1392، ص: 46.

*پێکهێنەری هزر، یادوەری و خەونی مرۆڤە*. ڕابردوو، ئێستا و داهاتوو، بزاڤێکی جۆربەجۆر بە ماڵ دەبەخشن، کە جاروبار ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، گاهێ پێکدادان و گاهێکیش دەبنە بزوێنەری ژیان)[1].



بەمجۆرەش، دوایئەوەی ڕەحمی دایک لە ڕووی بایۆلۆژییەوە چێژی یەکەم شوێنی ئاسوودەیی تێکەڵ بە بوونی مرۆییمان دەکات و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشێوەیەکی نائاگایی بۆ هەمیشە شوێن و جێیە تایبەتییەکانمان لەلا شیرین بێت و عەودالیان بین و خۆمان لەسەر شوێنە ماتەریالی و ڕەمزییەکان بدەین بە کوشت، ئەوە ماڵ، یەکەمین لانکەی ڕاژەندنی بوونی ڕۆحییانەی ئێمەیە: (مرۆڤ پێشئەوەی فڕێ بدرێتە ئەم جیهانەوە، لە بێشکەی ماڵدا دەنوێت. لە خەونبینین و (خەیاڵکردنەوەی ئێمەدا، ماڵ لانکەیەکی گەورەیە. ژیانێکی

---

[1] گاستون باشلار، بوطیقای فضا. پیشوو، ل: 47.

باش لە توێکڵی پارێزگاریدا گەرم دەبێتەوە، لە ئامێزی ماڵدا.)[1].

بەم پێوەرەش، پەیوەندیی ماڵ و مرۆڤ، پەیوەندییەکی بەردەوامانە و هەمیشەییە، پەیوەندییەک نیە لەگەڵ تەمەن و شوێنگۆڕکێ و ئاوارەیی و بێماڵی، بە مانا ڕووتەکەی، کۆتایی پێبێت. ماڵ لە مرۆڤدایە و مرۆڤ لە ماڵدا مرۆڤانەیە و دەبێتە مرۆڤی تەواو. هەربۆیەشە دەسەڵاتە تۆتالیتارییەکان یەکەمین شوێنێک کە خاپووری دەکەن ماڵە. بەعسیش ئەمەی لەگەڵ کورد کرد و بەمەش بووە میراتگرێکی دیکەی ئیمبراتۆییەتەکانی ناو مێژوو، لەوانەش عوسمانی. ڕووخانی ماڵ، بەزۆر گواستنەوەی مرۆڤ و سوتاندنی ماڵ و گوندەکانی[2].



بەڵام ڕاپێچکردنی مرۆڤ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک، کۆچ و

---

[1] گاستۆن باشلار: بوطیقای فضا. هەر ئەوێ، ل: 47.

[2] لەبارەی ئەم پەیوەندیی و ناچارکردن و بەزۆرڕاگواستنانەی مرۆڤ لە دنیای ئێمەدا و چۆنێتی مامەڵەکردنی مرۆڤ لەگەڵ شوێنە بەزۆر بۆ ڕاگوێزراوەکەی و بەرهەمهێنانەوەی شوێن لەلای مرۆڤی بەزۆر ڕاگوێزراوی کورد، بڕوانە ماستەرنامەکەی - د. مراد حکیم محمد، ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ڕاگواستنی کورد لە عێراق ١٩٦٣-٢٠٠٣، سەنتەری لێکۆڵینەوەی ستراتیجی، سلێمانی ، ٢٠٠٥، کە یەکەم توێژینەوەی زانستییە ئەم پەیوەندییەی بەشێوەیەکی ورد شییکردبێتەوە. بەداخەوە پێموابێت لە کاتی گفتوگۆکەدا ئەو بەشەیان (بەزۆر) پێ لابردبوو!

ئاوارەیی، هیچیان پێگە و جێگەی ماڵ لە ناخی مرۆڤ و لە بوونی ئەودا لەق ناکەن. مرۆڤ لە هەر شوێنێک بێت و لە هەر جوگرافیایەکدا ژیان بباتە سەر، لە ناخی خۆیدا ماڵێکی سەرەتایی و هەمیشەیی خۆی هەیە. وەک باشلار دەنووسێت: (ئەو ماڵەی کە تیایدا لەدایک دەبین، لە پشت گشت ئەو بەها باشانەی پارێزگاریکردنەوە، پڕ دەبێت لەو بەها خەون پێوەبینراوانەی تەنانەت پاش جێهێشتنیش، ماڵ وەکخۆی دەمێنێت)[1].



بەمجۆرەش، ماڵ لە شوێنێکی مادییەوە دەبێتە شوێنێکی مەعنەوی و لە یادوەریدا هەمان کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوە و ڕەفتاری مرۆڤ و خەونەکانی هەیە، کە لە ژیانی کردەییدا هەیەتی: (ماڵ، کۆمەڵە خەیاڵێکە، ئەو بەڵگە و وەهمانە بە مرۆڤ دەبەخشێت، کە

[1] گاستون باشلار: بوطیقای فضا. ل: 57

بۆ مانەوە و (بەرگریی و بەردەوامی (ڕ. س)، پێویستی پێیانە. ئێمە لە عەوداڵیماندا بەدوای واقیعەوە، خەیاڵ لەم پنتە دەکەینەوە. دەستنیشانکردنی ئەم خەیاڵاتانە، بریتیە لە وەسفکردنی ڕۆحیی ماڵ، کە بۆخۆی هەر هەمان دەروونشیکاریی ماڵە)[1].

بۆیە باشلاریش وەک هایدەگەر، لەم شیکردنەوە وردەیدا بۆ پەیوەندیی ماڵ و مرۆڤ، یان شوێن و ناخ، کاتێک دێتە سەر دنیای هەنووکە و پەیگریی ئەم پەیوەندییە دەکات، نائومێد دەبێت. لە دنیای هاوچەرخ و مۆدێرندا، کە سەرەتاکانی ئەم دنیایە لەو کاتەوە دەستپێدەکات و شاری ئەندازیاریی و پلانڕێژکراو بەپێی پێوەرە ئابووریی و مادییەکان، پەیدا دەبن. پەیوەندیی مەعنەوی و ناخەکیی مرۆڤیش بە شوێنەوە درزی تێدەکەوێت. ئەوەش دەبێتە ڕێکەوتێک لە ژیانی حاجی قادردا، کە ڕێک لەو سەردەمەدا ئاوارە دەبێت، کە مۆدێرنیتە ڕەنگدانەوەی خۆی لەسەر سیمای شار و پەیوەندیی مرۆڤ بە شوێنەوە جێدەهێڵێت، پاشئەوەی لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا کولتووری کشتوکاڵ و شێوەژیانی سرووشتی، پێگەی خۆی بۆ شێوەژیانی شاری چۆڵ

---

[1] گاستون باشلار: بوطیقای فضا. ل: 58.

دەکات. لە ناوەڕاستی هەمان سەدەدا، هاوسەنگی دانیشتوان تێکدەچێت و زۆرینەی دانیشتوان لە شارەکاندا نیشتەجێ دەبن[1].

لە ژێر کاریگەریی ئەم گۆڕانکارییانەدا بە ناوی پێشکەوتن و مۆدێرنیتەوە، کە هەر زوو پڕپیشکیان لە ڕێگەی ئەدەبیات و (ڕۆمان و جەریدە)وە دەگاتە ئەستەمبووڵ، وڵاتێکی وەک بەریتانیا، لە دوورگەیەکی دوورە دەستەوە دەبێتە ناوەندی ئیمبراتۆرییەتی جیهانی[2]. بێگومان هەر زوو ئەم بزاڤی پێشکەوتنە، کە ڕەگوڕیشەی خۆی لە هزری فەلسەفیی و ئومێدەوارانەی فەیلەسووفە ڕۆشنگەرەکانی وەک ڕۆسۆ و کانت و هیگڵ و مارکسەوە، وەرگرتبوو، بەوەی کە بڕوایان وابوو مێژوو لە بەرەوپێشچووندایە و ئەقڵ جڵەوی ئەم پێشکەوتنە بەرەو ئازادیی مرۆڤ دەکات، کێشەکانیشی دەرکەوتن و نائومێدی وەک بەشێکی دیکەی مۆدێرنیتە خۆی پیشاندا[3].

---

[1] ویسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن. ت: فرناز گنجی و د. محمد باقر اسماعیل پور. تهران، اوند دانش، چ، اول: 1391 (2012)، ص: 22.

[2] هەمان سەرچاوە، ل: 22

[3] لەبارەی چەمکی پێشکەوتن لە فەلسەفەی ڕۆشنگەریدا، بڕوانە سیوەیلی: *"پێشزەمینەکانی سەرهەڵدانی بزاڤی فەلسەفەی ڕۆشنگەریی لە ئەوروپا"*. لە گۆڤاری برایەتی. ژ. 25. پاییزی 2002، هەولێر

لە وڵاتێکی وەک بەریتانیا و لە سایەی گواستنەوە لە شێوەژیانی کشتوکاڵییەوە بۆ پیشەسازی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا ڕوویدا، هێشتا ئەو سەدەیە کۆتایی پێنەهاتبوو، کە پەیوەندیی وڵاتەکە لەگەڵ ئەو میللەتانەی لە دوورییەوە دەژیان، بووە پەیوەندییەکی پڕ کێشە و ئاڵۆز، ئەگەر نەگوترێ دوژمنانە. شاری لەندەن هەروەک مالکولم برادبری دەنووسێت: نەک هەر (بە شێوەیەکی بەرجەستە بووە سیمای شارە گەورەکەی مۆدێرنیتە)[1]، بەڵکو بووە شارە ستەمکارەکەی کۆلۆنیاڵیزمیش کە گۆڕانێکی گەورەی لە پەیوەندیی مرۆڤ و شوێندا بەدیهێنا. بۆیە لەم پەیوەندییەدا ڕۆڵێکی ستەمکارانەی بینی نەک هەر بەسەر شارانی تری ئەو وڵاتەوە، بەڵکو بووە سیمبوول و پایتەختی ستەمکاری بەسەر وڵاتانی دوورەدەستیشەوە.

ئەمەش هاوکاتە بە سەرهەڵدانی ئیمپریالیزم و کۆلۆنیاڵیزم، کە پریشکی ئەم گۆڕان و پێشکەوتنە، پاشتر بەر وڵاتی حاجی قادریش دەکەوێت و لە ئاستیدا ناڕەزایەتیش دەردەبڕێت:

لە بەغدا بۆچی خورما بێت و لەیموون

[1] ویسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن، پێشوو، ل: 23.

له بۆ دەرمان لە شار بێ ڕۆنی زەیتوون
لە دەوری کوللی باغی شاری کۆیێ
دووسەد بن داری زەیتوونی بە جۆیێ
(دیوان، ل: 254)

یان بۆ ڕەواندنەوەی بچووکی دنیا لە خەیاڵدانی کوردیدا و متمانەگێڕانەوە بۆ هەستی کورد لە ئاست ئەو وێنایەی لەسەر جیهان بۆی دروستبووە، لەو ڕێگەیەشەوە بچووک پیشاندانی دوو پنتی داگیرکاریی کوردستان، کە تاران و ئەستەمبووڵن: حاجی بەشێوەیەکی ڕەتکەرەوانە دەنووسێت:

یەکتان نەچوونە گەردش وا تێدەگەن لە دنیا
هەر پادشاهی ڕۆمە و شاهی عەجەم لە تاران
(دیوان، ل: 97)

حاجی لەو بارودۆخەدا ئاوارەی شوێن و وڵاتێک دەبێت کە لە مێژە بۆ لاساییکردنەوە و خۆگونجاندن لەگەڵ دنیای نوێ، دەوڵەتی عوسمانی دەستیکردووە بە پرۆسەی (تەنزیمات)[1]. پرۆسەیەک نەک تەنیا چاکسازیی

---

[1] بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە گرنگیی سەردەمی تەنزیمات، لە ناوخۆی سیستەمی ئیداریی و دەسەڵاتی عوسمانیدا، کە پێش چوونی حاجی قادر بۆ ئەستەمبوول دەستیپێکردبوو و ئەنجامەکانیشی لە ماوەی مانەوەی حاجی قادردا بەباشی دەردەکەوتن، بڕوانە: پۆل دۆمۆن: سەردەمی تەنزیمات (1839–1878). وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵڵا، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم: 2008،

دەکرد لە پەیوەندییەکانی مرۆڤ و دەسەڵات و پەروەردە و بەڕێوەبردنی سیستەمی سوڵتانیدا، بەڵکو دەستکارییەکی ڕیشەیی شارێکی وەک ئەستەمبووڵیشی دەکرد، کە حاجی تیایدا دەژیا[1]. لێرەوە، حاجی کە بە ئومێدی زانست و پێشکەوتنەوە خەونی خۆی لەسەر شوێن، (نیشتیمان) هەڵدەچنی و دەبینی و خەیاڵی بە ئازادییەوە لە ڕێگەی زانستەوە لێدەدا، ئەوەشی دەبینی کەچۆن سیستەمی داگیرکاری عوسمانی بۆخۆی لە پەلەقاژەدایە تا بەهۆی دەستگرتن بە هەمان زانست و پێشکەوتنەوە، هەم خۆی لە کێشە ناوخۆییەکانی بپارێزێت و لاسایی ئەوروپا بکاتەوە، هەم زانست و پێشکەوتنیش بکاتە ئامرازێک بۆ چەوساندنەوە و ژێردەستەییکردنی زیاتری میللەتانی ژێر چەپۆکی خۆی. لێرەوەیە کە لەو هەڵوێستە دووفاقییەی حاجی لە ئاست دنیای (پێشکەوتوو، زانست و نووسین و جەریدە و ڕۆمان)، لەلایەکەوە و لەم کاتانەشدا دەستگرتنی بە ڕەوتێکی هزریی ئایینی و نەریتگەراییەوە، لەولای

---

بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندیی بە شارەکان و ئەستەمبوولەوە هەیە لە لاپەڕەکانی 78-85.

[1] لەبەشێکی دیکەدا باسی ئەوە دەکەین کە چ گۆڕانکارییەک لەسەردەمی ئاوارەیی حاجی قادر لە ئەستەمبووڵدا ڕوویداوە، کە پێمانوایە، دەبوو لە ئەزموونی شیعرییدا ڕەنگبداتەوە.

دیکەوە، تێدەگەین. حاجی قادر، بەشێکی زۆری ئەم ئازار و بیرۆکانە، لە شێوەی (قسەیەکم هەیە) ئاراستەی خەڵکی شار و لادێی وڵاتی خۆی دەکات و وەکئەوەی بیەوێ لە ڕێگەی ئەو قسەیەوە بڵێت: نابێ ئێمەش بەو دەردە بچین. هەڵوێستی حاجی لەم دەقەیدا ڕوونکەرەوانە و لە ئەزموونەوەیە، ئەزموونیش ئەنجامی ژیانێکە، بۆیە حاجی دەستپێشخەری دەکات لەوەی کە وەرگر، بە گەمەی تێنەگات:

(قسەیێکم هەیە دەیکەم مەڵێ بێ تەجرەبەیە
باوجوودی ئەوی نادانە لەلای وەک گەمەیە
موقتەزای ئاب و هەوای خاکی دیاری ڕۆمە
ئەهلی سوتاوی مەیە، بەستەیی ئاوازی نەیە
حاکمی ڕێگری مەعموورەیە، قازیی دزی ڕۆژ
وزەرا و وکەلای گورگە، ڕەعییەت گەلەیە
سالیکی ڕیخە ئەگەر شێخە ئەگەر مێخە، لەوێ
شێخە هەر کامێ نەدا تا دەمرێ هەر دەدەیە
زانی و شاریب و لۆتی دەگرن، والی دەڵێ:
بەری دەن پارەیی خۆی دایە، چ عەیبێکی هەیە
هێندە بێگانە لە ئیسلامن و ئەحبابی فەرەنگ
موتتەقی دێوە لەلایان، موتەشەڕڕیع شەوەیە
زوڵمیان عامە لەسەر عاممە، ڕەعییەت فەوتا

**تۆ مەکە مەنعی عەوامیل، کە خەتای گای بنەیە**
**هەر لە شا تا بە گەدا تووشی یەکێکی نابی**
**لێی بپرسی بە حەقیقەت بڵێ: جەددم ئەمەیە**
**لازمە ئەم غەزەلە وەک غەزەلێ بیکەنە بەر**
**هەر وەکوو "حاجی" ئەگەر شارە، وەگەر دیهکەدەیە)،**
(دیوان، ل: 146-147)

دەمەوێت کەمێک لە نەگوتراوەکانی ئەم دەقە ڕامێنین:
کۆی دەقەکە هەوڵدانێکی وردە بۆ بە دراماتیککردن و بە دۆزەخکردنی شاری ئەستەمبووڵ و پیشاندانی حاکمان وەک زاڵم و گەندەڵ و خەڵک و عاممەش وەک ستەملێکراو. لە ڕووی ئەخلاقییەوە، هەڵوێستی حاجی لە ئاست ئەم دوو بەرەیەدا دووپات دەکاتەوە: ڕەخنە لە ئەویان و پشتگیریی لەمیان. هەموو ئەمەش وەک نامەیەک ئاراستەی خەڵکی شار و لادێی کوردستان دەکات.
(قسە) دەبێتە سەرەتای شیعرەکە، کە دەبێت بکرێت. فۆرمێکی دەربڕینی زمانی بە وشە و دەنگ خۆی بەرجەستە دەکات. قسەیەک لە دڵدایە و لە بیرکردنەوەدایە و دەبێت بکرێت و ماتەریاڵیزە ببێت. قسەکەش لە خۆڕا نەهاتووە و لە (تەجرەبە)وەیە.

قسەکەر لە تەجرەبەوە، لە ئەزموونی سۆبژەکتیڤانەی خۆیەوە قسەیەک دەکات، بۆ ئەوانەی (دانا)ن، دەزانن ئەمە بە واتای چی بەڵام ئەوانەی (نادان)ن بە گەمە و گاڵتەی لێکدەدەنەوە. ڕووی حاجی لە لادێیی و شارییە وەک لە دوا بەیتیدا هاتووە. حاجی دەیەوێت ئەزموونێکی تایبەتی خۆی بگشتێنێت، کە ئەمە پێچەوانەی ئەزموونە و ئەزموون هەمیشە ئەزموونی تایبەتە. بەڵگەی ئەزموونەکەی قسەکەیەتی کە دەیکات.

ڕوانگەیەکی ژینگەناسی دەبێتە دەستپێک: کاریگەریی ژینگە و دەوروبەر ڕەنگدانەوەی لەسەر ڕەفتار و بیرکردنەوەکانی مرۆڤ هەیە. ژینگە بۆتە هۆکاری ئەم واقیعە و ئەو جۆرە مرۆڤەی بەرهەمهێناوە! بەو پێیەش ژینگە و ئاو و هەوای دیاری ڕۆم، یان ئەستەمبووڵ وا دەخوازێت دانیشتوانەکەی (ئەهل)، بە مەی و خۆشگوزەرانی و بەستە و ئاواز ژیان ببەنە سەر. ئەمەش لە ڕوانگەی حاجییەوە، تۆنێکی سووک دەداتە ئەو ژیانەی لەوێ دەکرێت و ئەو بەچاوی کەم و نزم لێیدەڕوانێت.

ئەم تێڕوانینە لە هەمان کاتیشدا ڕەتکردنەوەی مۆدێرنیزەبوونێکی لاساییکەرەوانە و ڕواڵەتییە کە پاساوی واقیعێکی تاڵ و ستەمکارانە ناداتەوە. پاشان

یەکبەیەک پشتەملی کۆمەڵێک کەس و خاوەن پێگە دەگرێت و ڕیسوایان دەکات. سەرەتا لە حاکمەوە دەستپێدەکات و بە ڕێگریی ئاوەدانی (مەعمورە)ی ناو دەبات. دژایەتی حاجی بۆ دەستەی حاکمان شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراوە، چونکە ئەو هەرگیز نەیتوانیوە بۆ یەک چرکەش بێت، قینات بەخۆی بکات ددانی خێر بە عوسمانیەکاندا بنێت. بەڵام حاجی لە کاتێک و سەردەمێکدا ئەم حاکمانە بە ڕێگری مەعمورە ناو دەبات، کە بڕیاری پرۆسەی تەنزیمات بۆ چاکسازیی و مۆدێرنەکردنی وڵات، بە تایبەتی شاری ئەستەمبووڵ لە لوتکەی خۆیدایە. ئەم بڕیارە کۆتایی سییەکانەوە، واتە پێش سیی و چەند ساڵ بەر لە چوونی حاجی قادر دەستپێکردووە و لەسەردەمی ئەودا (دوای 1864)، بەرهەمەکانی بە تەواوی بەرجەستەبوون و هەر ئەم حاکمانە و چەندان کەسیتریش بەڕێوەیان بردووە[1].

دەستەی دووەم کە حاجی هێرشیان دەکاتە سەر، قازییەکانن. پێشتریش لە شیعری دیکەیدا هێرشی توندی کردۆتە سەر کاراکتەریی و قازی و بە (ماکەر گێ)ی ناوبردووە:

---

[1] بڕوانە: دۆمۆن: سەردەمی تەنزیمات. ل: 82-83

خۆت حاکمی ئەم مەسئەلەیە کەی دەبێ وا بێ
پیری وەکوو تۆ "ماهی" هەبێ و ماکەری گا بێ
(دیوان، ل: 162)

لە پاڵ ئەمانیشدا (وەزیر و دادوەرەکان (وکەلا) بە گورگ دەچوێنێت. دوایئەوەش دێتە سەر شێخەکان و بە سالیکی (ڕیخ و بدە) ناویان دەبات. شێخەکان بەوەدا لە حاکمان و قازی و وەزیر و دادوەرەکان جیا دەکرێنەوە، کە دەستەیەکن ڕاستەوخۆ لە ناو سیستەمی دەسەڵاتدا نین. بۆیە لە هەرەمییەتی پێداهاتنەخوارەوە سووککەرانەکەی حاجیدا بۆ پەیکەری سیستەمەکە، ئەمان دێنە ڕیزی خوارەوە. پاشان نۆرەی (والی) دێت و بە کەسێکی (ڕیشوەخۆر) ناوی دەبات و بەمەش دەچێتەوە ناو ڕەخنە لە پێکهێنەرانی سیستەمەکە.

لەدوای ئەمە دژوازییە هەمیشەییەکەی حاجی خۆی بەرجەستە دەکاتەوە. حاجی کە لە چەندین شوێن هەر بەهۆی بە نوێنەرکردنی چین و توێژەکانی وەک شێخ و مەلا و دەروێش و والی، هێرشی کردۆتە سەر ئەو فۆرمە ئایینداریيەی بۆخۆی لێی وەڕس بووە، لێرەدا بە دوو بەڵگە عوسمانییەکان لە دژی ئیسلام تاوانبار دەکات، کە بۆخۆی لە هەردووکیاندا هاوبەش و شەریکە! بەڵگەی یەکەم ئەوەیە ئەمانە (*بێگانە لە ئیسلامن*) و بەڵگەی

دووەمیش ئەوەیە کە (*ئەحبابی فەرەنگن*). بۆیە موتتەقی (لە خواترس) لەلایان بۆتە دێو و پەیڕەوکاری شەرع (موتەشەڕڕیع)، بۆتە مۆتەکە. حاجی بۆخۆی لە چەندین شوێنی شیعرەکانیدا، لەلایەکەوە هێرش دەکاتە سەر ئەو دەستە و تاقمانەی لە کۆمەڵگادا نوێنەرایەتی ئیسلام دەکەن لەوێشەوە ڕەخنە لە دینەکە خۆی دەگرێت، لەلایەکیشەوە وەسفی فەرەنگ و ئەورووپا دەکات و پێشکەوتنەکەیان بە (ئیعجاز)ی پێغەمبەرانە دادەنێت:

**ئەی خەریکی ڕمووز و ڕاز و نیاز**

**ئەورووپا فەننی گەیوەتە ئیعجاز**

(دیوان، ل: 189)

لێرەدا ڕێک پێچەوانەی کردۆتەوە، چۆتە سەنگەریی ئایینەکەوە و هێرش دەکاتە سەر عوسمانیەکان لەبەر ئەوەی لاسایی ئەرووپا بەکەنەوە، لە کاتێکدا بۆخۆی هەمیشە داوای لە کورد دەکرد، پشت بکەنە شێخەکان و ڕێگای زانست و خوێندن بگرنە بەر کە دەستکەوتی فەرەنگن. ئەم هەڵوێستە فەندەمەنتاڵیستیە لە شیعری حاجیدا کەمە، بەڵام هەیە.

ئەو وێنەیەی حاجی لەم دەقەدا لەسەر سیستەمی عوسمانی بۆ کورد دەیکێشێت، بەڵام حاجی دەیەوێت وەک وێنەکێشانی واقیعی شاری ئەستەمبووڵ بیخاتە

ڕوو، لەوەدا کورت دەبێتەوە کە هەموو ئەم کەمایەسی و گەندەڵییە خەتای (گای بنەیە)، واتە سوڵتانی عوسمانی لەسەرەوەی هەرەمەکە. کە چەقی دەسەڵاتە. گای بنە خۆی لە کاتی گێرەکردندا دەکەوێتە نێوان گایەکانی ترەوە، بۆیە زۆر هێواشتر دەجووڵێت، هێزی ئەو لە زۆر جوڵانیدا نیە، بەڵکو لەوەدایە کە ئەوانیتر بەدەوریدا دەسووڕێنەوە.

هەرچەندە وێناکردنەکەی حاجی بۆ سیستەمی عوسمانی و بەچەقکردنی سوڵتان لە شێوەی گای بنە تیایدا، وێناکردنێکە لە زیهنییەتێکی کشتوکاڵییەوە هاتووە، بەڵام لە پێکانی مەبەستەکەیدا و تەواوکردنی ڕەخنە لە کۆی سیستەمەکە، جوانکارییەکی دەگمەن هەیە. لە بەیتی پێش کۆتاییدا، حاجی ئەمانە بە بێ *ئەسڵ و فەسڵ* ناو دەبات و بە بیژیی یان زۆڵ، دەیانداتە قەڵەم: هیچیان ناتوانن بڵێن ئێمە کێ باپیرمانە، کە ڕەهەندێکی سایکۆلۆژیی و دەروونیی حاجی لەبەرامبەر عوسمانیەکاندا ئاشکرا دەکات. بەڵام جەختکردنەوەی حاجیش لەسەر نەسەب و تەبارناسی و ڕەچەڵەکدۆزیی، لە ڕۆشنبیرییەکی عەرەبیی ئیسلامییەوە هاتووە.

کێشەی ئەم پەیامە، کە حاجی فەرزی دەکات: خەڵکی شار و دێی کوردستان بیکەنە بەر بۆ لێوەفێربوون لە چیدایە؟

پەیامی ناو دەقەکە لەگەڵ ئەو واقیعەی باسی دەکات لانیکەم لە ڕووی مێژووییەوە، وێک نایەتەوە. حاجی لە شارێکی زۆر پێشکەوتووی سەردەمی خۆیدایە و ئەو باسی شارەکە ناکات و باسی دەستەوتاقمگەلێک دەکات. سڕینەوەی شوێنایەتی شارەکە و لەبیربردنەوەی، بەڵام زەقکردنەوەی هەندێک دەموچاو وەکئەوەی ئەوانە گوزارش بن لە شوێنەکە، ناکۆک و بریخستنێکی ناڕاستە. خستنەڕووی قسەیەک کە بەرەنجامی ئەزموونێکی تایبەت و کەسیی بێت، بە نیازی گشتاندنی بەسەر شاری و لادێیدا، ناکۆک دێتەوە لەگەڵ لۆژیکی ئەزموون. بۆیە پێدەچێت چەند شتێک لەمەدا کاریگەرییان هەبێت:

یەکەم) ئەو چین و توێژانەی حاجی وەک ڕەمزی دەسەڵاتی عوسمانی و دژە ئیسلام ڕیزیان دەکات، هەر هەمان ئەوانەن کە لە کوردستانیش ئەو لێیان وەڕس بوو. ئەو بە وێناکردنی کوردستانەوە لە ئەستەمبووڵیش ڕەخنە لە هەمان ئەو دەستە و تاقمانە دەگرێت. ئەمەش ئەوە دەر دەخات کە ئەزموونەکەی حاجی پێشینەیە، نەک ئەزموونێکی نوێ لە ئەستەمبووڵ. حاجی وێنای

کوردستانیانەی هەمان ئەم دەستەوتاقمانە بەسەر هاوشێوەکانیاندا لە ئەستەمبووڵ دەسەپێنێت.

دووەم) یا دەبێت حاجی ئەم شیعرەپەیامەی لەسەرەتای چوونیدا بۆ ئەستەمبووڵ نووسیبێت، کە هێشتا هیچ شارەزایی و ئەزموونێکی ئەوتۆی لە شارەکەدا نیە و شارەکەی نەناسیوە. یان ئەوەتا بە پشتگوێخستنی ئەزموونی نوێی لەو شارەدا، درێژە بە هەڵوێستە پێشینەکانی خۆی لەسەر عوسمانیەکان دەدات.

لەگەڵ ئەم دژوازییانەشدا، هێزی شیعرەکە لەوەدایە کە حاجی سەرەتا تێگەیشتنێکی زانستیانە و ژینگەناسی و کاریگەریی دەوروبەری ژیانەکی دەکاتە پێوەر بۆ پیشاندانی چۆنایەتی کۆمەڵگا. پاشان وێنایەکی هەرەمیانەی سیستەمی دەسەڵاتی عوسمانی دەکێشێت و خودی سوڵتان دەکاتە چەقی کەموکوڕییەکان و تێگەیشتنێکی شیکاریانە لە سیتەمی عوسمانی دەخاتە ڕوو. ئاشکرای دەکات حاجی لە مانای ئاوەدانی تێگەیشتووە و بەرگریی لە (مەعموورە) دەکات لە بەرامبەر (کەلاوە) و وێرانەدا. لەوە تێگەیشتووە کە ئەرکی وەزیر و وەکیل چییە بۆیە ڕەخنە لە کەموکوڕییەکانیان دەگرێت. ئەمەش ئەوە ڕووندەکاتەوە

کە حاجی ڕۆشنبیرییەکی سیاسی و دەوڵەتدارییانەی هەبووە.

ئەم زەینییەتە ڕەخنەییە بۆ ئێمە گرنگیی حاجی یەکجار دەباتە سەرەوە. ڕەخنەیەک کە کۆمەڵگا وەک یەکەیەکی سەرجەمگیر دەبینێت و ناتەواوییەکان لە پەیوەندیی نێوان بەشەکانی سیسەتەمەکەدا دەبینێت، نەک بە جیا. پێگە و ئەرکی دەوڵەت و بەرپرسەکانیشی لە ئاست کۆمەڵگادا باش دەزانێت و هەر لەبەر ئەوەش ڕەخنەی توندیان لێدەگرێت. پاشان ئەوەش گرنگە کە حاجی لە پەیامەکەیدا ناوی (شار) و (دێ) دەهێنێت و وەک دوو شوێنی جیا تەماشایان دەکات، بەبێ ئەوەی مافی وەرگرتنی پەیام و زانیارییەکانی بە نایەکسانی لە نێوان خەڵکی شار و لادێدا دابەش بکات و یەکێکیان بە گرنگتر لەویتر بزانێت، ئەمەش ئەوە دەخاتە ڕووی حاجی لە مرۆڤ: (هاووڵاتیە) نەک چین و دەستەیەکی تایبەت. هەموو ئەمانەش کەرەستەی شییکردنەوەی نوێن لەسەر حاجی قادر.

با بگەڕێینەوە سەر شییکردنەوەکەی باشلار، لەو خاڵەدا کە چۆن مۆدێرنیتە دەستکاری پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شوێنی کرد و پەیوەندیی بە گۆڕانێکەوەیە، کە حاجی قادر تیایدا ئەزموونی ئاوارەیی خۆی تەی دەکرد، باشلار پێیوایە ئیدی پەیوەندییە ڕۆحیی و مەعنەوییەکەی مرۆڤ

بە شوێن وماڵەوە، لە پچڕاندایە و چیتر ماڵ شوێنێک نیە کە تیایدا بە ئاسوودەیی بگات. ژیان لە جیاتی ئەوەی پەیوەندییەکی مەعنەویی مرۆڤ بێت لەگەڵ شوێن و دەوروبەر، لەسایەی ئەو گۆڕانەدا دەبێتە پەیوەندییەک، کە تیایدا مرۆڤ ڕۆدەچێت بەرەو قوڵایی گۆڕە هەندەسییەکەی خۆی. لەم پەیوەندییەدا، ماڵ ڕەگوڕیشەی خۆی بە زەوییەوە لەدەستدەدات و پەیوەندیشی بە ئاسمانەوە لە هەڵکشان و بەرزبوونەوەی ڕووت و هەندەسیانەدا کورتدەبێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ فەزیلەتێک بە بوونی مرۆڤ ببەخشێت[1].

ئەم گۆڕانە لە پەیوەندیی مرۆڤ بە شوێن و لەدەستدانی فەزای ژیانەوە، کە حاجی لە شێوەی سەرەتاییەکەی خۆیدا لە ئەستەمبووڵ ئەزموونی دەکرد، بۆ ئەو تەواو بەرجەستە و دەردەدار بووە. لەلایەکەوە شوێنی یەکەمی خۆی لە دەستداوە و لەلایەکیتریشەوە، بێ شوێنی و ئاوارەیی بوونی ئەوی خستۆتە مەترسییەوە. بۆیە بە ڕوونی لە ئەزموونی شیعریی حاجیدا، کە ئاشکراکەری ئەزموونی ژیانێتی لە نێوان دوو بەرداشدا، بەتەواوی هەست بەو مەترسییە دەکەین:

---

[1] گاستون باشلار: بوطیقای قضا. پێشووتر، ص: 68-69.

سەوادی ئەعزەمی "قوستەنتەنییە"
گەلێ بێ ناوی کردە سەدری ئەعزەم
بە دەستوور و بە قانوون و نیزامی
خودا وایکرد کە سووری کرد بە ماتەم
(دیوان، ل: 83)

ڕۆمی وەکوو بەنی موون کەس پشتیان پێ نەبەستێ
کەوتوونە داوی خۆیان، سەرگەشتە ماون و حەیران.
(دیوان، ل: 96)

لە ڕۆما گەر مەتاعێ بێ تەماعی
بە خۆڕایی بدەن هێشتا گرانە
(دیوان، ل: 136)

وەک لەم نمونانەدا دەردەکەوێت، حاجی ئەو ژینگەیە کە لە ئەستەمبووڵ تیایدا ژیاوە و سەردەمی وردە وردە مۆدێرنبوونی ئەو شارەیە، وەک بەشێک لەلاساییکردنەوەی عوسمانییەکان بۆ ئەورووپا و دنیای ئەوسا پێشکەوتوو، ڕەتدەکاتەوە. سیمبوولەکانی ئەم پێشکەوتن و گۆڕانە وەکئەوەی حاجی لە سیمای ڕۆمیدا دەیبینێت، بریتین لە (دەستوور و قانوون و نیزام) و لە شیعرەکەیشیدا (قسەیەکم هەیە) ئەم نمونانە فراوانتر

دەکات بە گەڕانەوەی بۆ ئاکاری باوی کۆمەڵێک توێژ و دەستەی سیاسی و کۆمەلایەتی و دەیانکاتە نمونەی دزێو تا میللەتی خۆی چاویان لێنەکات و بۆی نەبنە پێشنموونە.

حاجی بەشێوەیەکی گشتی لەڕێگەی ڕەتکردنەوەی شێوازی ژیانی (ڕۆمییانە- ئەستەمبوولیانە)وە، لاساییکردنەوەی ئەوانیش بۆ ئەوروپا ڕەتدەکاتەوە و ئەو شێوەژیانە بە ئالۆز و پڕ گرێ دەبینێت کە چۆن بۆتە هۆکاری سەرلێتێکچوون و بوون بە داو و سەرگەشتەیی بۆ ڕۆمییەکان هێناوە. بۆیە ئەوەی لە ڕۆما هەر شتێکی خۆش و چێژبەخشت بە خۆڕاییش بتدەنێ هێشتا هەر گرانە. چونکە هەمووشتێک پێچەوانە بۆتەوە و ژیانی مادیی بەسەر ژیانی ڕۆحیی و مەعنەویدا بالادەستە و ژیان وەک دوکانێکی سەودا و مامەڵەی لیهاتووە و چاکە و خراپە پێوەر نین:

"ئەبوو زەڕڕ" مالیکی دنیایە لێرە
ئەوی "غازی" هەیە ساحێب "قرانە"
ئەگەر توججاری حاجی پارە بێنە
مەتاعە نیک و بەد، دنیا دووکانە

(دیوان، ل: 136).

پاشان حاجی، وەرگر، یان خوینەر و ئێمە سەر پشک دەکات لەوەی بۆ داهاتووی خۆمان، وەک کورد، کامیان هەڵدەبژێرین:

**لە بۆ عوقبا بزانە کام بە کەڵ دێ**

**ئەتۆ موختاری ئێستا لەم میانە**

(دیوان، ل: 136)

بێگومان لە (موختارکردنی تاک)دا وەکئەوەی حاجی گوزراشی لێکردووە، باوەڕهێنانێکی ڕاشکاو بە مۆدێرنیتە و دەرچوون لە نەریتی ئایینی باو، کە مرۆڤ (ئیجبار) دەکات، هەیە. بەڵام دواجار ئەوەی لای حاجی سەررشتەیە، گەڕانەوەیە بۆ فۆرمە تەقلیدیەکە و ناکۆکە هەمیشەییەکەی هزر. هەموو ئەمانە سەرەتای ئەو هەستکردنەی حاجییە بە دابڕان و پارچەپارچەبوونی جیهانی نوێ و مۆدێرن لە دەرکەوتە ئەستەمبووڵییەکەیدا، کە چیتر لە ڕوانگەی حاجییەوە مرۆڤ ناتوانێت وەک شوێنێکی پیرۆز و وەک چەقی جیهان ئەزموونی بکات و پیرۆزیی خۆی لەدەستداوە. ئەستەمبووڵ بۆ حاجی، مرۆڤایەتی بەرەو پنتێکی سەرەکیی و پیرۆز ئاراستە ناکات و نمونەی پارچەپارچەیی جیهانی مۆدێرنە، نمونەی بە جەهەننەمبوونی جیهان و سەرەتاکانی بێ شوێنی و دوایین هەوڵدانەکانی مرۆڤێکی وەک حاجییە بۆ

بەرهەمهێنانەوەی نیشتیمان و شوێنی ڕاستەقینە لە زمان و خەیاڵ و یادوەریدا.

پەیوەندیی حاجی و شوێن، یان ماڵ لێرەدا کۆتایی پێنایەت:

وشەکانی پەیوەست بە ماڵ و بێ ماڵی، وەک شوێنی یەکەم، لە شیعری حاجیدا کەم نین، چ بە مانای ماڵ، یان هەر مانایەکی دیکەی مەجازی وەک بیرخستنەوەی ماڵ بەکاری هێنابن: (*دار، دەر، کونج، خانە، بێ خانە، کولبە، ماڵ، خانی، بێ خانی*)، بەڵام بەهیچ شێوەیەک ئەم وشانە ناچنە چوارچێوەی پەیوەندییەکی قووڵی حاجییەوە بە ماڵ وەک شوێنێکی تایبەت. ئەم وشانە لەوە کەمتر و ڕەهەندی مەعنەوییان لەوە لاوازترن، کە بتوانین لە ڕێگەیانەوە ئەزموونی حاجی لە ماڵدا بەرهەمبێنینەوە. ئەم وشانە لە شیعری حاجیدا، نەک هەر تەنیا ئاماژە و وەسفی ماڵ وەک شوێنی حەوانەوە و ئاسایشی دەروونی نین، بەڵکو بەکارهێنانیشیان لە چوارچێوەیەکی لاوازی پەیوەستبوونەوەدان بە ماڵ:

(کوت کوت و تیکە بە تیکەم بکەن و بمدەنە سەگ
جێگەمە لەم بەر دەرە ناڕۆم بە جنێو و بە کوتەک)

(دیوان، ل: 76)

(ئەی بێ نەزیر و هەمتا هەر تۆی کە بەرقەراری

بێ دار و بێ دیاری، بێدار و پایەداری)

(دیوان، ل: 150)

(لە شەوقی شەمعی ڕوخساری لە بیمی تەعنی ئەغیاری
لە کولبەی سینەیی ناری دەستووتێ دڵ بە بێدەنگی)

(دیوان،، ل: 155)

(یەعنی هەر ماڵێ کرابێ بۆ خودا
کەعبەیی عەلیایە بۆ زیکر و دوعا)

(دیوان، ل: 203)

(وەسەتی پانی پازدە ڕۆژ ڕێیە
پڕ لە ڕەشماڵ و خانە و دێیە)

(دیوان، ل: 211)

لە ئەنجامی وردبوونەوە لە دیوانەکەی حاجی و بە شیکردنەوەیەکی خێرای ئەم نمونانەی ناوهێنانی ماڵ، وەک شوێنێکی تایبەت، لە ئەزموونی شیعری حاجیدا، بە تەواوی ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە، کە بوونی ماڵ وەک یەکەم شوێن لە ژیانی حاجیدا بەگشتی نادیارە و هیچ هەستێک، یادەوەرییەک و ئەزموونێک لەم شیعرانەدا نیە، کە بەڵگە بێت لەسەر پەیوەندیی حاجی بە ماڵەوە، کە وەک زۆربەی شوێنناسان جەختی لەسەر دەکەنەوە، گرنگییەکی تایبەتی هەیە لە پێکهاتە و شوناسی تاکەکەسدا. (ماڵ کۆڵەکەی شوناسی ئێمە وەک تاکەکەس و ئەندامی کۆمەڵگایە و شوێنێکە بۆ نیشتەجێبوون)،

هەروەها: (ماڵ لە مانا قووڵەکەی خۆیدا هەستێکی پابەندبوونە بە ژینگەیەکی تایبەت، کە ئەگەر تەواوی ئەو چەمکانەی سەروکاریان لەگەڵ شوێن هەیە، (لەگەڵ ماڵدا)، بەراووردییان بکەین، گرنگییەکی ئەوتۆیان نیە. ماڵ پنتی دەستپێکردنی جوڵەیەکە بۆ دەستبەسەراگرتنی جیهان.)[1]

بەمجۆرەش ئەوەی لە یەکەم وێستگەی هەستیاری ژیانی حاجیدا دەبینرێت، ونبوونی ماڵ و ئەو ڕووداوانەیە کە بوونی ماڵ، وەک پنتێکی سەرەتا بۆ دەستبەسەراگرتنی جیهان، بەرجەستە دەکەن.

لەم ڕووەوە، ئەزموونی حاجی لە سەرەتای دەسپێکردنی ژیانیدا، چەمکی ماڵ، شوێنی تایبەت لە حاجی دەستێنیتەوە و ڕووداوەکانی وەک مردنی باوک، داییک و گەورەبوون لە ماڵی ئەوانیتر و پاشان ژیان لەناو مزگەوت و حوجرە و شوێنگۆڕکێی حاجی لە شوێنە جیاوازەکانەوە بۆ شوێنی دیکە، ئەمە وێڕای کێشە کۆمەڵایەتی و جیاوازییە هزرییەکان لەگەڵ کەسانیتر و پێگەی بەرزی حاجی لە کۆمەڵگای سەردەمی خۆیدا بە هۆی زیرەکی و خۆسەپاندنەکەیەوە، هەم پاڵنەری ئەوەن

---

[1] ادوارد رولف، مكان و بى مكانى، ص: 52، 53.

حاجی کوردستان جێبهێڵێت و هەم بە مانایەک سەندنەوەی ئاساییش و هەستی قووڵی ئەون بە شوێنەوە. هەموو ئەمانە، حاجی دەخەنە پێگەیەکی ئەوتۆوە، کە لە شوێنە نوێیەکەی، وەڕس و بێزار ببێت، کە بۆخۆی سەرەتایەکە بۆ گەڕان بە دوای شوێندا، لە نۆستالیژیا و دووبارە بەرهەمهێنانەوەی لە خەیاڵ و زماندا.

نۆستالیژیا، یان دەردی دووری:

لێرەدا پێویستە ئەوە بە یاد بهێنمەوە، وشەی نۆستالیژیا، یان هەستی غەریبی لە شیعری حاجیدا زۆر بەهێزە، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندیی هەیە بە بیرکردنەوەی زۆر لە ماڵ چ وەک شوێن و چ وەک سیمبوولی ئارامی و ئاسوودەیی.

ئەم وشەیە (Nostalgia) یەکەمجار لە ساڵی 1678، بەهۆی قوتابیەکی بواری پزیشکی لە سویسرا، کەناوی (یۆهانس هۆفەر) بوو، بۆ وەسفکردنی نەخۆشییەک بەکار هات، کە نیشانەکانی ئەو نەخۆشییە، بریتیبوون لە (بێخەوی، بێ

ئیشتیایی، دڵەخورپە، تا و بەتایبەتیش بیرکردنەوەی زۆر لە ماڵ)[1].

چەمکی نۆستالیژیا، لە دوو وشەی یۆنانییەوە دروستکراوە، وشەی (nostos) کە بەمانای گەڕانەوە بۆ شوێن، وەک (ماڵ)، و وشەی (algia) کە بە مانای ڕەنج و ئازارچەشتن دێت[2]. سەرجەمی ماناکەی دەبێتە: ئازاری دووری، یان دەردی غوربەت.

بەمجۆرەش، نۆستالیژیا هەستێکی خەمبارانەیە لە ئاست شوێن و لە هەمان کاتدا دڵخۆشبوونێکی دەردمەندانەیە بەو شت و کەس و شوێنانەی ڕابردوو، کە تاکەکەس پەیوەندییەکی قووڵی لەگەڵیاندا هەبووە و ئێستە لێیانەوە دوورە. ئەمەش سۆزێکی گەرمە لەئاست ڕابردوودا. کەسی نۆستالیژیک لە ڕێگەی یادکردنەوە و قسەکردنی زۆرەوە لەبارەی ڕابردووەوە بەشێوەکی خەمبارانە، بەدوای گێڕانەوەی خۆشی و چێژێکەوەیە، کە لە باسکردنی ئەو شوێن و کەس و شتانەوە هەستیپێدەکات. ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا کە ئەو بۆشاییە لە بوونی

---

[1] ادوارد رلف: مكان و بی مكانی، ص: 55.

[2]ttp://www.etymonline.com/index.php?allowed_in_frame=0&search=nostalgia

خۆیدا پڕ بکاتەوە، کە تیایدا دەژی و لە ئەنجامی دووریی و غەریبوەتەنییەوە تێیکەوتووە.

لە ڕابردوودا توێژەران، نۆستالیژیایان وەک دۆخێکی نەخۆشیی نیگەتیڤ تەماشا دەکرد، بەڵام هێدی هێدی ئەم تێگەیشتنە چوارچێوەیەکی پۆزەتیڤی بەخۆیەوە گرت و نۆستالیژیا وەک دۆخێک دەبینرا، کە مرۆڤی دوورە نیشتیمان پێویستی پێیەتی بۆ ئەوەی بتوانێت ڕابردوو ببەستێتەوە بە ئێستاوە و لەم ڕێگەیەشەوە، مانا بە ژیانی هەنووکەیی خۆی ببەخشێت، ئەمە جگە لەوەی توانای ئەوەی بداتێ ڕووبەڕووی ترسی هەستکردن بە مەرگ ببێتەوە[1]. نۆستالیژیا پڕکەرەوەی درزێکی قووڵە لە کەسایەتی و شوناسی تاکەکەسدا بە هۆی بیرکردنەوەو قسەکردن لەبارەی ڕابردووەوە وەک فەزایەک کە شوێن و کەس و شتەکان و یادگارییەکانیان لەخۆی دەگرێت.

ئەم هەستە و ئەم دۆخە لە شیعری حاجی قادردا بە زۆری دەبینرێت. حاجی بۆخۆی وشەی نۆستالیژیا بە وشەی (*دەردی دووری*) ناودەبات و لەوەش گەیشتووە کە ئەم دەردە جگە لە *سەبووری و دڵدانەوە*، شتێکی دیکەی لێبەرهەم نایەت، حاجی نوسیویەتی:

---

[1] http://www.southampton.ac.uk/nostalgia/

به سەد قەید و حەواشی *دەردی دووری*
بەیانی ناکرێ غەیرەز سەبووری
(دیوان، ل: 245).

حاجی قادر لە گەڕانەوەیدا بۆ ڕابردوو هەمیشە شوێن، چ شوێنی سرووشتی، چ شوێنی کۆمەڵایەتی و چ شوێنە کولتوورییەکان و شوێنی خودی و تایبەت، بەسەر دەکاتەوە و ناوی کەسان و ئەو جێگایانە دەهێنێت، کە بۆ ئەو پڕکەرەوەی ئەو بۆشاییەن کە لە ژیانیی غەریبیدا تێیکەوتووە. لەناو ئەو شتانەشدا، شوێن، گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە و چێژێکی تایبەت دەداتە حاجی و عیزەتی نەفس و لە خۆڕازیبوون و متمانەی بەخۆبوونی بەهێز دەکەن. جگە لە قەسیدە *بەهارییەکەی* (دیوان، ل: 38–47)، کە سەراپا نۆستالیژیای شوێن و دیمەنە سرووشتییەکان تیایدا باڵادەستە، هەروەها قەسیدەی (*لە مەیدانی بەهارا*، ل: 247–252) کە وەسفی نۆستالیژیانەی شاری کۆیێ یە، دەقەکەشی بە ناوی (*وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی*، ل: 252–257) و کە دەچێتە خانەی نۆستالیژیای کەسانەوە، چەند نمونەیەکی دیکەش لە شیعرەکانی دیکەیەوە، ئەمەمان زیاتر بۆ ڕووندەکاتەوە.

حاجی لەم نمونانەدا، کوردستان و خاکی کۆیێ و شوێنەکانی دەوروبەری لە مانا جوگرافیاکەیان ڕووتدەکاتەوە و مانایەکی نۆستالیژیکیان بەبەردا دەکات و جارێک دەیانباتە ئاستی ئەفسانە و پیرۆزیی و بەهەشتەوە و جارێکیش بە جۆرێک ئایدیالیزەیان دەکات، کە نمونەیان نەبێت. هەندێ جاریش هەستی نۆستالیژیانەی حاجی ئەوەندە بەهێزە کە دووریی لە کوردستان و کۆیێ، سەرجەم گۆی زەویی، یان: (ئەرز)ی لێدەکاتە (زیندان) و زۆر جارانیش شیوەنیان بۆ دەگێڕێت، ئەمە جگە لەوەی بڕێک جارانیش بەراووردیان دەکات بە شوێنگەلێکی بە ناوبانگ کە بۆخۆی نەیبینوون، بەڵام لە جوانی و پێگەدا ناوبانگیان هەیە، ئەمەش لە پێناوی ئەوەدا کە فەزڵی شوێنە نۆستالیژییەکان و بەدەروونیبوو و بە جەستەیبووەکانی خۆی لە یادوەریدا، بدات بەسەر شوێنە ئەفسانەیی و مێژووییەکاندا و شوێنەکانی کوردستان بەرز بکاتەوە بۆ سەر ئاستی ئەو شوێنانە:

**لە غوربەت بە شاهی لەبیر ناکرێ**

**زەمانی جوانی و یادی وڵات.**

(دیوان، ل: 60)

لەم بەیتەدا ئەوەی خستۆتە ڕوو، کە مرۆڤ لە غوربەت ببێتە (پادشا)ش، ناتوانێت سەردەمی گەنجی کە هەمان یادی جارانی وڵاتە، لە بیر بکات. کەواتە هەم پاشایەکی خەمبار و هەم ئەوەش کە ئێستاکێ پیر بووە و لە دوورە وڵاتیە لە شعرەکەدا هەیە، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە دوورە وڵاتی ئەگەر مانایەکی هەبێت ئەوەیە کە مرۆڤ لێوەی یادی وڵات دەکاتەوە. ئەمەش نۆستالیژیایە..

هەر لێرە هەتا دەشتی بەهەشت ئایینی لاجان
ئاهێستە بڕۆ نەک وەکو دێوانەیی هەرزە

غەریبی غوربەتی کردم بە ئەوتان
سەراپا ئەرزی لێ کردوومە زیندان
(دیوان، ل: 240).
کە چووینە (سینگوڕە) سینەم گڕی بەست
وەکو (قەندیل)ی سەرگەردان، وەکو مەست
(دیوان، 244)

لە خۆم ئاگر هەڵێنم وەک (چنارۆک)
لە چاوم گریە دەربێ وەک (حەمامۆک)

بە سەد قەید و حەواشی *دەردی دووری*

بەیانی ناکرێ غەیرەز سەبووری

(دیوان، ل: 245)

لەم نموونانەدا شوێنەکانی ڕابردوو ناوەڕۆکیی نۆستالیژیانەی هزری حاجی پێکدەهێنن و دەیەوێت بە یادکردنەوە و ناوهێنانیان، ئێستای خۆی کە دوورە وڵاتییە، پڕبکاتەوە لەمانا بۆ بوونی خۆی.

## گۆڕقەرەج (هەوار)

لە ڕۆژی (10ی 2016/5) و پاشتریش چەند جارێک، سەردانی گۆڕقەرەج و گوندەکانی دەوروبەری و ئەو شوێنانەم کردووە کە حاجی قادر باسیانی کردووە، تەنانەت سەردانی مەزارگەی ئومەرگومەت و گۆڕستانەکەشمان کرد[1]. بۆ شوێنپێهەڵگرتنی ئەو شوێنانەی حاجی قادر لە شیعرەکانیدا ناویان دەبات، بە پێویستیم زانی ڕووپێوێکی مەیدانی زۆربەی ئەو شوێنانە بکەم و تەنانەت سەردانی گۆڕی گریمانەکراوی فاتمەخانی دایکی حاجیشم کرد[2].

---

[1] سەردانەکانی من و تیمێکی دۆکیۆمەنتاری لە کەناڵی کوردستان 24وە، بە مەبەستی بەرهەمهێنانی فیلمێکی دۆکیۆمەنتاریی بوو لەسەر ئەزموونی حاجی قادری کۆیی. ئەم فیلمە وەک کارێکی هاوبەشی ئەکادیمیای کوردی و ئەو کەناڵە پێشکەش دەکرێت. بۆ ئەو مەبەستەش چەند جارێک لە مانگی 5ی 2016داو لە ڕۆژانی: (10، 12 و 2016/5/16)دا و پاشانیش لە خزمەت هونەرمەندی کورد (مامۆستا عەدنان کەریم)، لە ڕۆژی 2016/6/17داچومەتەوە کۆی ئەو شوێنانەی بەپێی دیوانەکە، حاجی ناوی هێناون.

[2] لەبارەی دڵنیاییم لەوەی ئەو گۆڕە گۆڕی فاتمەخانی دایکی حاجی قادر بێت، هیچ بەڵگەیەکی نووسراو لەسەر گۆڕەکەی نیە، جگە لە گێڕانەوە زارەکییەکان. ئەوەندە نەبێت کە کێلێکی بچووک لە ژێر چەند درەختێکی لوولپێچدایە کە شێوەی سەماکردنی بە درەختەکە داوە و ئەوەی لێدەخوێندرێتەوە کە ئەم درەختانە لە پەیوەندیی بە پێشینەی بیروڕای دەربەندییەکانەوە، مانا و گرنگیی خۆی هەبێت. درەختەکان لە بنەتیروو دەچن بەڵام وەک دەرەختە کێوییەکانی کوردستان، بڵند و بەردار نین. گۆرستانەکە کۆن و تایبەتە بە تیرەی دەربەندی و شوێنی گۆڕە گریمانەکراوەکەی دایکی حاجی دەکەوێتە پنتێکی بەرچاوەوە.

بەپێی گێڕانەوەی مێژوونووسان و ژیاننامەنووسانی حاجی قادر، ئەم شاعیرە لە گوندی (گۆڕقەرەج)، لە ڕۆژئاوای شاری کۆیێ، ساڵی 1815 لەدایکبووە[1].

(وێنەی گۆڕقەرەج لە کتێبەکەی م. عەبدولستار تاهیر شەریف وەرگیراوە)



لە دەستنیشانکردنی ساڵەکەدا زۆربەیان کۆک نین، بەڵام بە دەگمەن نەبێت، لە پەنجەنوماکردنی شوێنی لەدایکبوونیدا کۆکن و ئەوەش گوندی گۆڕقەرەجە[2].

---

[1] بڕوانە: نوسراوەکانی ڕەفیق حیلمی، عەلادین سەجادی، مەسعود محەمەد، مارف خەزنەدار و ...

[2] بۆ نمونە: کەریم شارەزا لە کتێبی: (کۆیە و شاعیرانی)دا، (1961)، ل: 20، دەنووسێت حاجی لە کۆیە لە دایکبووە.

بەمجۆرەش یەکەم شوێن کە حاجی ئەزموونی کردبێت، گۆڕقەرەج و دەوروبەریەتی، کە بە هیچ شێوەیەکیش لە شیعرەکانیدا ناوی نەهێناوە.



ونبوونی گۆڕقەرەچ لە یادوەریی شیعریی حاجی قادردا، بەمانای ئەوە نیە ژینگەی گۆڕقەرەج و دەوروبەری دیار نەبێت. شوێنی ئەم هەوارە و هەوارەکانی دراوسێی لەسەر چۆمێک، کە ئیستا وشک بووە و سەرچاوەی ئاوەکەی کانییەبەهارە و ئاوی ئەشکەوتەکانی بەردەمییەتی، بەلای چەپدا هەڵکەوتوون.

لەبنار لوتکەی (تەکەڵتوو) کە وەک بەرزترین چیای بەردەم گوندی گۆڕقەرەچ خۆی دەنوێنێت و لە چاڵایی گوندەکەوە دیار نیە، چەند ئەشکەوتێک هەن، کە لە کۆندا

بۆ حەوانەوەی ئاژەڵداری و ژیانی خاوەنەکانیان بەکار هاتوون[1].

(لوتکەی چیای تەکەڵتوو)



ئەم ئەشکەوتانە و کانیاوەکانی ژێر و لایانەوە، سەرچاوە ئەو چۆمە بوون کە بە دۆڵێکی پێچاوپێچدا دەڕواتە

[1] وەکئەوەی لە زاری (لالە ئەحمەد سمێڵی ئۆمەرگومەت) بیستم، تەنیا لە سنووری گۆڕقەرەج ئەم شاخانە هەڵکەوتوون کە هەموویان ئەشکەوتیان تێدایە و ئەو ئەشکەوتانە شوێنێکی گرنگی خۆپاراستن و ئاژەڵداری تیرەی دەربەندی بوون. لەبەر هێرشی بێگانە و سوپای بەعس لەم دواییەدا، ئەوانە ئەو ئەشکەوتانەیان بەکار هێناون بۆ مانەوە. کاتێکیش دابەزیونەتە خوارەوە بۆ ناو دەشتایی دۆڵ و زەوییەکانیان، تەنیا قوخەڵ و (کۆتان)یان، لە شێوەی هەواردا دروستکردووە و پێشتریش سوودیان لە ڕەشماڵ وەرگرتووە، کە حاجی قادریش باسیکردووە. ناوی شاخەکان و ئەشکەوتەکانیان لە سنووری گۆڕقەرەج: (شاخی کەوردینان، شاخی جولەکە، شاخی کەورعەلا، شاخی بزن لەڕێ. شاخی کەورکوز، شاخی خدر میرەم، شاخی بزنەل، شاخی شیرۆزەن).

خوارەوە تا دەگاتەوە بە ڕووباری کۆیێ. لەناو ئەو دۆڵەدا و لە گوێی ڕووبارەکە چەندین شوێنەواری قۆخەڵ و وێرانەی ماڵ و کۆتان و گوندی بچووک بەدی دەکرێن، کە هەموویان لەبەری نسێ دروستکراون و دەکەونە چاڵاییەوە لە گوێی ڕووبارەکە و بە گردۆڵکە دەوریان گیراوە.

شوێنی گۆڕقەرەج هیچ جێگەیەکی ئاوەدانی تێدا نەماوە. گوندەکە کە لە کاتی خۆیدا هاوینە هەوارێک بووە بۆ ژیان و ئاژەڵداریی هەندێ بنەماڵەی تیرەی دەربەندی، کە حاجی قادریش سەر بە یەکێک لەو بنەماڵانەیە.

وشەی گۆڕقەرەج لە بنەڕەتدا لێکدراوە وەک باسدەکرێت لە (گۆڕی قنج)ەوە هاتووە. (قنج، یان قنجە) ناوی کوڕێکی هەرزەکار و خۆشەویستی خەڵک بووە و لەو شوێنە مردووە و بەخاک سپێردراوە[1]. بۆیە ناوەکە لە ڕێڕەوی کاتدا، لە گۆڕی قنجەوە بۆتە گۆڕقەرەج. ئەگەر وشەی گۆڕ بکەینە بنەما، پەیوەندییەکی ئەم گۆڕی قنجەیە بە

---

[1] لە زمانی لالە ئەحمەد و ئیدریس عەبدوولاوە لە رۆژی (2016/5/16)، لە گوندی ئومەر گومەت.

شوێنەکەوە هەیە، چونکە بەرامبەر شوێنەواری گوندەکە گۆڕستانێک هەیە تایبەت بووە بە گۆڕی منداڵان[1].

هەڵبژاردنی ئەو شوێنە کە چاڵاییە، بۆ حەوانەوە، جێی پرسیارە و زیاتر لە شوێنی خۆشاردنەوە دەچێت نەک حەوانەوە..

بەپێی نەریتی کوردەواری شوێنی گوند، لە چیاکاندا، دەکەوێتە بەرزایی و بنارەکانەوە. ئەم گوندە لە چاڵاییدایە و لەلای ڕاستەوە نەبێت، ئاسۆی نیگا ئازادە، لە هەموو لایەکانیترەوە ڕێگری سرووشتیی لە شێوەی تەپۆڵکە و بەرزاییدا بەری چاو دەگرێت. شوێنی گوندەکە و ماڵ و خانووەکانی، بۆتە سەوزایی و چڕڵستانێکی زۆر، بەڵام بەردەمی گوندەکە و لێواری ڕووبارەکەی چەند درەختێکی تێدا ماون و ئەمەش نیشانەی ئاوەدانی شوێنەکە بووە. ئەو چڕڵ و بێشەڵانەی لە شوێنی گوندەکە هەستاوە، نیشانەی ئەوەیە کە خاکی ئەو شوێنە بەپیت و پێشتر جێگەی ئاژەڵداری بووەو بەهۆی پەیین و پاشەڕۆی ئاژەڵانەوە، زەوییەکەی بەپیت بووە..

---

[1] پێشدەچێت، ناوەکە هەر لە بنەمادا گۆڕی قەرەچ بووبێت و بوونی گۆڕستانەکە کەوتبێتە پێش نیشتەجێبوونی تیرەی دەربەندی لەو ناوچەیە، ئەم ئەگەرە هەرچەندە ڕاستییەکی تێدایە، بەڵام توانای سەلماندنی ئەستەمە، چونکە بەڵگەیەک نیە لەسەر ئەوەی، ئەو مەڵبەندەی ئەم تیرەی دەربەندیە تیایدا حەواونەتەوە، پێشتر ئاوەدانیی بووبێت، مەگەر ئەو هۆستایانەی کە ساڵانە گەرمیان و کوێستان و وڵاتبڕیان دەکرد..

دەراوی گوندەکە لە لای سەرەوە، بەردەڵان و لە پشتییەوە و لە باکور و بەردەمییەوە، گردۆڵکەی بەرزن. لە ڕووبەڕووی گوندەکە بەرزاییەک هەیە کە پاشماوەی گۆڕستانێکی بچکۆلەیە بەو پێیەی درێژیی گۆڕەکان زۆر نیە و کێلەکانیشیان بڵند نین. زۆر کەمن ئەو گوندانەی هێندە گۆڕستان لە نزیکیانەوە بێت. ناشزانم لە بنەما و لە شوێنی سەرەکیی خۆیان، لە بەشی ڕۆژهەڵاتی کوردستان، پێش ئەوەی دەربەدەر بکرێن، ئەم دەربەندییانە گۆڕستانی منداڵەکانیان لە کوێی شوێنی ژیان و حەوانەوەیانەوە، بووە. بەڵام نزیکی گۆڕستانی منداڵان لە شوێنی حەوانەوەیان لە کوردستانی ئەمدیودا، ڕاستیەکمان پێدەڵێت: پێدەچێت ئەمەش پەیوەندیی بە بیروڕای سۆزداریی دەربەندییەکان و ژیانی کۆمەڵایەتیانەوە، هەبێت. ئەوان گۆڕی گەورە ساڵانیان لە شوێنی حەوانەوە جیا کردۆتەوە، بەڵام منداڵانیان لە نزیکترین شوێنی گوندەوە ناشتوون..

ڕەنگە هۆکاری ئەمە کەمکردنەوەی ئەو ئازارەی ژنان و دایکانی جەرگ سووتاو بێت تاکو بە نزیکییان گۆڕستانی منداڵەکانیان و لەبەرچاوبوونی گۆڕەکانیان، دڵنەواییەکی زیاتریان پێببڕێت، بەتایبەتی کە ئەوانە زۆرجار لە هەوار و گوند و کوخەکاندا لەگەڵ منداڵان و بەتەنیا ماونەتەوە.

هەموو ئەمەش وەک قەرەبووکرنەوەی ئەو هەموو گیان لەدەستدان و دەربەدەرییە بێت کە ئەوانە لە کۆڕەوە ناچارییەکەیاندا بەسەریان هاتووە. بەمجۆرەش، نزیکی و لەبەرچاوبوونی گۆڕستانەکەی منداڵان، میکانیزمێکی بەرگریی ئەوان بووبێت بۆ بەردەوام ئامادەیی بەخشینەوە بە منداڵەکانیان لە ژیانی خۆیاندا.

گۆڕقەرەج بەبەراورد بە گوندی چیایی و ئاسایی لە کوردستاندا، چەندین جیاوازیی هەیە. لەوەدا کە ڕووبارێک بەبەردەمی گوندەکەدا دەڕوات و کارێز و کانیاوگەلێک لە پشت و لای چەپی گوندەکەوە، لە بەرزایی هەبوون و هەن، شوێنەکە لە شوێنی گوندێکی نەریتیی کوردستان دەچێت، بەڵام بەوەدا کە گوندەکە پشتی لە خۆرەتاوی بەیانیان و نسێیە و کەوتۆتە چاڵاییەوە و زەوی بەراو لەبەردەمیدا کەمن، لە گوندی تەقلیدیی کوردستان ناچێت.

بەشێوەکی باو، لە ناوچە شاخاوییەکان گوندەکان



دەکەونە بنار و سەرووی چیاکان و ڕوو لە ڕۆژ، بەڵام لە دەشتاییەکاندا گوند بەکراوەیی دروستکراوە. شوێنی

گۆڕقەرەج پتر لە شوێنی خۆ حەشاردان دەچێت، تا حەوانەوە، هەرچەندە تەپۆڵکەکانی هەر چواردەوری، ئەو دڵنیاییە بە مرۆڤ دەبەخشن، کە شوێنێک بووە توانیویەتی پارێزگاریی لە دەستدرێژیی خەڵکی نەیار بکات. هەر قووڵلەیەک و تەپۆڵکەیەک وەکئەوەی سەنگەرێکی چاودێریی بێت، کە گوندەکەی لەبەردەمدایە و دەشرِوانێتە ئەو شوێنانەی لە گوندەکەوە نەدیون. کۆی ئەو گوند و ئاوەدانیەش کە تیرەی دەربەندی پێکیان هێناوە، دەکەوێتە ئەمبەر ڕووباری کۆیێ و زێی بچووکەوە، ئەمەش ئەوەمان زیاتر بۆ ڕووندەکاتەوە کە بۆچی ئەوان شوێنی چاڵایی و دۆڵ و ئەشکەوتیان بۆ حەوانەوە هەڵبژاردووە. وەکئەوە سنووری ئاویی بۆ ئەوان وەک ڕێگرێک وابووبێت لە ئاست دوژمندا.

هەر وەک گوتم، لە پشت ئاواییەکەوە شوێنی کارێز و کانی بەدیی دەکرێت. بەو بەریشییەوە لە بەرزایی، زەوی و کانیاو هەن. بە گشتی شوێنی گوندەکە دەکەوێتە دۆڵێکەوە، کە بەرفراوانە و دەوڵەمەندە بە گژ و گیاو گووڵ و درەختی ژاڵە و چەندین ڕووەک و پنجی گیای جۆربەجۆر. بەڵام داری بەردار و دارە کێوییەکان بەدەگمەن بەدی دەکرێن. حاجییش بە دەگمەن باسی دار و جۆرەکانی کردووە، جگە لە هەنجیر و بەڵاڵووک و

زرەهەنار و ئەوانیش لە دووری ئەم شوێنەوەن. شیعری حاجی ئەو کاتەی لە ژێر کاریگەریی بەریەککەوتنی شوێن و منداڵیەتی، پتر بە ناوی گیاو ڕووەک و گوڵ، دیمەنی ئاسمانی وەک (هەور سەحاب و باران) بەناوبانگە و ئەم ناوچەی گۆڕقەرەجەش بەو دیمەن و گژوگیا و کانیاوانە دەوڵەمەند. بە ئاشکرا دیارە خاکەکەی بەپیت و دیمەنە سرووشتییەکەی جوان و تایبەتە. شیعرە بەهارییەکەی بەتەواوی پڕە لەو دیمەن و دەنگ و شوێن و بۆنانەی کە ئەزموونی حاجیی لە منداڵییەکی زوودا، دەبەستێت بەم شوێن و ژینگەیەوە. پاشتر لەسەر ئەم لایەنە قسەیەک دەکەم.

بەپێی هەندێ گێڕانەوە، دەبێت حاجی قادر تاکو تەمەنی نۆ ساڵی[1]، لەو گوندەدا مابێتەوە پاش مردنی باوکی لە منداڵییەکی زوودا، (فاتمەخان)ی دایکی دەیباتە کۆیێ بۆ ئەوەی بچێتە بەر خوێندنی فەقێیایەتی لەژێر دەستی (مەلا ئەحمەدی ئومەر گومبەتی). ئەم تەمەنەش بۆ پێگەیشتوویی هەستی شوێن و بە دەروونیکردنی شوێن لەلای منداڵ، گونجاوە.

---

[1] لەوانەش: مەسعود محەمەد، بەرگی 1، ل: 120

مرۆڤ لە منداڵییەکی زووەوە، تێگەیشتن و ئەزموونی خۆی لە شوێن، لە یادوەریدا تۆمار دەکات. هەرچەندە حاجی ناوی زێدی خۆی نەهێناوە، بەڵام ناوی هەندێ شوێن، هەوار و گوند و کەشوهەوای گوندەکان لە ئەزموونی ئەودا بەرجەستەن.



## ڕەشماڵ:

بەمجۆرەش، ماڵ لە شێوەی خانوو، یان یەکە و قەبارەیەکی مادییدا لە ئەزموونەکەی حاجیدا و لە پەیوەندیی بە منداڵییەوە، تا ڕاددەیەک، ونە. ئەو باس لە ڕەشماڵ دەکات، نەک ماڵ. ڕەشماڵ، شوێنێکی کاتیە بۆ نیشتەجێبوون کە هۆزە کۆچەرەکان، یان ئاژەڵدارەکان

بەپێی گۆڕانی وەرزەکان و گەرمیان و کوێستانکردن بۆ حەوانەوە بەکاری دەهێنن، کە بۆ ئەوان هەمان ئەرکی ماڵ و خانووی هەیە. ڕەشماڵ شوێنێکی حەوانەوە و تێداژیانی کۆچەریانەیە کە بەشێکی ژیانی مرۆڤ لە مانگی یەکەمی بەهارەوە تا کۆتایی پاییز و هەندێجار زیاتریش، مرۆڤەکان بۆ پارێزگارییکردن لە ئاژەڵەکانیان



و خۆشکردنی بەرهەمەکانیان لە شیرەمەنی و هەر شتێکیتر، تیایدا دەمێننەوە. پێدەچێت ناوەکەش هەر لەم کەشوهەوایەوە هاتبێت، چونکە بەشێکی ڕەشماڵەکان هەر لە بەن و خوری ئەو ئاژەڵانەوە دروسدەکرێت، کە کۆچەران بەخێویان دەکەن و ڕەنگەکەی بۆر و تاریکە.

ڕەشماڵ یەکەیەکی شوێنیە، بەڵام وەک خانوو نیشتەجێ و نەگۆڕ نییە و شوێنگۆڕکێی پێدەکرێت و گەڕۆکانەیە.

وەک یەکەیەکی شوێنی، ڕەشماڵ شوێنێکە تەواوی خێزان، لە ناو هەمان فەزادا ژیان بەسەر دەبەن. ژووری تایبەت و شوێنی جیاکراوە لە ڕەشماڵدا، وەک خانوو نیە کە دەرگا و دیوار جێگەکانی هەمان شوێن لێکتری جیا بکاتەوە. جیاکردنەوەی جێگەکان لە ڕەشماڵدا، پتر جیاکردنەوەیەکی سیمبوولی و نیشانەناسیانەن، نەک ئەندازیاریانە و لە ڕێگەی دیوار و پەنجەرە و دەرگاوە. پێدەچێت لە ڕەشماڵدا جۆرێ لە ناوبڕ، هەبێت، بەڵام ئەمە یاسا نیە. هەر بۆیەشە ناوبڕ و دیواری ڕەشماڵ هەمان ئەرکی دابڕکردنی مرۆڤی لە دەرەوەی ڕەشماڵ و دەروبەر و سرووشت، نیە، کە دیوار لە ماڵدا هەیەتی. لەناو ڕەشماڵەوە بە ئاسانی گوێت لە دەرەوە دەبێت و بۆنی دەرەوە دەکەیت و لە کون و درزەکانەوە ئاسمان و دەوربەر دەبینرێن.

بۆیە دەکرێت کاریگەریی جیاکردنەوەی هەستەکانی مرۆڤ لە دەرەوە، یان لە سرووشت، لە خانووەوە بۆ ڕەشماڵ جیاواز بێت. لە ڕەشماڵدا ئەو کاریگەرییە ڕاستەوخۆترە، وەک لە خانوو. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو کەرەستانەی ڕەشماڵیان پێ دروستدەکرێت، هەمیشە

بۆشایی و درزەکانی پەیوەندیی بینراو و بیستراوو و بۆنکراو، لەگەڵ دنیای دەرەوە دەهێڵنەوە، کە دیوار و سەقف، بەتەواوی جیایان دەکاتەوە.

ئەو کەرەستانەی ڕەشماڵیان پێ درووستدەکرێت، لە دار بۆ ڕاگرتن، ڕایەڵ و گوریس و پارچەی چنراو لەگەڵ هەرشتێکی وەک پێستە و کەڕەگەڵا و قامیش، کە توانای هێشتنەوەی ئاو و بارانی هەبێت لە سەر سەقف[1].

---

[1] لەو چاوپێکەوتنەمدا لەگەڵ (لالە ئەحمەد سمێڵی ئومەر گومەتی)، لە گوندی ئومەر گومەت لە ڕۆژی (2016/5/16، پێشنیوەڕۆ)، سەبارەت بە چۆنێتی بیناسازیی تیرەی خۆیان، لە کاتێکدا تەماشای خانووەکانمان دەکرد، ئەوەی بیرخستمەوە، کە دروستکردنی خانوو لەلای ئەوان لەم ناوچەیە شێوازێکی تایبەتی هەیە: (دیواری هەرماڵێک لە ناوەڕاستیدا بەهۆی دارێکی درێژەوە کە لە بنمیچەوە دێتە خوار بۆ سەر زەوی، دیوارەکە دەکەن بە دوو لەتەوە. ئەمەش بە جۆرێ کە لەناوەڕاستی سەربانەکەوە بە هەردوولادا لێژاییەکی کەم دروست ببێت و ئاو و بەفر گل نەداتەوە. سەقفی ماڵ لە دیووی ژوورەوە، بە دارەڕا و قامیش ڕایەڵ دەکرێت. لەناوەڕاستی ماڵدا کورەخانە، یان ئاگردانێک هەبووە. بەشی سەرەوەی سەقفەکە لە ڕووی ئاسماندا، دەستەیەک قامیشیان لێکتر گرێداوە، کە ژمارەیان چوار تا شەش برە قامیش بووە و بە ڕووەکێکی تایبەت پێکیانەوە گرێداون، کە ڕۆڵی پەت و بەنی بینیوە. ئەم دەستە قامیشە لێکگرێدراوانەیان لەسەر بانەکە ڕایەڵ کردوون و ئەوانیشیان بە دارەڕاکەوە و بە هەمان ڕووەک پێکەوە بەستونەتەوە. لەسەر قامیشەکانەوە هاتوون پنجی گیایەکی تایبەتیان ڕیز کردووە و چینێ ڕستەقامیشی دیکەیان لەسەر داناوە بەبێ ئەوەی گڵەبانی بکەن. لە کاتی نوژەنکردنەوەشدا، ساڵانە، یان چەند ساڵ جارێک دیسانەوە هەمان گیا و قامیشیان لەسەر داناوەتەوە و بەوجۆرەش نوێیان کردۆتەوە، بەبێ ئەوەی چینەکانی ژێرەوە هەڵگێڕنەوە یان فڕێیان بدەن. دیواری ماڵیشیان هەر بە خشتی قووڕ کردووە و لە ناوە و دەرەوە سیواخیان داوە).

سەرجەمی ئەم کەشی ژیانە، لە شیعری حاجی قادر و بەتایبەتی لە قەسیدە بەرزەکەیدا: (گوتم بە بەختی خەوالّوو) (دیوان، ل: 38-47)، ڕەنگیانداوەتەوە.
من لەم بەشەی باسەکەمدا چەند بەیتێکی ئەو قەسیدەیە دەهێنمەوە، کە ئەم بۆچوونەم دەچەسپێنێت، کە دەڵێم فەزای ڕەشماڵ، مرۆڤ دەخاتە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆترەوە لەگەڵ دنیای دەرەوە، چ دنیای سرووشت بێت، یان ئاسمان. لە کۆی قەسیدەکەدا ئەم دوو ئاستەش لە دنیای دەرەوە بوونیان هەیە.
زۆربەی بەیتەکانی ئەم قەسیدەیە، نیوەبەیتێکیان ئاسمانی و نیوەکەی دی عەردییە. نیوەی نزم و داچوو، شۆڕەوەبووە و نیوەکەی دیکەی هەڵچوو، لوتکەیی و باڵانومایە. ئەم دوو فەزایە، فەزای دەرەکیی سرووشتەکی و فەزای باڵایی و هەڵچووی ئاسمانی، پێگە و ڕوانگەی منداڵیتی حاجی قادر و ئەزموونکردنی ئەو ژینگە نێوانیەی ئەوی لێ ژیاوە، ئاشکرا دەکەن. لە هەمان کاتیشدا بیرخەرەوەی ئەو زەینییەتە سەرەتاییەی مرۆڤە کە چۆن شوێنی تایبەتی خۆی لە شوێن و فەزای گشتی و جوگرافیای دەوروبەر جیاکردۆتەوە و لە ڕێگەیەوە وەک میرسیا ئەلیادە دەیگوت: شوێنی مەعنەوی لە شوێنی ئاسایی دابڕیوە و مانایەکی پیرۆزی پێ

بەخشیوە. لە قەسیدەکەدا، شوێنی حاجی قادر ڕێک لە نێوان ئەو دوو فەزایەدایە: سەر زەوی و فەزای ڕەشماڵ، کە ئەزر ڕووبەر و ئاسمان سەقفەکەیەتی و مرۆڤ ئاوەدانی پێدەبەخشێت:

مەلائیکەی سەری تاق و ڕەواقی مینایی
دەبێتە جونبوش و لەرزین، دەکەونە حەولەوەلا
کە هەڵکرا شەوێ ئاگر لە کوللی ڕەشماڵەک
خجل دەبن لە زەوایایی خەیمەیی والآ
عوتارید و زوحەل و ئافتاب و ماهی تەمام
خولاسە، سابیت و سەییارە تا دەگاتە سوها.

(دیوان، ل: 42)

لەم بەیتانەدا، حاجی ئەو فەزا نیوانییەی خۆی ئەزموونی کردووە، بەرهەمدەهێنێتەوە: لەسەرەوە فەزای ئاسمان و لە خوارەوە زەوی و مرۆڤیش لەو نێوانەدا. ئەمە جگە لە ئاماژەی بە شوێن لە شێوەی گۆشە و سووچ، کە ئەو بە (زەوایا)، کە بۆخۆی زاراوەیەکی شوێنناسییە، دەسنیشانیکردووە. ئەم بەیتانە دەستنیشانی شوێنی مرۆیی و ئەزموونی ژیانەکی دەکەن و ئەو سنوورە شەففافەی نێوان ڕەشماڵ و زەوی و ئاسمان، یان شوێنی ژیان و سرووشت و ئاسمان بەرجەستە دەکات. پاشان دێمەوە سەر ئەم باسە.

## مزگەوت و حوجرە: ئومەر گومبەت:

وەک لەمەوبەر زانیمان، تیرەی دەربەندی پاش کۆچە ناچارەکیەکەیان و جێهێشتنی بەزۆری ناوچەی دەروەند لە کرماشان، ڕوو دەکەنە دەشتی کۆیێ لە نزیک گوندی (مەزران)ی ئێستا و لە هەواری کانی قەبرۆک نیشتەجێی دەبن[1]. پاشان هەواری کانی قەبرۆکی مەزران جێدەهێڵن و لە سنووری ئێستای گوندی ئومەرگومەت، هەوارێک ئاوەدان دەکەنەوە بەناوی (ئومەرکوشیاو)، لە ئێستادا خەڵکی ناوچەکە بەم هەوارە دەڵێن (کاولانی ئومەرگومەت). ئەم هەوارە ئەو شوێنەیە کە سەرگەورەی تیرەی دەرەبەندی (جومعە دەربەندی) لەوێ دەمرێت[2]. پاشانیش، ئیتر دەربەندیەکان ئەم هەواری ئومەرکوشیاوەش جێدەهێڵن و دەچنە هەواری (بانی قەیتاس) و پاش چەند ساڵێکیش ئێرەش جێدەهێڵن و لە ساڵی 1748دا بەتەواوی دێنە شوێنی ئێستای گوندی ئومەرگومەت.

---

[1] من لە گەشتە مەیدانیەکانمدا بۆ ئەم مەڵبەندە، تەواوی ئەم شوێنانەم بینیون کە زۆربەیان کاولن. بەڵام پاشماوەی نیشتەجێبوونیان بەتەواوی دیار ماوە. بۆ زانیاری زیاتریش بڕوانە: - ئیدریس عەبدوڵلا ئومەر گومەتی. (2015)، ل: 72.

[2] ئومەرگومەتی، (2015)، ل: 73.

تا ئێره نیزیکەی پێنج جێگۆڕکێمان هەیە لە ئەزموونی ژیانی تیرەکەدا. ئەگەر سەرەتای ئەو کارەساتەی لە شوێنی بنەڕەتی خۆیان بەسەر ئەم تیرەیە هاتووە بگێڕینەوە بۆ هێرشەکەی نادرشا بۆ سەریان، لە ساڵی 1731دا، تا ساڵی 1748، کە گوندی ئومەرگومەت دروستدەکەن، نزیکەی (17)ساڵ ژیانێکی نا هاوسەنگ و پڕ مەترسی و شوێنگۆڕکێی جۆربەجۆر لە ئەزموونی ئەواندا دەبینرێتەوە. بۆیە دەتوانین گیرسانەوەیان لە شوێنێکی وەک ئومەرگومەت و ئاوەدانکردنەوەی ئەوێ، بەیەکەم هەوڵدانیان بۆ نیشتەجێبوونێکی سەقامگیرانە لە شوێنێکی تایبەتدا کە ماڵ و خانوو و مزگەوتی تێدا دروستدەکەن، لێکبدەینەوە. ئەمەش هاوشان و هاوکاتە بە نەمانی هەڕەشەی دەرەکیی لەسەریان و خۆگرتنەوەیان لەبەردەم مەترسیی هێرشە ناوەکیەکاندا.
لەگەڵ ئەوەشدا هەڕەشەی ئابووی لە شێوەی کەمی ئاو و نەبوونی زەوی و زاری بەراو، هاوکات بە زۆربوون و گەشەکردنی ژمارەی تیرەکە، دەیانخاتە سەر ئەو بیرۆکەیەی لە سنووری ئومەرگومەت، پەل بهاوێن بەرەو زێی بچووک و چەند هەوارێک پێکەوە بنێن و ئاوەدانیان بکەنەوە، بەڵام دیسانەوە بەبێ دابڕان لە یادوەریی تراژیدیانەی خۆیان کە ناچاری کردوون شوێنی تایبەت،

لە لوتکەکان بۆ پاسەوانی، لە بنار و دەشتاییەکان بۆ لەوەڕگا و لە چالایی و دۆڵەکانیشدا بۆ حەوانەوەو (خۆحەشاردان)، لەبەرچاو بگرن.
ئەو گوند و هەوارانەی پاش چونیان بۆ ئومەرگومەت ئاوەدانیان کردوونەتەوە، بریتین لە (گۆڕقەرەچ، سێگردکان، کێنەلە، سێ کێنی، گەرمک، موخەڕەس و شیوەجانی و..)[1].



جێی سەرنجە، لە دوای نیشتەجێبوونیان لە ئومەرگومەت، هۆکارەکانی شوێنگۆڕکێش لەوێوە بۆ شوێنانیتر، دەگۆڕێن. پێش ئەوەی ئومەرگومەت ئاوەدان بکەنەوە و بە جۆرێک لە دڵنیایی بگەن، هۆکارەکانی شوێنگۆڕکێ بە

[1] ئومەرگومەتی: هەمان سەرچاوە، ل: 74.

تەواویی سیاسیی و سەربازیی بوون بۆ خۆپاراستنیان لە هێرشی ئەوانیتر. بەڵام پەلهاویشتنیان لە ئومەرگومەتەوە بۆ نزیک زێی بچووک، هۆکاری ئابووری و گەشەی دانیشتوانی تیرەکەی لە پشتەوەیە، کە بێ پەیوەندیی نیە لەگەڵ تێڕوانینێکی تایبەتیشدا بۆ کات و بیرکردنەوەیان لە دابینکردنی دوا ڕۆژی خۆیان و بڕیاری مانەوەی هەمیشەییان، بەتایبەتی کاتێک سەرۆکی تیرەکەیان دەمرێت و مەزارەکەی دەبێتە شوێن و بۆنەیەکی پیرۆز.

دابینکردنی بژێوی ژیان و پاراستنی خۆیان لە هەر مەترسییەک و هەوڵدان بۆ دروستکردنەوەی شوناسە پارچەپارچەبووەکەیان، لە پشت ئەم شوێنگۆڕکێ و پرۆسەی ئاوەدانکارییەوەیە. ئەمەش بۆ من گرنگییەکی خۆی هەیە لەوەدا کە چەندین جار باسی کاریگەریی مرۆڤ لەسەر شوێن و بەرهەمهێنانی کولتوورێکی تایبەتم لە شوێنی تایبەت کردووە. بەڵام لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەش گرنگە، کە چۆن شوێنیش مرۆڤ دەهێنێتە سەر تێڕوانینیکی تایبەت لە ژیان و دروستکردنی شوناسی خۆی[1].

---

[1] لەمبارەیەوە بڕوانە: سیوەیلی: دیاردەناسیی شوێن و شوناس (2015)، ل.ل: 85-96.

گرنگترین شت کە نابێت لەم نێوانەدا بیرمان بچێت پێگەی گوندی ئومەرگومەتە، کە وەک شوێنێکی سەرەکیی و سەرەتایەکی نوێی نیشتەجێبوون، توانای ئەوەی دەبێت مرۆڤەکان ئاراستە بکات بە دەوری خۆیدا، بەڵام خۆی وەک پنتێکی سەرەکیی و پیرۆز دەمێنێتەوە. وەکئەوەی لە (مێرسیا ئەلیادە و لێکدانەوەی ڕۆڵف)ـەوە بۆ ئەو تیۆرەیە فێربووین، شوێن کاتێک بەپیرۆز دەکرێت و مانای تایبەت و مەعنەوی بۆ ئەو کەسانە لە خۆی دەگرێت، کە لەسەری دەژین، ئیدی وەک سەنتەری جیهانی لێدێت. *شوێنێک، کە تیایدا پەیوەندیی نێوان زەوی، بەهەشت و دۆزەخ، مومکین دەبێت و ئەم شوێنەش چیتر لەسەر بنەمای یاسا و ڕێنماییە ئەندازەییەکانەوە شیاوی تێگەیشتن نیە*[1].

پەیوەندییە مەعنەوییەکان بە شوێنەوە، لە ئەنجامی هەستکردن بە دڵنیایی و ئاساییشەوە دروست دەبن. مرۆڤ لەو شوێنانەدا کە هەست بە دڵنیایی دەکات، هەستەکانی دەکرێنەوە و بەرەو تێگەیشتن لە خۆی و دەوروبەر دەچێت و ڕۆڵ و پێگەی کەسەکان لە ژیانیدا بەرجەستە دەبێت. ئەم شوێنانە دەبنە شوێنی ئیدراککراو،

---

[1] ادوارد رلف. مکان و بی مکانی، ص: 21

که لەسەر بنەمای ڕووبەڕووبوونەوەکان و ئەزموونە تایبەتیەکانەوە لەسەر شوێنگەلێکی جیاواز، یان پنتگەلێک، کە گرنگییەکی کەسییان بۆ هەر تاکێک هەیە، بەتەواوی جیاوازن. چونکە بۆ هەر کەسێک "ڕێکخستنی هزر، پرۆسەی تێگەیشتن و چەمکسازی بە توندیی بەستراون بە فەزای جیاوازەوە"[1]. ئەوە شوێن و فەزایە یارمەتیدەر و کاریگەرن بەسەر توانایی ئێمەوە لە ڕێکسختنەوەی بیرۆکەکانمان و ئاستی تێگەیشتنمان. هەر مرۆڤێک لەو قۆناغە سەرەتاییەی ژیانیدا، کە لە ئەزموونی حاجی قادردا جێی مەبەستی منە، شوێنگەلێکی تایبەت بە خۆی هەن، کە تیایاندا یەکەمین هزرینەکانی و لێخووردبوونەوەکانی، چەکەرە دەردەکەن و دواتر بە ناوهێنانیان بێت، یان دووبارەکردنەوەی چەند وشەیەک، یان یادکەوتنەوەی دیمەنێک بە هۆی بۆن و تام و چێژ و کەسان و فەزایەکی دیکەوە، ئەم شوێنانە مانا بە ژیانی دەبەخشن. "سەبارەت بە منداڵان، ئەم شوێنانە بنەمای ناسینی خودێتین. بۆی هەیە بۆ ئەوان، ئەشکەوتەکان، درەختەکان و تەنانەت قوژبنگەلێکی ناو خانووش وەک (شوێنی من)، بناسرێن"[2]. لەمەش گرنگتر ئەوەیە، بۆ

---

[1] رلف: هەمان سەرچاوە، ص: 15.

[2] رلف: هەمان سەرچاوە، ل: 16.

منداڵ بۆی هەیە ئەم شوێنە کۆش و ئامێزیی داییک یان هەر کەسێکیتر بێت، کە لە ژیانی ئەودا پێگەی دایکێتی هەبووە..



بۆیە لە ئەزموونی حاجی قادردا، ئەو شوێنانەی بە خەیاڵی ژیان لە ناوچەی دەربەندییەکان تۆمار کراون، بە ئاسانی دەناسرێنەوە، بەوەی کە ڕەگەزەکانی سرووشت، گژ و گیا، ناوی شوێن، شوێنی پیرۆز، ناوی کەسان و جێگەکان زۆر تیایاندا هاتووە. هەرچەندە حاجی ئەم شیعرانەی لە تەمەنێکی دیکەی ئەزموونە شیعرییەکەیدا نووسیون، بەڵام خەیاڵ و هزرینە زەینییەکەی هاوسەنگن لەگەڵ دیتنە عەینییەکەی. ئەوەی لە منداڵییەکی زوودا بەچاو بینویەتی لە ڕێگەی خەیاڵکردنەوەیەوە، لەگەڵ

ئەوەی  لە قۆناغی غەریباتییدا بیری لێدەکاتەوە، جووت دەبن. ئەم ڕاستییەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات، کە کولتوور و شوێن و فەزا، گرنگییەکی تایبەتییان هەیە لە پەیوەندیی بە تێگەیشتن و تۆمارکردن و یادکردنەوەی شوێن، لەلای مرۆڤ. ئامۆس ڕاپاپۆرت لەمبارەیەوە نووسیوەیەتی: "وێڕای ئەوەی سیستەمگەلێکی زۆر لە چێکردنی کولتووردا دەستیان هەیە، ڕۆڵی شوێنی نیشتەجێبوون و شێوەی سوودوەرگرتن لێی، لەکاریگەریی بۆ سەر منداڵان، بەتایبەتی لە قۆناغی پێش فێربوونی زماندا زۆرە"[1].



[1] اموس راپاپورت: معنی محیط ساختەشده. (رویکرد در ارتباط غیر کلامی). مترجم: دکتر فرح حبیب. تهران، انتشارات سازمان فناوری اطلاعات و ارتباطات شهرداری تهران. چاپ سوم، 1392 (2013)، ص: 76.

بەپێی ئەم بۆچوونە، پەیوەندییەکی نێوانخودی (Intersubjectivity)، یان نێوانمرۆیی و نێوانهزرین لە بەینی کولتوور، ئەزموون و دەوروبەر و ئامانجدا هەیە. هەست و تێگەیشتن ئەوەندە تێکەڵ دەبن، کە زەحمەتە لیکتریان جودا بکەینەوە. وەک ڕۆڵف لە (ئەلفرێد شولتز)ەوە ڕایدەگوێزێت: "جیهانی ڕۆژانەی ئێمە لە سەرەتاوە جیهانێکە پێکهاتووە لە پەیوەندیی نێوانزەینیی کولتوورەکان. ئێمە وەک مرۆڤ لەناو مرۆیەکانیتردا دەژین و لە ڕێگەی کاریگەریی ئاسایی و کارەکانەوە دەکەوێنە پەیوەندییەوە لەگەڵ ئەوانیتر، لەوانیتر تێدەگەین و لێمان تێدەگەن"[1].

بەمجۆرەش، تاکەکەس هەر تەنیا لە شوێنی خۆیدا لە چەقی فەزای خۆیدا نیە. بەڵکو لەسەرەتاوە تێدەگات کە زۆرینەی کەسەکانیتریش فەزا و شوێنی ئیدراککراوی خۆیانیان هەیە[2]. لێرەدا کاریگەریی ئەو دەوروبەرە دێتە پێشێ کە تیایدا مرۆڤەکان پێکەوە و لە پەیوەندییان بەیەکترەوە، خەریکی کولتوورسازین. بۆیە: "دەوروبەر لە گشتیترین شێوەیدا دەتوانێت وەک ئامرازێکی فێرکاری بهێنرێتە پێشچاو، کاتێک فێری دەبین و (پێی ئاشنا

---

[1] ادوارد رلف: مکان و بی مکانی، پیشوو، ص: 16.

[2] رلف، هەمان سەرچاوە، ص: 17.

دەبین)، بە شێوەیەکی زەینی دەگۆڕێت بۆ بیرخەرەوەی ڕەفتارە دروستەکان.. بە کورتییەکەی، ڕەفتاری مرۆڤ، بریتین لەو مامەڵە و پەیوەندییانەی کە کاریگەرییان لە یاساکان، زەمینە و ئەو دۆخانەوە وەرگرتووە کە بەبەردەوامی پەیوەستن بە ئاماژەکانی دەوروبەرەوە"[1].

هەموو ئەمەش بۆ ئێمە گرنگە کاتێک باس لەو شوێنە جیاوازانە دەکەین، کە گریمانی ئەوە دەکرێت، حاجی قادر لە سەرەتای ژیانیدا ئەزموونی کردبن و ئەو شوێن و کولتوور و کەسانەی کە لەوێ بوون، بووبنە بەشێک لە تێگەیشتنی حاجی لە کولتوور و شوێنی تایبەت بە خۆی. ئەمەش بە لەبەرچاوگرتنی ئەو ڕاستییەی دەوروبەر و شوێن، مرۆڤ و شتەکان، گیانداران و بێگیان و سرووشت و بیروباوەڕەکان هەموویان پێکەوە لە داڕشتنی ڕەفتار و بیرکردنەوەی تاکەکەسدا کاریگەرییان هەیە و ئامرازگەلێکن بۆ فێرکاری و دروستکردنی کولتوور و زەینییەتی مرۆڤ و پەروەردەکردنی هەست و نەستی.

بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو دەوروبەر و ڕەگەز و پەیوەندییانەی ژیانی منداڵیی حاجی قادریان تەنیوە و ئەو

---

[1] راپاپورت: 2013، ص: 78

لێیانەوە فێربووە و بۆی بوونەتە ڕوانگەی کولتووری، تێگەیشتنێکی سەرجەمگیر لە دەلالەت شیعرییەکانی ئاسان نابێت و هەڵوێستی ئەو لە ئاست پیرۆزکردنی شوێنگەلێک و سڕینەوە و بچووککردنەوەی شوێنگەلێکی تردا، تێناگەین.



## گێڕانەوەی شاریی و گێڕانەوەی زارەکی:

دوو گێڕانەوەی جیاوازمان هەیە سەبارەت بە سەرەتاکانی ژیانی حاجی قادر لە بواری خوێندندا. ئەم دوو گێڕانەوەیەش هەر یەکەیان کاریگەریی دەوروبەرێکی تایبەتی لەسەرە. گێڕانەوەیەکیان شاریانەیە و لەم گێڕانەوەیەدا حاجی لە گۆڕقەرەجەوە ڕاستەوخۆ دەهێنرێتە کۆیێ بۆ مزگەوتی موفتی. گێڕانەوەی دووەم

گێڕانەوەیەکی زارەکیی و گوندیانەیە و لە نێوان خوێندنی حاجی لەژێر چاودێری باوکی لە گۆڕقەرەج و بردنی بۆ مزگەوتی موفتی لە کۆیێ، شوێنێکی دیکەش پێشنیار دەکات کە حاجی تیایدا خوێندووە. ئەم دوو گێڕانەوەیە ناکۆک و دژن و لە پشت هەر کامێکیانەوە نییەتێکی نەگوتراو هەیە. ئەوە ڕاستە کە یەکەم ئەزموونی حاجی قادر لە بواری خوێندنی قورئاندا، وەک لەسەرچاوەکاندا باسیدەکرێت، دەستپێکردن و تەواوکردنی قورئانە لە گۆڕقەرەج لە ژێرچاودێریی باوکیدا کە مەلا ئەحمەد بووە. (هەرچەندە من لەوە دڵنیا نیم کە تەواوکردنێک ڕوویدا بێت، چونکە تەمەنی حاجی لەو قۆناخەدا بواری ئەوەمان پێنادات کە ئەم گێڕانەوەیە وەکخۆی پەسەند بکەین). بەڵام بەپێی ئەو شییکردنەوەیەی بۆ پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ئابووریی تیرەی دەربەندی و دابەشبوونیان بەسەر سێ دەستە و پێگەی سەرەکیدا، کردم، کە بنەماڵەی حاجی دەکەونە ناو بەشە ڕۆشنبیریی و ئایینییەکەیانەوە، ئەم گێڕانەوەیە لەسەر دەستپێکردنی حاجی بە خوێندن لەلای باوکی لە هەموو گێڕانەوەکانیتر بە ڕاستتر دەزانم.

لەگەڵ ئەوەشدا یەکەم ئەزموونی خوێندنی حاجی قادر لە دەرەوەی گۆڕقەرەج مزگەوتی موفتی لە کۆیێ نییە،

بەڵکو ئەو کاتەیە کە لە گوندی ئومەرگومەت دەچێتە بەر خوێندن لەلای خاڵی بەناوی (مەلا ئەحمەدی کۆر)[1]. ئەمەش گێڕانەوە زارەکی و گوندیی و شوێنناسییەکە پشتڕاستدەکاتەوە. لێرەوە هەم شوێنگۆڕکێیەک لە گوندی گۆڕقەرەجەوە بۆ ئومەرگومەت ڕوویداوە و هەم فەزای مزگەوت و حوجرە دێتە ناو ژیان و شیعری حاجی قادریی کۆییەوە، پێش ئەوەی ببرێتە کۆیە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا.

هەر شوێنێک لە خۆیدا بەهۆی سیستەمێکی پەیوەندیی تایبەتی نێوان مرۆیەکانەوە بەڕێوە دەچێت. شوێن تەنیا هەر ڕەنگدانەوەی کولتوور نیە لە چۆنێتی بیناکردن و جیاکردنەوەیدا لە دەوروبەر، بەڵکو شوێنە جیاوازەکان کولتوورێکی تایبەتیی ژیانکرددنیش بەسەر ئەو کەسانەدا دەسەپێنن و بەهۆیەوە دیسیپلینیان دەکەن، کە تیایاندا دەژین[2].

---

[1] ئیدریس عەبدوولڵا ئومەرگومەتی: *وێستگەکانی ژیان و پێکەیشتنی کەسیەتی حاجی قادری شاعیر* لە: دیداری حاجی قادری کۆیی، تەقتەق، وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، بەڕێوەبەرایەتی چالاکی ویژەیی سلێمانی، چاپی یەکەم، 2016، ل: 90.

[2] لەمبارەیەوە بگەڕێوە بۆ: اموس راپاپورت: فرهنگ، معماری و طراحی. مترجمان: ماریا برزگر، مجید یوسف نیاپاشا، تهران: انتشارات شلفین، چ: اول، 1391 (2012)، ص: 24 و بەرەودوا.

جگە لە فەزای گوندی ئومەرگومەت، فەزای مزگەوتەکەش و شوێنە پێکهێنەرەکانی، سەرنجڕاکێشن.
گوندی ئومەرگومەت لە ژیانی کۆی دەربەندییەکاندا پێگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە. چونکە وەک دەردەکەوێت لە پاش قۆناغی یەکەمی ژیانیان، ئەمە یەکەمین گوند بێت کە خۆیان ئاوەدانیان کردۆتەوە و ژیانێکی لە ڕووی ئاسایشی کۆمەڵایەتییەوە، نیمچە ئارامیان تێدا بردبێتە سەر. زۆربەی گۆڕستان و هەوار و کۆتانەکانیشیان لە سنووری ئەم گوندە دروستکردوون[1]. بەڵام پاشتر بە هۆکاری ئابووری و کەمئاوی، ئەوێشیان وردە وردە چۆڵکردووە و گەڕاونەتەوە بۆ نزیکی زێی کۆیێ. بوونی ناوگەلێکی زۆر لە ناوی شوێن و شوێنی پیرۆز و لوتکە و ژینگەی سرووشتی و ناوی ڕووەک و گژ و گیا، دیمەنی سرووشتی و ناوی جوگرافیانەی شێوەزاری تیرەکە، لە شیعری حاجی قادردا (بەتایبەتی لە شاکارەکەیدا: گوتم بە بەختی خەواڵوو)، ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن، کە حاجی بە چاوی خۆی و لەو تەمەنەدا ئەو شوێنانەی بینیون و تیایاندا ماوەتەوەو گوێبیستی ناوەکانیان بووە.

---

[1] ئیدریس عەبدوڵلا، سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

شوێنی گوندی ئومەرگومەت چ لە ڕووی تەلارسازیی و چ لە ڕووی تۆپۆگرافییەکەیەوە، جیاوازە لە شوێن و تۆپۆگرافیای (شوێنکەوتەی) کۆتان و هەوارەکانی دی. ئومەرگومەت لە بەرزاییە و ڕووی کردۆتە ڕۆژهەڵات و پاڵی داوە بە بەرزاییەوە. لە کاتێکدا شوێنی یەکەمی تیرەی دەربەندیی بۆ نیشتەجێبوون، لە پاش بەرزایی و ئەشکەوتەکان، خۆی لە کۆتان و هەوارەکاندا دەبینێتەوە و ئەمانەش کەوتونەتە نزمایی و زۆربەشیان نسێ و بیرخەرەوەی هەستکردن بەمەترسیی بوون، چ ئەو کۆتان و هەوارانەی پێش ئاوەدانکردنەوەی ئومەرگومەت دروستیانکردوون، چ ئەوانەش کە بە هۆکاری کەمئاوی لە دوای نیشتەجێبوونیان لە ئومەرگومەت، لەو سنوورە ئاوەدانیان کردوونەتەوە..



بۆیە بە ئاشکرا مەزەندەی ئەوە دەکرێت، کە هەڵبژاردنی شوێنی ئێستای ئەم گوندە پەیوەندیی هەبێت بە دڵنیابوونەوە و هەستکردنی دەربەندییەکان، بە ئاساییش لە ناوچەکەدا و ڕەوینەوەی ترسە مێژووییەکانیان. "مرۆڤ کاتێک لەسەر پێی خۆی دەوەستێت کە نیشتەجێ دەبێت و لە ئەنجامدا بوونی خۆی لە جیهاندا تۆمار دەکات.. ئەم مرۆڤە شوێنی خۆی و لە ئەنجامیشدا جۆرێ لە متمانەکردن بە هاودەمیی لەگەڵ مرۆڤەکانیتر هەڵدەبژێرێت"[1].

بەمجۆرەش هەڵبژاردنێک ڕوونادات ئەگەر دڵنیاییەک نەهاتبێتە ئاراوە. هەڵبژاردنی شوێنێک بۆ کردنی بە ئاوایی لە ڕوانگەی سرووشتییەوە، واتە "سنووردارکردنی شوێنێک یان ناوچەیەک. ئەمەش ڕێکەوتی ئەو کاتەیە کە ئێمە کۆتاییمان بە سەرگەردانی خۆمان هێناوە و دەڵێین ئێرە! ئیدی لەناخی (دەرەوە)، کە چواردەوری گرتووین دەستدەکەین بە دروستکردنی (ناوەوە) و لێرەشەوە ئاوایی دەبێتە خاڵی گەیشتن"[2].

---

[1] کریستیان نوربری-شولتز: مفهوم سکونت (به سوی معماری تمثیلی). ترجمه: محمود امیر یارأحمدی. تهران: نشر اگه، چ: پنجم، 1392 (2013)، ص: 17.

[2] نوربری-شولتز: هەر ئەوێ، ص: 49.

ئەم خاڵی گەیشتنە لە هەمان کاتیشدا دروستکردنی چەقێکە بۆ ژیان و بوون کە تیایدا ئاسمان و زەوی بۆ ئەفراندنی گشتێکی پڕ جەزبە تێکەڵ بە یەکتر بوون. ئەمەش وەک نۆربێرگ-شولتز دەنووسێت، بە سێ شێوەی تایبەت ڕوو دەدات:

یەکەم بۆی هەیە زەوی بەرەو ئاسمان هەڵچوویێت و دووەم بۆی هەیە زەوی لە داچوون و پاشەکشەی خۆیدا و لە شێوەی دۆڵ و چاڵاییدا، ئاسمانی گرتبێتە خۆی. سێیەم، بۆی هەیە زەوی بووبیتە پەرچکەرەوەی ئاسمان، لە شێوەی دەریاچەیەک، کانییەک، یان دورگەیەک[1].



*(کۆنترین بەشی گوندی ئومەرگومەت)*

دوو ئاستەکەی یەکەم لە دۆخی دەرەبەندیەکاندا دەبینرێتەوە. ئەوان لە سەرەتاوە چاڵایی و نەویایەتیان بۆ

---

[1] نوربری-شولتز: هەمان سەرچاوە، ص: 51

نیشتەجێبوونێکی کاتیی هەڵبژاردووە و لەسەر زەوییەکی پاشەکشەکردوو، ڕۆچوو، یان چاڵایی و دۆڵاییدا نیشتەجێبوون. هۆکارەکانی ئەم نیشتەجێبوونەش زۆرن، لەوانەش بەپێتیی شوێنەکە لە چاو شوێنەکانی دەوروبەری و خۆشاردنەوەیان لە چاوی ئەوانیتر. بەڵام لە هەڵبژاردنیاندا بۆ شوێنی ئومەرگومەت، بەرەو بەرزایی هەڵکشاون، چاڵاییان جێهێشتووە و ئەو شوێنەیان کردووە بە شوێنی مانەوە کە تیایدا لەسەر بەرزاییەک یان لوتکەیەک، ئاوەدانییان دروستکردووە. چونکە مرۆڤ بەردەوام (بەرزی)، نەک هەر تەنیا بۆ خرۆشاندنی هەستی نزیکی خۆی لە بوونەوەرەکان، بەڵکو بە پلەی یەکەم بۆ بە دەستهێنانی ئیمکانی خستنەژێرچاودێریی دنیای دەوروبەری خۆیەوە بەکارهێناوە. تۆپۆگرافیای گوندی ئومەرگومەت ئەم ڕاستییە بەیاندەکات: دەربەندییەکان لە چاڵاییەوە دێنە بەرزایی و ئاوەدانکردنەوەی بە مەبەستی توانای چاودێریکردنی دەوروبەریان، کە ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئاشکرای دڵنیایی و بڕوابەخۆبوونی ئەوان بووە لەو قۆناغەدا.

گوندەکە ڕووی لە دوو چیایە بەناوەکانی (گەوەی گولیلکین) و (گردەل) کە هەردووکیان ڕووتەنن. لە نێوان

ئەم دوو چیایە و گوندەکەدا ڕووبارێک هەیە و لەوبەری ڕووبارەکەوە بە دەستەڕاستدا بەشێکی گوندەکە و لەلای چەپ و پشتەوەش، بەشەکانی گوندەکە لە شێوەی ڕێزە ماڵێکدا کە زۆر لە یەکتر دەچن، نیوە بازنەیەکیان پێکهێناوە. هەروەکچۆن دەردەکەوێ کە گوندی ئومەرگومەت یەکەم شوێنی نیشتەجێبوونی تەواوی دەربەندییەکان و (پایتەخت)ی یەکەمیان بووبێت، ئاواش مزگەوتی ئومەر گومەت چەقی ئەم پایتەختە بێت. ئەمەش بەو پێیەی مزگەوتەکە کەوتۆتە بەردەم گوندەکە و ڕووی لە چیاکانە و دەکەوێتە ناوەڕاست و چەقی گوندەکەوە..

*(بەشێک لە گەوەی گولیلکین و گردەڵ)*



پێدەچێت مزگەوتی ئومەر گومەت، لەگەڵ، یان چەند ساڵێکی کەم پاشتر لە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکە

دروستكرابێت. بەپێی گێڕانەوەی (لالە ئەحمەد سمێڵ) كە بۆخۆم لە ڕێكەوتی (2016/5/16) و پاشتریشدا چاوپێكەوتنم لەگەڵ كردووە، ئەم مزگەوتە سێ جار ڕووخێنراوە بەڵام هەر جارێك لەسەر نەخشە سەرەتاییەكەی خۆی دروستكراوەتەوە و هیچ گۆڕانكاریی تێدا نەكراوە.

كاتێك لە ناو گوندەكەوە بەشی لای سەروو، دەچینە مزگەوتەكەوە، دەبینین كە ڕاڕەوێكی درێژ، كە هەمان سەربانی مزگەوتەكەی هەیە و وەك پاشخانێك وایە، بە درێژایی مزگەوتەكە درێژ بۆتەوە. كە لە لای ڕاستییەوە دەرگایەكی واڵا هەیە دەتباتەوە ناو حوجرەی فەقێكان.



شێوازی ئەم حوجرەیە، لاکێشەییە و دوو پەنجەرەی تێدایە و پێشتریش ژێرەکەی شوێنی حەوانەوەی وڵاخەبەرزە بووە. لە ناو حوجرەی فەقێکانەوە، دەرگایەک هەیە دەتباتەوە ناو مزگەوتەکە. لە کۆتایی حوجرەکەشەوە، دەرگایەک لەلای چەپ و پەنجەیەکی گەورە لە پێشەوە هەیە.



(دەرگایەک بۆ ژووری مزگەوت، دەرگایەک بۆ هەیوان)

بەمجۆرەش لە حوجرەکەوە توانراوە بچیتە سەر هەیوانی مزگەوت و بشچیتە ناو مزگەوتەکەوە. لە ناوەڕاستی پاشخانەکەشدا، دەرگایەک هەیە ڕاستەوخۆ دەتباتەوە ناو مزگەوتەکە.

ئەوە دەرگای سەرەکیی چوونەژوورەوەیە بۆ مزگەوتەکە و شوێنی نوێژکردن. لە ناوەڕاستیدا مینبەر و لەلای چەپ و ڕاستیی مینبەرەکەوە، دوو پەنجەرە و لەلای چەپەوە



بەسەر ئاواییەکەدا پەنجەرەکییتر هەیە. بە درێژیی بینایەی مزگەوتەکەش، هەیوانێکی گەورە هەیە کە بەسەر ڕووبارەکەدا دەڕوانێت و نێوان ڕووبار و هەیوانی مزگەوتەکەش پێشتر گۆڕەپانێکی گەورە بووە.

لەلای ڕاستیشەوە، بەڵام چەند مەترێک دوورتر لە بینایەی مزگەوتە و ڕوبەڕووی حوجرەکە، جۆگایەک بەژێر ڕێزێ قولەیتێن، یان تەوالێتی مزگەوتەکەدا هێنراوە، کە دەچێتەوە سەر ڕووبارەکە.



فەزای ژیانەکی ناو مزگەوتەکە تایبەتە:

هەرچەندە مزگەوتە گەورە نیە، بەڵام لاکێشەییبوونەکەی و بەرزیی بنمیچەکانی، پێدەچێت لەسەرەتاوە درێژیی بانی مزگەوتەکە لە ناوەوە بە چەند کۆڵەیەکی دار، کە لە کوردستاندا بۆ ئەم مەبەستە بەکار دەهێنرێن، ڕاگیرابێت کە لە ئێستادا ئەمانە نەماون و ئاسن جێگەی گرتوونەتەوە. ئەم فراوانیە لەگەڵ ئەو ڕووناکاییە زۆرەدا کە هاتۆتە ژوورەوە، فەزای ناوەوەی کردۆتەوە و جۆرێ

له فراوانیی به شوێنەکە بەخشیوە. شوێنی نوێژکردن دەکەوێتە ناوەڕاستی بینایەی مزگەوتەکەوە و لە سێ لاوەی فەزایەک هەیە کە ئەم ژوورە دەگرێتە خۆی: لەلای دواوە پاشخانەکە، لەلای ڕاستەوە حوجرەکە و لە پێشەوە هەیوانی مزگەوتەکە هەیە.

*(مزگەوتی ئومەرگومەت لە ناوەوەی)*



لە ناوەوەی مزگەوتەکە، بەشی پێشەوەی، مینبەر وەک چەقی بینایەکە خۆی دەنوێنێت، کە لەبەردەمیدا و لە بەرزی نزیکەی مەتر و نیوێک تاق و ڕەفەی کتێبەکان بەدی دەکرێن. حوجرەکە بەشی



ژیانەکی و کۆمەڵایەتیی فەقێکان بووە و ناو مزگەوتەکەش شوێنی خوێندن.
بۆیە ئەو دەرگایەی لە حوجرەوە دێتە ناوەوە، تەنیا بۆ ئەوان بەکار هاتووە. هەرچەندە ئەم مزگەوتە لە شێوازە میعمارییەکەیدا، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ شێوەکانیتری مزگەوت لە گوندەکاندا نیە، بەڵام ئەو جێگەیەی لەسەری دروستکراوە و بوونی دوو چیای بڵند لەبەردەمیدا و ڕووبارێک، فەزایەکی مەعنەوی داوە بە شوێنەکە.



ئەم فەزا مەعنەوییە هیچ جیاکارەیەکی لە نێوان سرووشت و حەرەمی مزگەوتەکەدا نەکردووە و لە هەیوانی مزگەوتەکەوە کە دەنۆڕێت ئاسۆیەکی

دوورودرێژ دێتە بەرچاوت. تیکەڵکردن و لێکجودانەکردنەوەی مزگەوت وەک شوێنێکی تایبەت و سرووشت وەک شوێنی دەوروبەر، گرنگیی خۆی هەیە بۆ منداڵیی حاجیی قادر. ئەو نزیکایەتییەی لە شیعری ئەودا لەگەڵ سرووشت بەدیی دەکەین و جیاکردنەوەی فەزای مەعنەوی لە نومایشی ئاییندارییی لە هزری ئەودا و ڕەخنەی بەردەوامی لە هەندێک شێخ و سۆفی و ستایشکردنی بۆ هەندێک دینداری لەوێنەی ئەحمەدی خانی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی و چەندیتر، بەڵگەی پەروەردەبوونێکی تایبەتی حاجی قادرن لە بواری دینیدا، لە ئاستێکی ناخەکیدا نەک ڕواڵەتیدا.



ئەو شیعرانەی بەم دیدە منداڵییەوە نووسیونی، ستایشێکی ئێستاتکیانە، نۆستالیژیانە و مەعنەویانەی

سرووشت و شوێن و کەسەکانن، نەک ستایشێکی ئایینی ڕووت. کە سرووشت و دیاردەکانی وەک دروستکراوی هێزێکی تایبەت بزانێت. وەک لە قەسیدە درێژەکەیدا: (گوتم بە بەختی خەواڵوو..) دەبینرێت، حاجی قادر لە جۆرێک لە گەردوونئۆڕی نزیکدەبێتەوە، کە هەموو شتەکان، ئاسمان و زەوی، خوار و سەر، بەرز و نزم، دەنگ و بێدەنگی، سەقامگیریی و جوڵە، شەو و ڕۆژ، تاریکی و ڕووناکی، وشک و تەڕ، مرۆڤ و ئاژەڵ و .. پێکەوە گشتێک لە جوانی گەردوون تەواو دەکەن.

(دیواری مینبەری مزگەوتی ئومەرگومەت)



شوێن و ئەزموونی شوێن لە پێکهێنانی ئەم گەردوونئۆڕیەدا کاریگەریی و ڕۆڵی گرنگیی خۆی هەبووە. شوێن بۆ حاجی خوڵقێنەری فەزایەکی مەعنەوی

بووه و ئەم مەعنەویاتەش هەڵگریی ئەو کولتوورەیە کە لەو شوێنەدا بەرجەستە بووە. بۆیە ئەم قەسیدەیەی حاجی ئیمکانی نووسینی نەبوو، ئەگەر ئەو ئەزموونکردنە تایبەتەی شوێن لە ژیانی منداڵیی حاجیدا نەبوایە.
لە هەموو ئەوانە بترازێت، ئەو شوێن و فەزای ناوەوەی ئەو شوێنانەی حاجی قادر لەم بەشەی ژیانیدا تیایاندا ژیاوە، بەدووربوون لە تاریکی کە بۆخۆی بەرهەمهێنەری ترس و جۆرێ لە گرژیی دەروونییە بۆ منداڵ و ئەمەش لە دواجاردا کاریگەریی دەکاتە سەر بیرکردنەوە و خەیاڵ و یادوەرییەکانی. کاتێک دەڕوانینە خەیاڵ و یادوەریی حاجی لەو شیعرانەیدا کە هەڵگری دەلالەتەکانی منداڵیی ئەون، تاریکیی وەک ڕەگەزێک زۆر بە کەمی دەبینرێت. چ فەزای ناوەوەی ڕەشماڵ و چ فەزای مزگەوت و حوجرە دروستکەریی ترس و بەخۆدا ڕۆچوونەوەیان نەکردووە. وێنەکانی حاجی، دیمەنی ناو شیعرەکانی، ئومێدەوارییەکەی، ئیرادەگەرایی و ڕاشکاوی و ڕوونیی و سادەییەکەی لە دەربڕیندا، گشتیان پەیوەندییان هەیە بە فەزایەکی ئەزموونکراوی و ڕووناکاییەوە. وێڕای هەر ئەزموونێکی ناخۆشی ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و کولتووریی کە پێدەچێت حاجی قادر بەریانکەوتبێت، لە ناوەوەی خۆی ژیان و ڕەگەزەکانی بە شێوەیەکی دیکە

گلداونەتەوە. هەرچەندە دەرەوەی کۆمەڵایەتی ئاڵۆز و تاریک بووبێت، کەچی هەموو شتێک لە خەیاڵی حاجیدا بە ڕوونی دەبینرێت، بە ڕوونی و سادەیی وەسف دەکرێت و ئەمەش منداڵییەکمان پێدەناسێنێت بەدوور لە شپرزەیی دەروونی و ئەزموونکردنی تاریکی و ئەو ترسانەی تاریکی لە یادوەریی منداڵدا جێیاندەهێڵێت.

## لە بەختی خەواڵووەوە بۆ بەختی کەچ:

من ئەم شیعرەی حاجی کە لە 57 بەیت پێکهاتووە و بە پێی دیمەنگۆڕییەکانی لەناو دەقەکەدا، دابەش دەکەمە سەر چوار جوڵەی سەرەکیی، کە لە هەرکامێکیاندا بابەتیش دەگۆڕێت.

لە جوڵەی یەکەمدا کە کلیلییە، ڕوو دەکاتە بەختی خەواڵووی غوربەتیانەی خۆیی و خودای بەگژدا دەکات تا لە خەو هەستێ و بیباتەوە ئەولا. بەمجۆرەش سەرەتای شیعرەکە جیاکارەیەکی شوێنی لە نێوان (ئێرە) و (ئەوێ)، یان (ئەملا) و (ئەولا)دا دەکات، کە لە خۆیدا دابەشکردنی جیهانە بەسەر دوو بەشدا. غوربەت و نیشتیمان. سنووردانانی حاجی بۆ بەخت، کە لە کولتووری ئیسلامیی و ڕۆژهەڵاتیدا دژی ویست و ئیرادەگەرییە و لە خەوهەستاندنی بە مانای ناڕەزایەتی حاجی لەو دۆخە دێت. بۆیە جوڵەکە هەر تەنیا جوڵەیەکی شیعریی لەسەر ئاستی دەقەکە نیە، هێندەی ئەوەش کە جوڵە و سنووردانانە لە هزریندا. ئەگەر بەخت وای کردبێ کە حاجی تا ئێستا خەواڵووانە لە غوربەت ژیابێت، ئەوە لە ئێستە بەدواوە ویستی حاجی دەیەوێت خۆی لەم دۆخە ڕزگار بکات. بەمجۆرەش، بێداربوونەوەیەک لە خەونی دۆگمایی کانتیانەمان بیر دەکەوێتەوە کە

هاوشانیشە بە کەمێک تووڕەیی و وەڕسبوون. گوزارەی *ئەتووبی خودا* جۆرێ لە دەستەوەستانبوون، تووڕەیی و وەڕسیی لە ئاست دۆخێکدا بەدیار دەخات، کە مرۆڤ دەیەوێت تێیپەڕێنێت. لە بەیتی (32)شدا، کە دەکەوێتە سەرەتای جوڵەی دووەمەوە، بەختی خەوتوو بە ڕقەوە هەڵدەستێت.

ئەمە بەیتی یەکەمە:

گوتم بە بەختی خەواڵوو: بەسە ئەتۆ بی و خودا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەولا

لێرە بەدواوە هەتا بەیتی (32)، حاجی بە خەیاڵێکەوە کە لە ئەزموونی سەرەتای ژیانییەوە لە شوێنی سرووشتی و ناشار، وەریگرتووە، دەکەوێتە وەسفێکی دیاردەناسانەی سرووشت و پێکهاتەکانی. گرنگترین خەسڵەتی ئەم شیعرە بە گشتی و ئەم جوڵەی یەکەمە بە تایبەتی، هەمان دابەشکردنی جیهان و گەردوونە بەسەر دوو بەشدا و دەستنیشانکردنی شوێنی مرۆڤ خۆی. شوێنی مرۆڤ لێرەدا (سەر) زەوییە، (ژێرەوە)ی ڕووبەری زەویی و (سەرەوە)شی ئاسمان. مرۆڤ لەم نێوانەدا ڕۆڵی کۆکەرەوە و بەیەک گەیاندنی زەوی و ئاسمان دەبینێت. ئەمە گەمەیەکی مرۆڤە بۆ ئاشتەوایی و

دانەبڕان. لە هەر دێڕێکی ئەم بەشەی شیعرەکەدا نیگای حاجی جارێک لە ئاسمان و جارێک لە زەوییە، جارێکی دەنۆڕێتە بەرزایی و جارێکی دی دەڕوانێتە نزمی. ساتێک باسی گرمەی سەحاب و هاژەی باران و ساتێکی دی باسی چیا و نواڵە و نەسیم و سەمای گوڵ دەکات و لە هەڵقوڵینی کانیی دەدوێت:

**لە گرمە گرمی سەحاب و لە هاژەیی باران**
**چیایە پڕ لە هەرا و نواڵە پڕ لە سەدا**

وەک دەبینرێت، لەم بەیتەدا، لە بەرزییەوە دێتە خوار و لە نزمییەوە دەچێتە سەر. سەرەتا دەنگی ئاسمان ڕایدەچڵەکێنێت و پاشان دەنگدانەوەی سەر زەوی. لە بەیتی دیکەدا بە پێچەوانەوە، لە زەوی دەنۆڕێت و پاشان نیگای ڕوو لە ئاسمان دەکات:

**پڕە لە سەیل و لە گۆلاو کانیی ڕوویی زەمین**
**پڕە لە بەرق و بریقەی برووسکە جەووی سەما**

لە هەندێک بەیتیشدا، نیگا ڕاستەوخۆ ئاراستەی ئاسمان ناکرێت، بەڵکو ئاراستەی ئاستەکانی دیکەی بەرزیی دەکرێت، وەک (هەور، هەوا، چیا، قەڵا، چنار) و پاشان بەرزایی (گژوگیا، گووڵ و چەمەن و فڕین و نیشتنەوەی

باڵندان).. له هەموو ئەمانەدا جوڵەی نیگا، له بەرزییەوە بۆ نزمی و له خوارەوە بۆ سەرەوە ئاراستە دەبێت. جار هەیە هەڵقوڵانێک ڕوودەدات کە ئاماژەیە بە بەرزبوونەوە و لە هەما کاتیش ڕژانێک کە ئاماژەیە کە ئاماژەیە بە هاتنەخوارەوە:

**به جۆشی ئاگری گوڵناری کانی هەڵدەقوڵێ**
**میسالی دیدەیی وامیق لە حەسرەتی عەزرا.**

جاریش هەیە ڕووخان و دارمانێک ڕوویداوە و سەرهەڵدانەوەیەک و *بیناکردنەوەیەک* جێی دەگرێتەوە:

**قەڵاتی زیوی ڕوخاوە هەرەس بە تۆپی نەسیم**
**سوپاهی لالە و گوڵ، چادری لەجێ هەڵدا**

کۆی ئەو فەزایەی لەم نیوانەدا، لە نێوان (مرۆڤ) وەک ئەزموونکەری ژیان و دەنگ، ڕەنگ، بۆن و (زەوی) وەک شوێن و فەزای (ئاسمان)دا دروستدەبێت، فەزایەکی هەستپێکراوی سۆژەی ئەزموونکەرە. حاجی لە ڕێگەی گێڕانەوەی ئەو ئەزموونەوە کۆی ئەو دیمەنانە دەهێنیتەوە پیشچاوی خۆی کە لە منداڵییدا ئەزموونی کردوون. بەڵگەی ئەمەش ناوی شوێن و جۆری گژوگیا و نەبوونی هیچ پەردەیەکی ڕێگرە بۆ بینین لە نیوان

مرۆڤ و ئاسمان و مرۆڤ و عەرددا. هەروەک چۆن ئەو دەنگ و دیمەن و جۆری ئاژەڵ و باڵندە و کانیاو و گوڵانەش کە لەو شوێنانەی منداڵیی ئەزموونی کردوون، لێرەدا دەهێنێتەوە پێشچاوی..

بەرهەمهێناوەی ئەم فەزایە، بەبێ وێناکردنی ئەو شوێنانەی کاریگەرییان لەسەر خەیاڵ و یادوەریی حاجی جێهێشتووە، مانای نیە. هەروەکچۆن خەیاڵی بەشێکی زۆری شیعرەکە خەیاڵ و ڕوانینێکە لە چاوی منداڵییەوە، ئاواش ئەو فەزا و شوێنەی لەم دەقەدا بەرهەمدەهێنرێتەوە، *ناشاریانە* و سرووشتیانەیە کە پەیوەندیی نێوان مرۆڤ و شتەکان، مرۆڤ و جیهان و بکەر لێکتر دابڕاو نین و ڕاستەوخۆیە و هەموو شتێک بە جەستەیی بووە و بۆتە بە بەشێک لە یادوەریی قووڵ. لەوەش بترازێت ئەو پەیوەندییانەی لەم شیعرەدا لە نێوان سۆزەی ئەزموونکەر و ئاژەڵ و شوێن و سرووشتدا هەن، کەشێکی کۆچەریانە و ئاژەڵدارییمان بیر دەخەنەوە:

لە کێو و کەژ کە سەر ئێوارە دێتەوە ماڵات
لە دەوری چادری ساحێبی مەوجی دا، وەستا
لە حیلە حیلی کەحێل و لە باڕە باڕی مەڕان
لە دەنگی قۆڕەیی گاجووت و بۆڕەیی مانگا

له گورگەلوور و حەپەی سەگ، لەقارەقاڕی بزن
له عەکسی دەنگی دووبارەی که دێتەوه له چیا
له ئۆحه ئۆحەیی گاوان و قیرەقیڕی شوان
له بگره بەردەیی کابان دەبێته حەشر و حەلا
که هەڵکرا شەوێ له کوللی ڕەشماڵەک
خجل دەبن له زەوایایی خەیمەیی والا

له دوای هەموو ئەم وەسفه ورده هەستەکیانه، بکەری ئەزموونکەر خودی خۆی بیر دەکەوێتەوه. هەروەکچۆن پێشتر (نالی) به سوودوەرگرتن له (با) وەک ڕەگەزێکی سرووشتی نەبینراو نامەکەی بۆ وڵات دەنێرێتەوه و خەیاڵی خۆی لەسەر دادەڕێژێت[1]، حاجیش به سوودوەرگرتن له (سەبا) و دەردەدڵکردن بۆی، دەریچەیەک بۆ چوونەوه ناو (خۆی) دەدۆزێتەوه. هەرچەنده باد و سەبا هیچیان له خۆیاندا مادییەتیان نیه و تەنیا جوڵەی شتەکان بوونیان بەرجەسته دەکات، ئاواش له لای هەردوو شاعیر ساتەوەختێکی نائومێدی به دوو ئاراستەی جیاوازدا دەبینینەوه: لەلای نالی، باد هێزێکه دەیباته دەرەوەی خۆی، بەڵام لەلای حاجی، سەبا

[1] بڕوانه: سیوەیلی 2015، کتێبی نالی، ل: 67–68 و بەرەو دوا.

هێزێکە دەیهێنێتەوە ناوخۆی، لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکیان لەم دوو ڕەگەزە ئومێدێک بۆ ڕزگاریی و پەنایەک بۆ هاودەمی دەدۆزنەوە. دۆخەکە بۆ هەریەکەیان ئاماژەیەکی قووڵی تێدایە بە تەنیایی و بێکەسی، ساتەوەختێک کە تیایدا مرۆڤی تەنیا پەنا بۆ هێزێکی دەرەمرۆیی دەبات تاکو بیکاتە هاودەم و هاوخەم، هێز و پەنایەکی نەبینراو. حاجی قادر لەم کارەیدا شتێک لە نالییش تێپەڕ دەکات، لەلای نالی باد هەر وەک ڕەگەزە سرووشتییەکە دەمێنێتەوە:

**قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور**

بەڵام حاجی کەسێتی بە سەبا دەبەخشێت و قسەی لەگەڵ دەکات و داوای لێدەکات زیندووی بکاتەوە، وەکو چۆن حەزرەتی عیسا فووی لە مردوو دەکرد و مردووەکان زیندوو دەبوونەوە[1]:

**سەبا! دەزانی ژیانم لە دووریيان مەرگە**
**دەسا وەرە بە کزەی خۆت خجل بکە عیسا**
**ئەگەر منم، لە فیراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ**
**ئەگەر دڵە، وەکوو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا**

---

[1] دیوانی حاجی قادر، ل: 43، پەراوێزی 1.

لە پاش ئەمە، جوڵەی دووەم دەستپێدەکات. جوڵەیەک پڕە لە بەیانکردنی حەقیقەت و شۆککردنی حاجیی: بەختی خەواڵوو نەک هەر ئامێز بۆ هەستەکانی حاجی ناکاتەوە و هێوری ناکاتەوە، بەڵکو لە شێوەی ئەژدیهایەکی خەوتوودا بە ڕقەوە لە خەو هەڵدەستێت و دایدەبڕێت لەو خەیاڵ و دیدەی منداڵیی و وەسفانەی بۆ سرووشت، کە هەمیشە لە تێپەڕینی کاتدا خۆی دووبارە دەکاتەوە. بەهار دێتەوە، بەڵام مرۆڤ نا. شوێن وەکخۆی دەمێنێ بەڵام ئاوەدانی نا:

بەهاری وا هەموو ساڵێکی دێتەوە ئەمما
ئەوانی دەچنە دیاری مەمالیکی عوقبا
یەکێکی نایەتەوە، چوونیان هەر ئەو چوونە
لە شێخ و عالیم و جاهیل، لە پادشاە و گەدا

ئەم ڕاستییە لە شێوەی ئاگاییدا خۆی بەیان دەکات و گۆڕان لە دەرەوە و گۆڕان لەناوەی حاجیی خۆیدا ڕووندەکاتەوە. ئەوەی حاجی لەوەسفدا دەیهێنێتەوە پێشچاوی ئەم دوو گۆڕانەی لێشاردۆتەوە. جەوهەری کارەکە ئەوەیە کە شوێن بەبێ مرۆڤ وێرانەیە، ژیانیش بەبێ خۆشەویستان، تێپەڕینی با:

مەکانە شەوقی بە عێلاتە، پەشمە کۆنە هەوار

**حەیاتە، زەوقی بە ئەحبابی، بایە ئاب و هەوا**

نەک هەر هاوەڵی کۆنە نەماون، بەڵکو جوانەکانیش پیر بوون، تۆش بۆخۆت گۆڕاویت و کەس ناناسیتەوە:

**ڕەفیقی کۆنە نەماون، جوانەکان پیرن**
**بە شەق دەڕۆن و لە داری دیارە شەققی عەسا**
**لە دووسەدی یەکەکی زەحمەتە بناسییەوە**
**مەگەر بە ناو و نیشان و بە خزم و باب و برا**

بۆیە چوونەوە بۆ وڵات و نیشتیمان لەم دۆخەدا، وەکئەوەیە بچیتەوە بۆ ناشوێن. گەڕانەوەیە بۆ ناوێک کە خۆی نیە. بیناکردنەوەی شوێنە بەبێ مرۆڤ، وێناکردنی وڵاتە بەبێ ئەوەی جێگەیەکی هەبێت تیایدا نیشتەجێی بکەی، وەک چۆن لە چیرۆکەکانی هەزار و یەکشەوەدا باسی شاری جابلوقا دەکرێت، بەڵام شارێک بەم ناوە نەماوە:

**کە بێی و بچیەوە ئێستاکە "کە ئەننەهوو" دیسان**
**سەفەر دەکەی لە وەتەن دەچیە شاری "جابولقا"**

ڕاستەقینە لە شێوەی داناییدا خۆی بۆ حاجی بەیان دەکات. ئەوەی بمانەوێت بە خەیاڵ نیشتیمان

دروستبکەینەوە ورێنەیە، یان (کەلامی بێ سەروپا). ئەم ڕاستییە هیچ دەرفەتێک بۆ حاجی ناهێڵێتەوە تا بەرگریی لە خۆی پێبکات جگە لەوەی بەدیلێک بۆ شوێنی نیشتیمان و وەتەن بدۆزێتەوە.. ئەمەش بابەتی جوڵەی سێیەمی شیعرەکەیە:

**خولاسەیی قسە ئێستێکە مەسڵەحەت ئەمەیە**

**بڵێی بە وەجهی نەسیحەت بە کاغەز و ئینشا.**

حاجی دەق و نووسین لەسەر کاغەز وەک شوێنێکی بەدیل بۆ بوونی نیشتیمان دەستنیشان دەکات. لێرەشەوە، شیعرەکە گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا دێت: لە خەیاڵکردنەوەی ورد لە سرووشت و هێنانەوە پێشچاوی نیشتیمان و دیارەوە بۆ دواندنی خود و هووشیاربوونەوەی لە ئاست بێ نیشتیمانی و بێ شوێنیدا و لەوێشەوە بۆ ستایشکردنی نووسین و (ئینشا) وەک تاکە ڕێگەیەک بۆ مانەوە.

ئەو دەبێت ئیتر بوونی خۆی لە زماندا بەرجەستە بکات. ڕۆحی نالی سەرلەنوێ لە حاجی قادردا بەرجەستە دەبێتەوە. وشەی (ئینشا)، بە مانای خۆ بەرجەستکردن، خۆ نووسینەوە، ماتەریاڵییەتبەخشین بە خود لە زماندا، لەلای هەردووکیان هەمان مانای هەیە. وشەکە لە بنەمادا بەشێکە لە کاری هونەری و مانای پەیکەربەندیی و

خۆبەرجەستەکردنیش دەدات. هەردووکیان زمان و دەق، دەکەنە جێگرەوەی نیشتیمان و بوونی خۆیانی لەسەر تۆمار دەکەن و زمان دەکەنە نیشتیمانی یەکەمی شوناس. نالی ئەمەی بە تاقییکردنەوەی خود بۆخۆی ناوزەد کردبوو:

**تەبعی شەککەرباری من کوردی ئەگەر ئینشا دەکا**

**ئیمتیحانی خۆیە، مەقسوودی لە عەمدا وا دەکا**

لە بەیتی ژمارە (41)وە تا بەیتی بەیتی ژمارە (55)، حاجی شەڕێکی قورس لەسەر نووسین و زمان وەک ماڵێک بۆ مانەوە، بەرپا دەکات. لە ڕاستیشدا ئەمە شەڕێکی قورسی دەوێت. شەڕێک، کە پێشتر نالی بۆ خۆ ڕزگارکردن لە دەسەڵاتی هەرسێ زمانی سەردەستەی (فارسی، تورکی و عەرەبی)، دەستی پێکردبوو، برینداریی چەشتبوو، گاڵتەی پێکرابوو، تانەی لێدرا بوو:

**کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە، خۆ کردییە**

**هەر کەسێ نادان نەبێ، خۆی تاڵبی مەعنا دەکا[1]**

حاجی بەردەوامیی ئەم جەنگەیە لە پێناوی زماندا وەک دەفری بەرجەستکەری شوناس و مانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا

---

[1] بۆ لێکدانەوەی من لەبارەی ئەم دەقەی نالییەوە، بڕوانە: سیوەیلی: 2015، کتێبی نالی، ل: 317-328

جیاوازییەکی زۆری حاجی هەیە لە چۆنێتی دروستکردنەوەی نیشتیمان وەک شوێن و کردنی بە شوێنی پیرۆز، لەگەڵ بەشوێنکردنی دەق بۆ پاراستنی شوناس بەبێ ئەوەی بیکاتە دەقێکی پیرۆز. حاجی تێگەیشتنێکی کراوە، ئاوەڵا و سنگفراوانانەمان لەسەر شیعرەکانی پێشکەش دەکات و داواش دەکات بەچاوێکی فراوانەوە تەماشایان بکرێت. بۆیە حاجی دەقێکی پیرۆزی بەرهەم نەهێناوە، بەڵکو دەقگەلێکی بەرهەمهێناوە کە (سەهوو و خەتا)یان تێدایە و شیاوی (تەسحیح)و ڕاستکردنەوەن:

نییە لە مومکینی ئیمکان خەتا و سەهوی نەبێ
بەغەیری خواجەیی دیوانی "عەللەمەلئەسما".

لە شیعری *"ناوی بیسمیلا"*شدا ئەم بابەتەی ڕوونکردۆتەوە:

بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن
مەقسەدم لەم بەند و باوە دەربچن

ئێستە هەرچیم پێ بڵێن عەیبی نییە
چونکە ئینسان عیلمی غەیبی پێ نییە
(ل: 207)

لێرەدا ئەوەش دەبینرێتەوە کە مرۆڤە شاعیریش لە هەڵە بەدەر نیە چونکە ئەو خودا نیە، کە هەرگیز هەڵە ناکات. ئەمە قەناعەتە و میزاجی شیعری نیە. حاجی خۆی وەک ئەدیبێک جیا دەکاتەوە کە شایانی ڕەخنەگرتنی زانایانە و ئەمەش وەک نرخاندێک تەماشا دەکات بۆ خۆی، لە ئاست حەسوود و چرووکەکانیشدا کە تەنیا مەبەستیان عەیب و عار دۆزینەوەیە، خۆی بە بەری دەبینێت. بەڵام هەموو ئەمە لە پێناوی چیدا؟ بۆچی حاجی دەستەودامانی برادەرانی دەبێت و مافی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانیان دەداتێ و داوایان لێدەکات وەک شوێنەواری نالی و کوردی، ونیان نەکەن؟ کوا قەلەندەریی و لەخۆڕازیبوونی حاجی و توورەیی لە جەهلی زەمانە و بەگژداچوونەوە زبرەکانی؟

ئەم پاشەکشەیەی حاجیش دیسانەوە لە پێناوی زماندایە. حاجی زمان دەکاتە سەنگەری بەرگری. ئەو لە ئاستی کەسییدا شیعرەکانی بە منداڵ و نەوەی خۆی دەچوێنێ، لە ئاستی شوناسی نەتەوەییشدا بە نەقد و دراوی پاشایانە و دەنووسێت:

**ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن**

**ئەگەر قەبیح و کەریهن، ئەگەر شەل و ئەعما**

بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ
لە بێ تەعەسسوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها
کە خۆتی تێ نەگەیێنی، لە نیکتەکانی نەگەی
دەڵیی هەموو هەزەیانە خودا بەڵای لێ دا

زمان بۆ حاجی لە غیابی نیشتیمان و شوێندا، دەبێتە دەسەڵات و پێگە، ئەمەش شتێکە تەنیا ئەوانە لێیدەزانن کە خۆیان سەرڕافی زێر و زیوی قسەن، چونکە تەنیا ئەوان بەهای زمان دەبەنە ئاستی پێگەی پاشایەتییەک کە دراوی خۆی لێدابێت:

بەڵام ئەوانی کە سەرڕافی زێڕ و زیوی قسەن
بە شەە ڕەوایی دەزانن، چ سککەیەکە ڕەوا

لێرەدا بە ڕوونی پەیوەندیی نێوان شوێن (زمان و دەق) و شوناس دەبینرێن. زمان لەبەردەم کاتدا، مانەوە دەستەبەر دەکات، وەکچۆن دراوی پاشایان بۆیان دەبێتە بەڵگەی دەسەڵاتیان و مانەوەیان لە مێژوودا. لەم نێوانەدا حاجی ئاماژەیەکی شاراوەشی بە تەمەنی خۆی کردووە، کە چۆن وەک پاشایەک لە هەنگامەی نەمانیدا، دراوەکانی بۆی دەبنە بەڵگە. بۆیە حاجی لە بەیتی ژمارە (55)دا، کە جوڵەی چوارەمی قەسیدەکەیەتی، ڕووی قسە لە مرۆڤ وەردەگێڕێت و ڕوو دەکاتە خودا کە شیعرەکانی نەکەونە

بەردەستی بەدبەختێک، کە بەهایان نازانێت، چونکە ئەوەی ئەو وەک دراو لە زماندا هەڵیکەندووە، شتێکە دوو پاشای وەک خوسرە و داراش نەیاندیوە:

**ئیلاهی نەیخەیە بەر چەنگی مەندەبووری لەئیم**
**نقوودی حاجی کە نەیدیوە خوسرەو و دارا.**

دوا دێڕی قەسیدەکەشی کە کلیلدانی کۆتاییەتی، دەگەڕێتەوە سەرەتا. ئەو لە سەرەتای دەقەکەیەوە پەنای بردبوو بۆ *بەختی خەواڵووی*، بەڵام لە کۆتاییدا بۆی دەردەکەوێت، بەختی ئەو کەچ و شکاو، بووە. بۆیە ئەو قسە زۆرانەی لە دڵیا بوون و حەکایەتی خۆی پێدەهۆنینەوە و شوناسی خۆی لەسەرەوە دروستدەکردن، لە ئاست ئەم بەختە کەچەیدا کە خامەی شکاندووە، دەبێت بێدەنگ بێت:

**گەلێ قسەم لە دڵا بوو حیکایەتم مابوو**
**کەچی لە بەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا.**

بەمجۆرەش حاجی بەتەواوی دەست لە چوونەوە (ئەولا) و (ڕابردوو)، هەڵدەگرێت، بەڵام هیچ لەبارەی مانەوەی خۆی (لەملا) و (ئێستا)، ناڵێت. کوردستان بۆ ئەو دەبێتە خەون، بەڵام هێشتا بێدەنگە لە ئاست واقیع و هەنووکەی

غوربەتییەکەی لە ئەستەمبووڵ.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم بەسەرهاتە ئاو زۆر دەکێشێت و وێستگەکانی دیکەی پەیوەندیی حاجی بە شوێنەوە، بەردەوامییان هەیە.



## کۆیێ/شار:

لە تەمەنی نۆساڵیدا، حاجی بۆ یەکەمجار دەهێنرێتە کۆیێ، بۆ مزگەوتی موفتی بۆلای (حاجی مەلا ئەحمەدی ئومەرگومەتی) کە خزمی بووەو لەو کاتەدا مەلای مزگەوتی موفتی بووە و حاجیش تەمەنی تەنیا نۆ ساڵان بووە[1]. دەکرێت ئەو ڕاستییە بهێنینە پێشچاو کە ئاخۆ



حاجی قادری مێردمنداڵ، چ هەستێکی بۆ دروستبووبێت، کاتێک ڕووبەڕووی شارێک بۆتەوە کە لە ڕووی شێوەوە تەواو جیاوازبووە لە ناوچەکەی خۆیان. بێگومان ناکرێت یەکسەر حاجی برابێتە مزگەوت و فەرموو دەست بکە بە قورئان خوێندن.. بەڵکو مەودایەکی زەمەنی، ئەگەر چەند

---

[1] ئیدریس عەبدوڵلا ئومەرگومەتی: ویستگەکانی ژیان و.. لە دیداری حاجی قادری کۆیی، تەقتەق. 2016، ل: 91.

ڕۆژێکیش بووبێت، هەلی ئەزموونکردنی شارەکەی بۆ ئەم منداڵە زیرەکە ڕەخساندووە. دیمەنەکانی ئەوسای شارەکە، کۆڵان و جادە، چڕپی دانیشتوان، دووکان و بازاڕچە، پۆلیس و خانوو، منداڵان و جۆری خواردن و هتد. هەموویان هەستی حاجییان لە ئاست شاردا کردۆتەوە. پاشان دەبێت برابێت بۆ مزگەوتی موفتی، کە یەکێکە لە مزگەوتە کۆنەکانی کۆیێ و لە ساڵی 1176ی کۆچیدا(1762ز.)، دروستکراوە[1]، واتە پاش (31)ساڵ لە هاتنی تیرەی دەربەندی بۆ ناوچەی کۆیێ..



لێرەوە شوێن لەپاش ماڵ و بێ ماڵی و ڕەشماڵ و گوند کۆتان و هەوار، بریتیە لە شار و مزگەوت و حوجرە و

[1] کەریم مستەفا شارەزا، نازم حەویزی و ئەوانیتر: کۆیە لە ڕەوتی شارستانیەتدا. هەولێر، وەزارەتی ڕۆشنبیری، زنجیرەی (359)، چاپی یەکەم، 2009، ل: 393. بۆ لێکدانەوەی ساڵەکە پەنام بۆ پرۆفیسۆر د. وریا عومەر ئەمین برد، سوپاسی دەکەم.

شوینگۆڕکێش بۆتە بەشێک لە شوناسی حاجی قادر.. قارەمانی ئەم شوێنگۆڕکێیە، کە لە ژیانی حاجیدا جوڵەیەکی چۆنایەتیە، نەک چەندایەتی، دایکی حاجی خۆیەتی: فاتمەخان، کە لە ئاستە ڕەمزیی و دەروونشیکاریەکەیدا، دەبێتە چەق و پنتی ئاراستەکەری حاجیی بۆ گەیشتنەوەی بە داییک، یان دروستکردنەوەی سیمای داییک لە سێبەری دروستکردنەوەی نیشتیماندا.



وەکئەوەی هەموو هەوڵێکی حاجی بۆ گەیشتنەوەی خەیاڵیانەی بە کوردستان و ماتەریاڵیزەکردنەوەی کوردستان وەک شوێن و بەرهەمهێنانەوەی شوێنەکانی منداڵیی خۆی، ناڕاستەوخۆ، هەوڵدان بێت بۆ گەیشتنەوە بە داییک و دروستکردنەوەی ڕۆڵە مەعنەوییەکەی..

بۆیە هەرچەندە کەم، بە ناو، ناوی بردووە، بەڵام لە نائاگایی ئەودا گرنگییەکی تایبەتی خۆی هەیە. حاجیی

قادر لە شیعرەکانیدا ناوی باوکی و دایکی بۆ تۆمار کردووین:

**باوکم ئەحمەد بوو ناوی، فیکرم دێ**
**خەڵقی لادێ بوو دایکی من فاتێ[1].**

لێرەشدا، دەکرێت بەیتەکە بە چەند شێواز و بە جەختکردنەوەی جیاواز لەسەر وشەکان بخوێندرێتەوە: (باوکم ئەحمەد بوو ناوی، فیکرم دێ/ خەڵقی لادێ بوو دایکی من فاتێ.) ئەگەر لە کۆتایی نیوە بەیتی یەکەمدا فاریزەیەکمان دانا، ئەو کاتە لادێییبوونەکە دەگەڕێتەوە بۆ دایکی و ئاوای لێدێت: (***باوکم ئەحمەد بوو ناوی، فیکرم دێ، خەڵقی لادێ بوو دایکی من فاتێ***). بەڵام ئەگەر ئەو فاریزەیەمان هێنایە دوای وشەی بوو، ئەوە بەمانای ئەوەیە کە باوکی خەڵکی لادێ بووە و دایکیشی ناوی فاتێ بووە: (***باوکم ئەحمەد بوو ناوی، فیکرم دێ خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ***).. خوێندنەوەیەکی دی ئەوەیە کە بڵێین: لەم بەیتەدا، حاجی هەر ئەوەندە لەسەر باوکی دەڵێت کە ناوی ئەحمەد بووە. بەڵام کاتێک دێتە سەر دایکی، لەبارەیەوە دەڵێت: ئەو خەڵکی لادێ بووە و

[1] دیوانی حاجی قادر، ل: 195

ناویشیی بردووە. دەشتوانین وشەی لادێکە بەو جۆرە مانا بکەین، کە شوێنی هەردووکیانە.

بەڵام وەک پێشتریش گوتم، هیچی لەبارەی گوندی (گۆڕقەرەج)ەوە نەگوتووە، ئەوەندە نەبێت کە باسی (لادێ) دەکات بۆ دەستنیشانکردنی شوێنی باوکی یان دایکی. وەسفێکی زۆری سرووشتی شوێنەکانی دەوروبەری کۆیێی کردووە، کە نابێت زۆر جیاوازبووبن لە گوندی گۆڕقەرەج و پێویستە ئەمەشی وەک قەرەبووکردنەوەی ئەو وەسفانەی بۆ حساب بکرێت، کە دەبوو لەسەر گۆڕقەرەج بیانکات. ناوهێنانی باوکی و لەبیرکردنی گۆڕقەرەج ئەوە دەردەخات کە یادوەریی حاجی ڕووداوی مردنەکەی زیاتر تۆمار کردووە، بەڵام ئامادەیی سرووشت و باسی زۆری حاجی قادر لەسەر کۆیێ و دەوروبەری وەک شوێنێکی هەستەکی و بەدەروونیکراو، ئاشکراکەری تێوەگلانی قووڵی هەستەکانیەتی بەو ئەزموونانەی لەو شوێنانە پێیاندا تێپەڕ بووە، بە خۆش و ناخۆشەوە. بۆیە هەر کاتێکیش لە دوورە وڵاتییەوە، (یادوەریی)، لە شێوەی شەپۆلێکی بەهێزدا (شوێنی ڕابردووی)، کە (بەجەستیی بووە) و ئەو ئەزموونانەی بەبیر دەخاتەوە، کە لەو ڕابردووەدا

هەیبوون، (شوێنی ئێستا)ی کە دوورەوڵاتی و شاری ئەستەمبووڵە، لەلا بچووک و بێبایەخ دەکات.
ئەو شوێنانەی حاجی لە دەوروبەری گۆڕقەرەج ناویان دەهێنێت، چ شوێنی نیشتەجێبوون و گوندەکان، چ شوێنی سرووشتی، وەک ناوی چیاکان و چ شوێنی کولتووری و ئایینی وەک ئومەرگومەت، هیچیان بەپێی مەودای ئەوکاتەی حاجی تیایدا ژیاوە لێکترەوە نزیک نین. هەریەکەیان شوێنێکی سەربەخۆ و خاوەن تایبەتمەندیی خۆیەتی. گوندی ئومەرگومەت و مزگەوتەکەی ئێستاش نێوەئاوەدانە، هەروەکچۆن لە کاتی خۆیشیدا ڕۆڵێکی ئایینی و فێرکاریی و کولتووریی خۆی هەبووە.
بەپێی لێکدانەوەی مەسعود محەمەد، حاجی قادر لە گەشتێکی حەوت ساڵی[1]، ساڵی 1853 (کۆیە) جێدەهێڵێت و بەرەو گوندی (شێخ وەتمان) لە ناوچەی (باڵەکایەتی) سەفەر دەکات. ئەمە دووەمین جێگۆڕکێ و ئەزموونکردنی شوێنە لە ژیانی حاجیدا، پاشئەوەی لە گۆڕقەرەجەوە دەبرێتە کۆیێ، کە لە هەمان کاتیشدا، ئاراستەیەکی تایبەت لە ئەزموونیدا ئاشکرا دەکات:

[1] مەسعود محەمەد، بەرگی: 1، ل: 194.

ئاراستەی ژیان لە گوندەوە بۆ شار، لە شارەوە بۆ گوند و پێکەوەبەستنەوەیان.

شتێک هەیە نابێت لە بیریی بکەین: لایەنی کەم دووساڵێک حاجی لە کۆیێ لەگەڵ دایکی ژیاوە، چ لە شوێنێکی تایبەت بە خۆیان بووبێت و بەو دەرامەتە بە کرێیان گرتبێت کە لە مڵکەکانیانەوە بەدەستیانهێناوە[1]، چ لەگەڵ ماڵانیتردا بووبێت. هیچ ڕێی تێناچێت فاتمەخانی دایکی حاجی ژنێکی بەتەمەن بووبێت و چ بەوەدا کە متمانەی بەخۆی بووە و نەیویستووە کوڕەکەی لە خوێندن دوابکەوێت و بەپێچەوانەی کۆنترۆڵی کۆمەڵایەتی ئەوسای کۆمەڵگای کوردییەوە لە شارێکی وەک کۆیێ، گوێی بەوە نەداوە خەڵک چییان بە دایکێکی گەنجی تەنیا گوتبێت لەگەڵ کوڕەکەی ژیابێت. بۆیە دەبێت ژنێکی بوێر و گەنجیش بووبێت. ئەم دوو ساڵ پێکەوە ژیانەی حاجی لەگەڵ دایکیدا، ڕەنگە بەشێکی هەرە خۆشیی ژیانی

---

[1] بەپێی دەستنووسێک، کە نوسخەیەکی کۆپیی لەبەر نووسراوەکەی لەلای منیش هەیە، دەبێت لە لاپەڕەکانی ئەسلی دەسنووسەکەدا، (189-190) نووسرابێت: "حاجی قادر بەخۆی سێ پارچە زەوی لە باوکی یەوە بۆی بە جێ مابوو، بەم ناوانە (قڕقاجین، هاوینەهەوار، زولفەقار)، حاجی هەموو ساڵێک ساڵانەی (خێر و بێری) ئەم زەویانەی وەردەگرت بۆ بژێوی ژیانی". بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵلا ئومەرگومەتی: "وێستگەکانی ژیان و پێگەیشتنی..." لە: دیداریی حاجی قادر، تەقتەق، ل: 91، پەراوێزی ژ. 7.

بوو‌بێت. ڕەنگە حاجی زۆرێک لە تایبەتمەندییە قەلەندەری و نەفسبەرزییەکەشی هەر لە دایکییەوە وەرگرتبێت. بۆیە کاتێک مامۆستا خالید دلێر کتێبەکەی خۆی لە وەڵامی مامۆستا مەسعود محەمەددا پێشکەش بە دایکی حاجی قادر، (فاتمەخانی ئومەرگومەتی) دەکات، شتێکی شایانی کردووە[1].

هەروەها دەبێت ئەوەش لەبەر چاو بگرین، کە مامۆستای حاجی لە کۆیێ ئامۆزای باوکی دەبێت، ئەمەش وایکردبێت ژیانی سوختەیی و فەقێیاتی حاجی، وێڕای باری ئابوورییان، لە ڕووی کۆمەڵایەتی و مەعنەوییەوە، خۆش و ڕێزلێگراوانە بووبێت و هەستی خزمایەتی و پەروەردەی تیرەیی، کە لەسەر بنەمای یەکگرتوویی و

[1] من دوو کتێبی ڕەخنەییم لە وەڵامی سیانەییەکەی مامۆستا مەسعود محەمەددا بینیوە، کە یەکێکیان ئەوەی (عبدولسەتار تاهیر شەریف: حاجی قادر: شاعیری شۆڕشگێڕ و پێشکەوتنخواز و دیموکراتیی نەتەوەی کورد) و ئەوەی دیکەشیان کتێبەکەی م. خالید دلێرە، کتێبی یەکەم بە زمانێکی سایکۆلۆژیی زبر نووسراوە، هەرچەندە گەلێک ڕاستیی ڕووندەکاتەوە. بەڵام گرنگیی ئەمەی دواییان بۆ من لە وردبوونەوەیدایە لە ژیانی کۆمەڵایەتی و دەروونیی حاجی قادر و ڕۆڵیی دایکی لەم نێوانەدا و کتێبەکەش پێشکەش کراوە بە و خاتوونە مەزنە کە ئێمە بە فاتمەخان دەیناسین.. من بۆ پەیداکردنی ئەم کتێبە و زۆرێک لەسەرچاوەکانتر لەبارەی کورد لە ئەستەمبوول، منەتباری بەڕێز (د. نەجاتی عەبدوڵا)م.

پشتگیرییەوە دامەزراوە، لەمەشدا بەفریای حاجی کەوتبێت[1]..

بۆیە بەگشتی دەتوانین بڵێین هاتنی حاجی بۆ کۆیێ هەرچەندە دوای ڕووداوێکی وەک مردنی باوکی بووە و ئەمەش حاجی نیگەران کردووە، بەڵام هاتنەکەی کاریگەرییەکی کولتووریی پۆزەتیڤی لەسەر حاجی مێردمناڵ دانابێت.

بەمجۆرەش، ئەنجامی ئەوە وەردەگرم، کە یەکەمین ئەزموونی هاتنی حاجی قادر بۆ شار، ئەزموونێکی گەشبینانە و گرنگ بووە. ئەم ڕاستییەش لە زۆربەی ئەو شیعرانەیدا بە دیار دەکەوێت کە باسی کۆییێان تیدا دەکات وەک شار و شوێن. هەرچەندە حاجی گلەیی و گازندەو ڕەخنەی توند لە هەندێک لایەنی کۆمەڵایەتی و لە چین و توێژەکانی دەگرێت، بەڵام کۆیێ وەک شوێنێکی پۆزەتیڤ و وەک شارێکی تایبەتمەند لە خەیاڵ و ئەزموونی حاجیدا دەمێنێتەوە. ئەمەش بەو هۆیەوە، کە *شاری ئەوسای کۆیێ ڕەنگە تەنیا هەر بە قەبارە لە*

---

[1] نابێت ڕۆڵی پەروەردەی تیرەی دەربەندی لێرەدا بەرچاو نەگرین. ئەم تیرەیە کە هەمیشە دوژمنی هاوبەشیان هەبووە، ترسی هاوبەشیشیان هەبووە و ئەمەش بنەمای یەکگرتوویی و پشتگیریی ئەوانی بۆ یەکتر، لێکەوتۆتەوە، بەتایبەتیش کە ئەم تیرەیە لەسەر بنەمای ئەنجومەن و پێکەوەیی خۆیان بەڕێوە بردووە.

*ناوچەی دەربەند و گوندەکانی گەورەتر بووە و لە ڕووی کولتووریی و دیمەنی شارنشینییەوە، حاجی قادریان تووشی شۆکی چوونە شار نەکردووە. ئەم شۆکە دواجار لە ئەستەمبووڵ حاجی ڕادەچڵەکێنێت و ترسێکی هەمیشەیی کوردمان لە شار و چوونە شار بەبیر دەهێنێتەوە*، ڕەنگە هەر ئەم شۆکەش بێت وایکردبێت حاجی بۆ هەمیشە بێدەنگ بێت لە ئاست سیما شارستانییەکانی ئەستەمبووڵدا ڕووداوەکانی لە ژێر سایەی سیستەمە سیاسیەکەدا، ڕەهەندە شوێنیەکەی ئەستەمبووڵیان لە پێشچاوی حاجی ونکردبێت..

ئەم بۆچوونە نابێت وەها لێکبدرێتەوە، کە سیمای شارنشینی لە کۆیێ نەبووە، چونکە ئەوێ شوێنێکی شوناسبەخش بووە بۆ حاجی قادر و گەلێک لە سیماکانی ئەو شارە کاریگەرییان لەسەر هەستەکانی حاجی داناوە. بەڵام شارێتی کۆیێ بۆ حاجی شوێنێک بووە بە ئاسانی توانیویەتی هاوشوناسی لەگەڵدا بکات و تا ڕاددەیەک زووتر خۆی لەگەڵدا بگونجێنێت. لە کاتێکدا، پاش چوونی بۆ ئەستەمبووڵ بە بەراوورد بە چوونی بۆ کۆیێ، ڕووبەڕووی جۆرێک لە هەستی ونبوون بۆتەوە لەو شارەدا.

لە شیعری حاجیدا جگە لەوەی چەند جارێکی زۆر ناوی کۆیێ وەک شار هاتووە، ئاواش ناوی گەلێک دیاردە و شوێن و جێگە لە پەیوەندییان بەم شارەوە هاتوون، ئەمە جگە لە تەرخانکردنی زیاتر لە قەسیدەیەک بۆ شاری کۆیێ.

هەستکردنی مرۆڤ لە شاردا جیاوازە لە هەستکردنی ئەو لە گوند و ناو سرووشتدا. شار دیدێکی سەرجەمگیر بە مرۆڤ دەبەخشێت و فێری دەکات شتەکان و دیاردە و ڕووداوەکان و شوێنەکان پێکەوە لە یەک سەرجەمدا ببینێت. "شار شوێنێکە تیایدا دیدار دێتە ئەنجام. لەوێدا مرۆیەکان بۆ پەی بردن بە جیهانی ئەوانیتر کۆدەبنەوە. بەجۆرێک کە "*من لێرەم*" دەبێتە ئاوێنەیەک بۆ پەرچکردنەوەی هەر شتێک کە هەیە و لەخۆی گرتووە و لە نواندنەوەیدا دەیخاتەوە ڕوو"[1].

چوونە شار وەک ئەوەیە پەیوەندییەکانمان بکەینە پەیوەندیی شوناسبەخش لە شوێندا.

هەستکردن بە بەدەستهێنانی شوناسێکی تاکەکەسیانە لە هەناوی ئەندامێتیماندا لە ناو کۆمەڵێکی کۆکەرەوە و دژوازدا، نیشتەجێمان دەکات. بەمجۆرەش شار بەوەی

---

[1] کریستیان نوربری– شولتز: مفهوم سکونت. پێشووتر، ص: 77.

بواری هەڵبژاردنی تاکەکەسیمان دەخاتە بەردەم، هەستێکی پابەندبوونیشمان بەئەوانیترەوە دەداتێ[1].
ئازادیی و جەور، بەشێکن لە کارەکتەری شاری. لە شیعری حاجیدا ئەم دوو جەمسەرە بە ڕوونی دەبینرێت: لەلایەکەوە حاجی هەستکردنێکی پتەوی هەیە بە ئەندامێتی لە شارێکدا کە ئەوی لەگەڵ ئەوانیتر کۆکردۆتەوە و ئەمەش شتێکە بۆ یەکەمجارە لە ژیانی ئەودا و لە پەیوەندیی بە شوێنەوە ڕوو دەدات.
لەلایەکیتریشەوە، ناتەبایی حاجی لەگەڵ کۆمەڵگایەکدا کە بەردەوام گوشارهێنەرە و وزەیەک لە ناوەوەیدا کە دەیەوێت خۆی بێت و هەڵبژاردنی تاکەکەسیانەی خۆی هەبێت، ئامادەییان هەیە. ئەم دیاردەیە لە شیعری حاجیدا دوو ڕاستیمان بۆ ڕووندەکاتەوە. یەکەم ئەوەی کە ئەم شوێنەی حاجی لێوەی قسە دەکات و لەسەری دەدوێت، شارە، نەک ناشار. ئەم خواست و ویست و ئاگاییەی حاجی قادر بەیانی دەکات پەیوەندیی بە هووشیاریی شارەوە هەیە کە تیایدا تاکەکەس لەسەر ئاستی خۆ دەربڕین دەردەکەوێت. دووەم، ئەو ڕاستییەی کە ئەم تێڕوانینە لەسەر شارێکە کە حاجی ئەزموونی کردووە و

---

[1] هەمان سەرچاوە، ص: 78.

ئەمێستاش لە شیعردا بەرهەمی دەهێنێتەوە. بەمجۆرەش نیشتەجێبوون لە شاردا هەر تەنیا کۆبوونەوەی ڕەها نیە بەڵکو بریتیە لە بوون لە جیهاندا، لە شوێنێک و وەک کەسێک[1].

حاجی یەکەم ئەزموونی شوناس وەرگرتنی خۆی لە کۆیێ دەستپێکردووە و لەوێ بە زمانێکی هوشیارانە قسە دەکات و شییدەکاتەوە، نەک زمانێکی بێدەنگی هەستەکیی ڕووت کە تەنیا وەسف دەکات. لە کۆیێ حاجی بەشێوەیەکی ئەندازیارانەتر شوێن دەبینێت. شار بۆ ئەو ئیدی دەبێتە گەڕەک، کۆڵان، سەیرانگا، قەڵا و پەرستگا و شوێنەوار. ئەو پەیوەندییە بێ نێوانەی نێوان مرۆڤ و سرووشت و خۆی لەو بەینەدا لاواز دەبێت. ئەمێستا کولتوور و نەریت و ئەتەکێت و ئەبێ نابێکان دێنە نێوانەوە و دیسپلینی مرۆڤ دەکەن. حاجی بەردەوام ئەم ڕاستیەمان بیر دەخاتەوە، کە چۆن لە ئاست هێزە دیسپلینکەرەکانی کۆمەڵگادا یاخی دەبێت و باکی نیە چیی پێدەگوترێت:

**با بڵێن: ئەم شێتە قەحپە مردووە**

**چەند وەڕیوە، چەند وڕێنەی کردووە**

---

[1] کریستین نوربری شولتز: مفهوم سکونت. ص: 78

من له تۆفانا بەڕی خۆم دەردەکەم
وا مەزانە دامەنی خۆم تەڕ دەکەم

هەرچەندە ئەم دەربڕینانە لە شوێنێکیتر و بۆ شتێکی دی نووسراون، بەڵام دوو ڕەگەزی گرنگ لە کەسایەتی حاجی دەخەنە ڕوو، یەکەم ئەوەی کە خۆیەتی و دووەم ئەوەی کە یاخییە لە هەر شتێک کە بەناوی هەر شتێکەوە بێت دەیەوێت بێدەنگی بکات.

ئەم قۆناغەی ژیانی حاجی پاشتر هەلی ئەوەی بۆ دەڕەخسێنێت پەیوەندیی بە شوێنەوە گۆڕانی بەسەردا بێت لەو ئاستەوە کە پێشتر شوێن زیاتر کاریگەریی لەسەر (هەستەکان)ی حاجی هەبوو، یادوەریی ئەوی دەبزواند بۆ ئەو ئاستەی کە حاجی لە مەبەستێکی (هووشیارانە) و ڕۆشنبیرانەوە شوێنەکان بەرهەم دەهێنێتەوە و باس لە گرنگیەکەیان دەکات بۆ دەستگرتن بەسەر شوناسدا.

لەبەر ئەوەشە کە باسکردنی حاجی بۆ کۆیێ یەک ئاراستە نیە. هەم وەسف و پیاهەڵدان و هەم تانە و ڕەخنە دەگرێتەوە، ڕەخنە و تانەکانی حاجی زۆربەی جاران لە هەندێک دەستە و تاقمی ئایینیی شارەکە و هەندێجاریش لە خەڵکەکەی بە گشتی و چەندجارێکیش لە

کەسانێکی تایبەتە، بەڵام حاجی هەمیشە بەباڵای شارەکەدا وەک شوێن و شارێکی تایبەت هەڵدەڵێت و هەڵوێستی لە ئاستیدا بە نەگۆڕیی دەمێنێتەوە.

کۆی ئەم بەشە لەوەدا کورت دەکەمەوە کە بڵێم: *کۆیێ وێستگەیەکی گرنگە لە ئەزموونی ژیان و لە ئەزموونی شیعریی حاجی قادردا. کاتێک حاجی قادر لەوێ دەژی، تووشی چەندین کێشە دەبێت، بەڵام کاتێک لە دوورەوە بیری لێدەکاتەوە و بەرهەمیدەهێنێتەوە، ئەو کێشانە تا ڕادەیەک لەبیر دەکات و ڕەهەندە کولتوورییی و ڕەمزییەکەی ئەو شارە بەرجەستە دەکات. کۆیێ ژیانێکی پڕ کێشە بە حاجی دەبەخشێت، بەڵام کولتورێکی بەرز و نیشتیمانپەروەرییەکی پتەو دەخاتە دڵ و مێشکییەوە. ئەمەش چەندە زیرەکیی حاجیمان بۆ دەردەخات لە بیرکردنەوەدا، ئەوەندەش ئەو کەشە کولتوورییە دەناسێنێت کە حاجی چاوی تێدا کردەوە و لەگەڵ هاوڕێ و دۆستانی نزیکی کردیانە بناخە بۆ بیرکردنەوەیەکی قووڵ لە نیشتیمان، بەبێ چاوپۆشین لە کەموکوڕییەکانی.*

نمونە شیعرییەکان:

هەروەکو شارانیتر کەس ئاشنای کۆیێ نەبوو

شوهرەتی ئەبیاتی من خەڵکی لەسەر کۆکردەوە

ئاخر ئەم عەقڵەیان هەبوو بۆیێ
گەر سولەیمانییە وەیا کۆیێ

لە مەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ
قوبەی کشمیری دا بەر شەق وەکوو گۆ

کوردەکی کۆیی کەوتەوە یادم
پێم گوت: ئایا چلۆنە ئوستادم

زەمانە تووشی دەرد و غوربەتی کرد
غەمی کۆیێ پەرێشانی هەمووی کرد

وەرە سەیری بزانە لاوی کۆیی
مەهە دانیشتووە یا سەروە ڕۆیی

لە دەوری کوللی باغی شاری کۆیێ
دووسەد بن داری زەیتوونی بە جۆیێ

وەک دەبینین لەم بەیتانەدا و لە کۆی گشتیی ئەو شیعرانەیدا، کە باسی کۆیی تێدا کردوون، زیاد لە دۆخێکی دەروونیی لە کەسایەتی حاجی قادردا دەبینینەوە. ئەو دۆخە دەروونییانەی پاڵنەری خەیاڵی شیعریی حاجی قادر بوون، زۆر و جۆراوجۆرن. لە هەندێکیاندا سەرسام و شانازیی پێوەکەر، لە بڕێکیاندا سۆزدار، هەندێکیان نائومێد، زۆربەیان بە گلەیی و گاهێ ڕەخنەگرانە و گاهێکیش ڕەتکەرەوانە باسی کۆیێ وەک شار و کۆییەکانی کردووە. بەڵام وەک هەمیشە یەک شت بە نەگۆڕیی دەمێنێتەوە: حاجی قادر سرووشت و دیمەنەکانی لە مرۆڤ و پەیوەندییەکانی جیا دەکاتەوە. بیروڕای لەسەر سرووشت ئیستاتیکیانە و ڕۆمانسیانەیە، بەڵام بیروڕاکانی لەسەر مرۆڤ و پەیوەندییەکانی، زۆرجار لە نێوان ڕەخنە و گلەیی و پیاهەڵدان و داشۆریندا ئەمبەراوبەر دەکەن. هەندێک لەمانەش بە تەواوی لە شیعری (لە مەیدانی بەهارا، دیوان، ل: 247)، ڕەنگیداوەتەوە. شیعرەکە چەند جوڵەیەک لە خۆی دەگرێت: سەرەتا لە دیمەنە گشتییەکانەوە و بە خەیاڵێکی ڕۆمانسیانە دەسپێدەکات:

**لەمەیدانی بەهارا شارەکەی کۆ**

قوبەی کشمیری دا بەر شەق وەکوو گۆ
لە مابەینی کەکۆن و هەیبەسوڵتان
نسێ ی ئێوارە و سایەی سبەینان
لەلام زیللی هومایە چەتری سەنبەر
چ جایێ سێبەر و سەرو و سنەوبەر
.....
نمونەی جەننەتە شیوی ڕەزانی
بەهاری شامە ئەیامی خەزانی..
(دیوان، ل: 247-48)

پاشان بەراووردکردنی شوێنەکانی کۆیێ، بە شوێن و جێگەکانیتر بە مەبەستی کەمکردنەوە لەبەهای ئەوان و پیاهەڵدان بە شوێنەکانی ئێرەدا:

دەماوەندیش بە نیسبەت شاخی ئێمە
بەهاری چەشمەساری وشکە دێمە..
(دیوان، ل: 249)

ئەمجا دێتە سەر ئاکار و ئەخلاقیاتی خەڵک و چین و توێژەکانی و وەک دەروونناسێکی کارامە و هاندەری توانای مرۆیی، نەک ڕووخاندنی و تێکشکاندنی، لە خاڵە پۆزەتیڤ و ڕۆحییەتبەخشەکانەوە دەستپێدەکات.

وەکئەوەی حاجی بیەوێت دیدێکی جەوهەرگەرایانەی باش بخاتە ڕوو لەسەر سرووشتی ئەهلی شارەکە، کە تێکەڵێکە لە واقیعبینی و ئیرۆتیزم و ڕەتدانەوە:

ئەهالی ڕۆستەمن وەقتی شەجاعەت
لە حاتەم زێترن وەقتی سەخاوەت
کوڕی غیلمانە عەینی حووری
نەزەربازن وەلێکین دوور بە دووری
بەنیسبەت عیسمەتی مێردی لەگەڵ ژن
ئەقالیمی ترن سەرسۆری بێ بن
موسافیرپەروەر و یاری غەریبن
ئەوانن وا لە هەر عەیبێ بەری بن
لە دینداری فەقێیان وەک چیایە
مەلای بۆ گەنجی دین حاجی قەڵایە
(دیوان، ل: 249)

ئەم دێڕانە گرنگیی خۆیان هەیە، چونکە ڕەهەندی سایکۆلۆژیی خەڵک دەخەنە ڕوو و لەمەشدا حاجی ڕێ لەوانە دەبەستێتەوە کە بۆی هەیە ڕەخنەی لێبگرن و دەڵێت:

مەکەن مەنعم هەموو ڕاستە مەقالەم
بە بورهان و حەیسی فەخری عالەم.

پاشان له جوڵەیەکی دیدا، حاجی ئەم خۆشەویستیە بۆ خەڵک دەبەستێتەوە بە خۆشەویستی نیشتیمان و دەلالەتی شوێن و خاکەوە و دەستنیشانکردنی مەودای خۆی لەو نێوانەدا کە دەکەوێتە نێوان خۆی و ئادەمەوە و ئەمەش دەبەستێتەوە بە پێگەی خۆی وەک غەمخۆری میللەت و بەمەش خۆی جیا دەکاتەوە لە هەندێک لە گەورەکان و شێخە پووچەکانییەوە کە تەنیا لە خەمی خۆیاندان:

**وەتەن مەحبووبەییکە حوجرەئارای**

**نیشانەی دین و ئیمانە تەمەنای**

**لە ئادەم بگرە تا دەورانی ئێستا**

**یەکێکە حاجی لەو خاکە هەڵستا**

**کە غەمخواری بکا بۆ میللەتی خۆی**

**لە بەینی گەورەکان و شێخی بێ ڕۆی**

(دیوان، ل: 250)

تا ئێستا حاجی لە نێوان سێ شوێندا ماوەتەوە، یەکەم سرووشت و نیشتیمان، دووەم دەروونیی خەڵک و سێیەم خودی خۆی. بەمکارەشی جوانیی دیمەنەکانی وڵات و جوانیی ڕەفتار و ئاکاری خەڵکەکەی و جوانیی

نییەتی خۆی پێکەوە دەبەستێتەوە. ڕەقیبی ئەم نێوانەش کات و (زەمانەیە)، کە تووشی دەردی غوربەتی کردووە:

**زەمانە تووشی دەرد و غوربەتی کرد**
**غەمی کۆیێ پەرێشانی هەمووی کرد**

بەڵام هێشتا ئەم پەرێشانی و دەردی دوورییە نابنە هۆی تەسلیمبوونی حاجی و واقیعبینی لەدەست نادات و ڕەهەندی ئومێد لە بیچمی دوو کەسایەتیدا لەبیر ناکات، کە چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت ببنە پشتیوانی میللەت و ڕەگیی بێ ئیتتیفاقی هەڵکەنن. ئەم دەستنیشانکردنەی حاجی بۆ دوو کەسایەتی لە بەرەی ئاغاکان، ئەوە دەردەخات کە حاجی جەوهەری مرۆیی ئەوان دەکاتە پنتی ئومێد نەک پێگە و نیشانی کۆمەڵایەتییان. ئەم ڕوانگەیەی حاجیش تەواو لەگەڵ ئەو ڕوانگە واقیع بینییەیدا وێک دێتەوە کە سەبارەت بە بەرەی ئاییندارانن هەیەتی و هەموویان پێکەوە ناسووتێنێت. وەکچۆن لە ئاست کەسایەتی هەندێک ئاییندارردا لێبووردە و ستایشکەرە، ئاواش نیگا واقعبینییەکەی لە ئاست هەندێ کەسایەتیدا، بینایە، کە پێگەیەکی کۆمەڵایەتیان هەیە و ئەمەش چاونەترسیی حاجیمان بۆ ئاشکرا دەکات و کەسایەتییەکی تاقانە بەو دەبەخشێت و شوێن

عاممەگەرایی سەردەمی خۆی ناکەوێت، ئەمە جگە لەوەی ئەو تەفسیرە چینایەتیانەش لە شیعری حاجی دەخاتە لاوە کە پاشان بۆی کراون:

**دوو ئاغای ماوە وەک بیستوومە ئەخبار**
**ئەمین ئاغا و حەماغای ساحێبی کار**
**ئەمین و پشتیوانی قەسری میللەت**
**نیگەهبانی خەزێنەی دین و دەوڵەت**
**لە دنیادا ئیلاهی هەر بمێنن**
**بنەی بێ ئیتتیفاقی هەڵقەنێنن**

(دیوان، ل: 251)

حاجی ئەم تێڕوانینەی لەسەر چ بنەمایەکەوە هەڵچنیوە؟ بێگومان لەسەر بنەمای تێگەیشتنی ئەو لە مێژوو. ئەو لە چاوگێڕانەوەیدا بە مێژووی نەتەوەی خۆی، یەک هۆکار دەبینێتەوە کە خاڵی هاوبەشی هەموو ئەو کۆژانەیە خۆی و کورد و شار و وڵاتەکەی پێوەی دەناڵێنن:

**لەبەر بێ *ئیتتیحادی* بوونە مسکێن**
**لە ئاخردا وەکوو زانیومە هەڵدێن**
**لە مابەینی کڵاوسوور و کڵاوڕەش**
**پەرێشان و دیارن میسلی گای بەش**
**لەبەر ئەم ناتەبایی و کینەجۆیی**

## لەلای ڕۆمی زەلیلن مەردی کۆیی
(دیوان، ل: 251)

مێژوو پەیوەستە بە شوێن و چالاکیی مرۆڤەوە بەڵام دەبێت ڕووداوێک ڕووبدات تا ئەو چالاکیانەی مرۆڤ پێیان هەڵدەستێت ببنە مێژووی ئەو. ئەم مێژووە بۆ دروستنابێت، چونکە ئەوان بێ ئیتتیفاقن، ملکەچی دوژمنن و ئامانجیان نیە بۆ چوونە ئەو مێژووەوە. حاجی لە "ئیتتیفاق"دا جۆرێک لە بەخودبوون و لە ملکەچییدا بۆ دوژمن، *پەرتەوازەیی* دەبینێت، بۆیە دەیەوێت ئەویان بەهێز بێت و ئەمیان نەمێنێت، ئەمەش لە ڕێگەی یەکخستنی بیر و یەکخستنی هێزەوە:

**وەکوو بیستوومە ئەی یاری نیکۆپەی**
**لە تەئریخی جەم و ئەسکەندەری کەی**
**بە شیر و خامە دەوڵەت پایەدارە**
**ئەمن خامەم هەیە، شیر نادیارە**

دوانەی شیر و خامە، قەڵەم و هێز، یان بیرکردنەوە و دەسەڵات، لە سەرجەم شیعری حاجیدا تەواوکەری یەکترن.

وەک بینیمان لەم شیعرەیدا، حاجی هەردوو ڕەگەزی کات و شوێن بە گرنگ دەگرێت. دەستنیشانی شوێنەکان و کاتەکان دەکات. ناوی شوێنەکان و گرنگییەکەیان تۆمار

دەكات. وەک لە قەسیدەی (گوتم بە بەختی خەواڵوو)شدا هەمان كاری كردووە، لەم قەسیدەیەشدا دوانەی ئاسمان و زەوی، بەرزی و نزمی و سەرەوە و خوارەوە، جوان و ناشیرین و هتد، زەق دەكاتەوە و بەراووردیان دەكات بە شوێنانی وڵات و ناوچەكانیتر، لەم ڕێگەیەشەوە پرۆسەی بە پیرۆزكردن بە چەقكردن بەردەوامیی وەرگرتووە كە پێشتر هۆكارەكانیم باسكرد. لەباسكردنی دیمەنە سرووشتییەكاندا، هەمان خەیاڵی منداڵیی دەرەشار بڕیاردەرە و لە هەمان یادوەریی دیمەنەكانی قۆناغی منداڵییەوە وێنەسازیی دەكات. دەچێتە ناو گەمەیەكی وردەوە لە نێوان ئاستەكانی جوانیدا، جوانیی وڵات و جوانی شوێن و جوانیی دەروونی خەڵک و نییەتی خۆیەوە. بەڵام ئەم جوانیانە ناتوانن بگەن بە كەماڵ و لوتكەی جوانی، چونكە بێ ئیتیفاقی ڕێگرە كە شتێک نیە لە دەرەوەی كوردبوونەوە، هێندەی ئەوەی بەشێكە لە كوردبوون خۆی.

بەم مانایەش لە ڕوانگەی حاجی قادرەوە، كوردبوون بۆخۆی وەكئەوەی كە هەیە، ڕێگرە لەبەردەم چوونە ناو مێژووەوە و ئەمەش هۆكاری یەكنەگرتنەوەی هزر و كردارە. لە كۆتاییشدا حاجی قادر، وەک مەهدی مژدەپێدراو، پێش كاتی وادە دەكەوێت و سەرهەڵدەدات:

**وەزیفەی خۆم بە جێ هێنا تەمامی**
**بە شیر و دەوڵەتە میللەت نیزامی**
**ئەوا خۆی کردە مەهدی حاجی قادر**
**نە نادرشای هەیە و نە شاهی نادر.**

ڕەگەزی هاندان و جۆشدان لە شیعری حاجیدا ڕەگەزێکی نەگۆڕە، چ بۆ بەرپەرچدانەوەی دواکەوتوویی کولتووری کۆمەڵگا بە زانست و خوێندەواری، چ بۆ یەکڕیزیی و ناتەبایی و چ بۆ دەرچوون لە جەبری زەمانە و دەرچوون لە مێژوویەکی سەپاوی داگیرکەران و چوونە ناو مێژووییەکی خۆویست و خۆکردەوە.

زۆربەی دەروونمایەی ئەم تێفکرینەی حاجی لە دۆخی کوردبوون لە شیعرە کۆمەڵایەتیی و ڕەخنەکارییەکانیشی لە چین و توێژەکان دووبارە دەبێتەوە. بەم پێیەش، یەکێتییەکی *بابەتی* لە شیعری حاجیدا، بابەتەکە هەر چییەک بێت، ئامادەیی هەیە، بەبێ ئەوەی ئەم یەکێتیی بابەتە لە هزرینیدا دابڕاو بێت لە شوێن و ئەو جێگایانەی پەیوەندییان بە خاک و مێژووی کوردستانەوە هەیە. یەکێتی بابەتیی ئەوە دەگەیەنێت، کە حاجی لە ڕووی هزریی و ڕۆشنبیرییەوە پێگەیشتوو بووە و دەروونمایەی جیاوازیی شیعرەکانی هەموویان لەم سەرچاوەیەوە ئاو دەخۆنەوە.

پارادۆکسی گەورەی حاجی قادر، یان دژوازیی سەرەکیی بیرکردنەوەی لەوەدایە، کە کۆی ئەم بیرکردنەوەیەی لە نیشتیمان و نەتەوە و مرۆڤ، بیرکردنەوە و هزرینی *تاکگەرایی* شارن. یەکێک لەو هەڵبژاردنانەی شار دەیخاتە بەردەم تاکەکەس بۆ دەربڕینی سۆبژەکتیڤانەی خۆی. ئەستەمبووڵی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم لە ئاستی هزریندا لە بیرکردنەوەی حاجیدا ئامادەییەکی یەکلاکەرەوەی هەیە، بەڵام وەک شوێنێک بۆ ئەزموونکردنی ژیان، ڕەهەندێکی نێگەتیڤ و خراپی وەرگرتووە. *هزرینی شاریانەی حاجی لە بارەی شوناسەوە، هێندەی پایەختێک فراوان و گەشەسەندووە، بەڵام هەر ئەم هزرینە لە پایەختەکە خۆی، هێندە بەرتەسکە، کەمێکی ماوە بیکاتە هێلانەیەکی زەڕنەقووتە!* بەمجۆرەش، بیرکردنەوەی تاکگەرایانەی حاجی لە دۆخی کوردبوون، لە هەمان کاتیشدا دژە شاریانەیە. ڕەتکەرەوەی شار و بەسووک تەماشاکردنێتی. بێگومان ئەمەش تەنیا بۆ شاری ئەستەمبووڵ ڕاستە، دەنا حاجی هەر ئەوکاتەی ئەستەمبووڵ بەو دەردە دەبات، مەدحی شارانیتری جیهانی هاوسەردەمی خۆی دەکات و ستایشی هەستان و خەباتیان دەکات...

## شوێن و شارەکانیتری کوردستان:

سێیەمین ئەزموونی شوێنگۆڕکێ و لەوێشەوە شوێنناسیانەی حاجی لەناوخۆی کوردستاندا، لە ساڵی (1853–1854)وە دەستپێدەکات. سەرەتا بۆ ناوچەی خۆشناوەتی و بەرەو گوندی (هەرتەل). پاشان بۆ ناوچەی باڵەکایەتی و دواییش دەچێتە گوندی (شێخ وەتمان). ئیدی لەوێشەوە بە مەبەستی درێژەدان بە خوێندن، بەرەو شارەکانی خۆرهەلاتی کوردستان:



(سەردەشت و سابلاخ و شنۆ) دەڕوات و پاشان بە دەشتی لاجاندا دێتەوە بۆ کۆیێ[1].

---

[1] لە گێرانەوەی ئەم سەفەرەی حاجیدا، هەر یەکە لە مەسعود محەمەد و کەسانیتریش کەمێک جیاوازییان هەیە. وەلێ ئاراستەی سەفەرەکەی حاجی بەمجۆرەیە کە سەرچاوەی دواتر نوسیویانە. بڕوانە: ئیدریس عەبدوڵڵا ئومەرگومەتی: وێستگەکانی ژیان و .. لە: دیداری حاجی قادری کۆیی، 2016، ل: 97-98.

(پاشماوەی حوجرەی مزگەوتی شیخ وەتمان)



بە تێگەیشتنی من لەم سەفەرانەدا گۆڕانێکی گەورە لە ئەزموونی شوێنناسی حاجیدا ڕوونادات. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەو زیاتر بە خوێندن و خۆقاڵکردنەوە سەرقاڵ بووە. پاشتریش سوودی لەم ڕەوتی سەفەرانەی بۆ وێنەی شیعریی وەرگرتووە و زمانەکەی پێ دەوڵەمەند بووە، وەکئەوەی کە باسێکی نۆستالیژیانەی چوونی بۆ باڵەک دەکات. دەشتی لاجانیش بۆ ئەو وەک وێنەیەکی جاویدانی دەمێنێتەوە و سیفەتی (بەهەشت ئایین)ی پێدەبڕێت. ئەم دەشتە دەکەوێتە ناوچەی خانێ لە ڕۆژهەلاتی کوردستان.



هەندێک گێڕانەوە و تەفسیریش، باس لە ئەزموونێکی سۆزداریی ئەو دەکەن، بەڵام شیعری حاجی گەواهی لەسەر عەشق بۆ ژن و ناسینی ژن نادەن بەدەستەوە. لەو نمونانەدا کە حاجی تیایاندا ناوی ژنیی هێناوە، هەر وەک پیاوێک ئاسایی پەروەردەبووی کولتووری نێرسالاری دەردەکەوێت، کە لە دوورەوە تەماشای ژنی کردووە، نەک ناسیبێتی. هەرچەندە ئەو لە لێکدانەوەیەکیدا بۆ حەدیسێکی پێغەمبەر لەبارەی زانستەوە، ئەم مافە وا لێکدەداتەوە کە نێر و مێ لەو حەدیسەدا جیاوازییان نیە. بەڵام ئەو لە شیعری دیکەیدا کە کورد و نەتەوەی دی کە خۆیان کردووە بە دەوڵەت، بەراوورد دەکا، میللەتانی دی بە (پیاو) و (کورد) بە ژن دەچوێنێت چونکە ناتوانێت دەوڵەت دروستبکات:

ئەوانەی موڵکی خۆیان کردە دەوڵەت
وەکوو بت دەیپەرستن جەمعی میللەت
میسالی ئێوە بوون یاخود وەکوو من
ئەوان بۆچی پیاون، ئێمە وەک ژن
(دیوان، ل: 256).

ئەمە جگە لەوەی ئەوکاتەش کە ئەو دەچێتە ئەسەمبووڵ هەر خۆی وەک پیاوێک دەناسێنی کە لە (شاری ژنان)دایە. هەموو ئەمە پێماندەڵێت، لە شوێنگۆڕکێی حاجیدا بۆ شوێن و شارەکانیتری کوردستان، ئەو لە هەمان فەزای کولتووری تەقلیدیدا دەمێنێتەوە. لەم شوێن و شارانەش، هەرچەندە حاجی بەشێوەیەکی ڕێژەیی شیوازە ژیانی کولتووریی دیکە ئەزموون دەکات، بەڵام لە هەمان کەشوهەوای کولتووریی ژیانی مزگەوت و فەقێیایەتیدا ماوەتەوە. ئەمەش ئەوە دەردەخات، هەرچەندە حاجی شوێنگۆڕکێی کردووە و خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە، بەڵام لە زۆر ڕووەوە کاریگەریی هەمان کەشی کولتووریی مزگەوت و حوجرەنشینی نێرسالارانەی لە ئاست ژندا، تێدا ماوە و زیاتر لە ڕووی فیکرییەوە خۆی دەوڵەمەند کردووە.

ئەڵبەتە حاجی لەو شیعرانەشی هەن کە تەمەننا و خۆزگەیەکی سێکسواڵییان تێدایە، بەڵام ئیرۆتیکی نین.

## گەڕانەوە بۆ کۆیێ:

گەڕانەوەی حاجی بۆ کۆیێ، گەڕانەوەیەکی ئاسایی نەبووە. ئەو بە گەنجایەتی ڕۆیشتووە و بە کامڵی گەڕاوەتەوە. بە فەقێیەتی ڕۆیشتووە و بە مەلایەتی هاتۆتەوە. لە جەستە و هزریندا بۆتە مرۆڤێکی دی، بڕوابەخۆبوونی زیادی کردووە و چاوەڕوانیشی لە خۆی و دەوروبەری زۆر چۆتە سەر. هەرچەندە هاوڕێی نزیکی هەبوون و لەگەڵ یەکتردا خۆشیان بەسەر بردووە، بەڵام کولتووری باوی شارەکەی گۆڕانێکی ئەوتۆی بەسەردا نەهاتووە و ئەمەش ناکۆک بووە لەگەڵ چاوەڕوانییەکانی. کێشەکەشی لەگەڵ (شێخ نەبی ماویلانی)، ڕووی لە ئاڵۆزیی کردووە. هەڕەشەی هاتۆتە سەر و پێدەچێت دۆستانیشی دنەیان دابێت کۆیێ بەجێبهێڵێت و هەندێک لەوانەش کە گوایە پشتگیر و دۆستی بوون، بۆ ڕازیکردنی شێخی ماویلانی، پشتیان تێکردبێت. لێکدانەوە و پرسیارە گوماناوییەکانی مامۆستا خالید دلێر، لەبارەی پشتگیری هەندێک دەسەڵاتدارانی کۆیێ بۆ حاجی، ڕاستییەکی زۆریان تێدایە. ئەگەر ئەو کەسانە لە بنەماڵە

دەسەڵاتدارەکانی کۆیێ بە ڕاستیی دۆست و پشتیگریی حاجی بوون، بۆچی لە ئاست ئەم کێشەیەیدا بێدەنگەیان لێکردووە و بێهەڵوێست بوون[1]. بۆیە، "پاش ماوەیەک کە حاجی سەرنج دەدات، دوای ئەو هەموو خەمخۆرییەی بۆ خەڵکی کۆیێ هەیەتی، کەچی دەبینێ خەڵکی هەمووی ڕوویان لە هەندێ شێخی وەکوو (شێخ نەبی ماویلانی)یەو بەرامبەر بە شاعیر و خەمخۆرێکی وەکوو خۆی کەمتەرخەمن و ئەم کەمتەرخەمییەش لە ڕووی سۆزی شاعیرانەیەوە بە بێ حورمەتی دادەنێ. بۆیە بڕیار دەدا کۆیێ جێ بێڵێ و ڕوو بکاتە شاری (ئەستەمبوڵ)ی پایتەختی سەڵتەنەت و خەلیفایەتی عوسمانی"[2].

هۆکارەکانی ئەم بڕیارەی حاجی هەندێکیان کردەیی و هەندێکیان هزرین. لە ڕووی کردەییەوە، پێدەچێت حاجی ئاسانتر توانیبێتی بگاتە ئەستەمبووڵ، تاکو شارانیتری وەک بەغدا، شام و هتد، چ لە ڕووی ئابوورییەوە و چ لە ڕووی جوگرافییەوە. پێدەچێت هاندەرەکانی بۆ چوونە

---

[1] بڕوانە کتێبەکەی خالید دلێر: ستەمکردن لە حاجی قادری کۆیی تاوانە. 1988، سلێمانی، چاپخانە و ئۆفیسی سەفووەت. لە چەندین پەرەگرافدا بە وردیی لەمبارەیەوە دواوە و گومان دەخاتە سەر لێکدانەوەکانی مەسعود محەمەد.

[2] ئیدریس عەبدوڵا: *وێستگەکانی ژیان* و، سەرچاوەی پێشوو، ل: 98

ئەوێ زیاتر بووبن، وەک بوونی پێشتری (کەیفی)ی شاعیر و هاوڕێی لەو شارە. ئەمە جگە لەوەی کە دەستەبژێری کورد لەو سەردەمەدا ڕوویانکردۆتە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و وەک شتێکی باوی لێهاتووە. سەدەی نۆزدەهەم بۆخۆشی سەدەیەکە لە جێگۆڕکێ و سەرەتاکانی مۆدێرنیتەی کۆچەری و نۆمادیزم.

بەڵام هۆکاری ڕاستەقینەی بڕیارەکەی حاجی، زیاتر کولتووری و هزری بووە. تۆران و خۆنەگونجاندنی حاجی لەگەڵ ئەو کولتوورە سەردەستە لۆکاڵییەی ئەوسای کۆیێ و بڕیاردانی بە ڕەتکردنەوەی و دڵنیابوونی لەوەی کە بۆخۆیی و چەند هاوڕێیەکی مننەوەریی بەتەنیا و بەبێ پشتگیریی کەسانی بەدەسەڵات، هەرچەندەش بتوانن درێژە بە پەیوەندییەکانیان بدەن، هێشتا ناتوانن باڵادەستیی خۆیان بسەپێنن و کولتوورێکی سەردەستە دروستبکەن، لەمەدا گرنگیی تایبەتیان هەبووە لە بڕیارەکەیدا.

ئاسۆی بیرکردنەوەی حاجی فراوانتر بووە لەوەی بتوانێت لە چوارچێوەی باڵادەستیی ئەو کولتوورە باوەدا خۆی بگونجێنێت و ملکەچی بێت. ئەو ئیدیی ئەو نەریتی خۆگونجاندنە ڕەتدەکاتەوە کە بەشێکە لە کولتووریی

تیرەکەی لە پێناوی مانەوەیاندا. نەبوونی پشتیوان و پێگەیەکی دەسەڵاتیش لەمەدا یەکلاکەرەوە بوون. ڕەتکردنەوەی ئەو کولتوورە لەلایەن حاجییەوە و مانەوە و باڵادەستی ئەو چین و توێژانەی لەبەرژەوەندییاندا بووە باردوخەکە بەو جۆرە بمێنێتەوە، هاوکات بە هووشیاریی حاجی لە بارەی چەوساندنەوەی خەڵک بەدەستی ئەو کەسانە، لە شیعرەکانیدا، گەواهیی ئەم بۆچوونە پتەو دەکەن. لە سەروو هەموو ئەوانەشەوە، حاجی قادر لە چەند شوێنێکی شیعرەکانیدا ئەو حەز و خولیایەی کوردەکانی بۆ چوونە ئەستەمبووڵ، وەک شوێنێک کە سەرسوورمانی ئەوانی بەدوای خۆیدا هێناوە، بەرجەستە کردووە. پێدەچێت هەر ئەم سەرسامییەش تا لە کوردستان بووە، لەلای حاجی هەبوو بێت. بەڵام کە چۆتە ئەو شارە، گۆڕانێکی گەورە بەسەر بیروڕای حاجیدا هاتبێت لەبارەی ئەستەمبووڵەوە..

# بەرەو ئەستەمبووڵ

ناتوانم هیچ لەبارەی ئەو شوێنانەی کوردستانەوە بڵێم کە حاجی قادر دوای جێهێشتنی کۆیێ، لێیانەوە و پیایاندا سەفەرە ناچارییەکەی کردووە بۆ ئەستەمبووڵ. ناچاریی شێوازی دەربەدەریانەی جێهێشتنی کۆیێ و نەبوونی شوێنەواریی ڕەوتی ئەم کۆچە لە شیعری حاجیدا، ڕێگەی ئەوەمان لێدەگرێت هیچی ئەوتۆی لەبارەوە بڵێین. تەنیا ئەوەندە نەبێت، کە زانیارییە زۆرەکانی حاجی لەبارەی کوردستانی گەورەوە، بەتایبەتی باکوریی کوردستان و میرنیشەکان و مێژووی ئەو ناوچە بەرفراوانە و شار و شوێنەوارە مێژووییەکانی، سەرە داوی ئەوەمان بدەنێ، کە ئەگەر بەشێکی ئەم زانیاریانە لە هووشیاریی و ئاستی ڕۆشنبیریی مێژوویی حاجییەوە بن، ئەوە دەبێت شتێکیشمان لەسەر ڕەهەندی کردەیی و گەشتی حاجی بەو ناوچانەدا بۆ ڕوونبکەنەوە، کە هیچ بەڵگەیەکشمان بەدەستەوە نیە جگە لە بۆچوونی تایبەتی.

بویە ئەم بابەتە لەم توێژینەوەیەدا هەڵدەپەسێردرێ تا ئەو کاتەی کەسانێک لەمبارەیەوە بەڵگەی مێژوویی دەخەنە ڕوو، تا ڕوونببێتەوە ئاخۆ حاجی بە کوێدا

گەیشتۆتە شاری ئەستەمبووڵ و پێش ئەوێش سەفەری کوێی دیکەی کردووە.
لەولای دیکەوە، ئەوەندەی لە شیعری حاجی قادر ورد دەبمەوە، لە ئاستی میتافۆریدا هەمیشە بە شێوەیەکی قۆشمەیی دەتوانین بپرسین: ئایا حاجی هەرگیز چووە بۆ شاری ئەستەمبووڵ؟ ئەستەمبوڵێک کە حاجی قادر سەفەری بۆی کردبێت و یەک تەمەن تیایدا مابێتەوە، لە ئەزموونی شیعریی ئەودا، وەک شارێک، لە کوێیە؟
شاری ئەستەمبووڵ، کە بەپێی ڕای گشتی توێژەران، لە گوزارەی "eis ten polin"ـەوە، وەرگیراوە کە مانای (بەرەو شارەکە)[1]، یان (بەرەو شاری ناو شوراکە)[2] دەگەیەنێت، لە مێژووی شارستانییەتدا چەندین ناوی هەبووە و هەر چەند قۆناغێک، پەیوەست بەوەی کێ حوکمی کردووە، ناوەکەشی گۆڕدراوە. سلاڤییەکان پێیان دەگوت: زارگراد، یان شاری ئیمبراتۆر. لەلای گەلانی باکووری ئەوروپا و بە زمانی دێرینی سکەندناڤیا، بە میوکلەگۆرد

---

[1] برنارد لويس: أستنبول و حضارة الخلافة الاسلامية. تعريب مع تعليقات نقدية و ايضاحية مفيدة. د. سيد رضوان علي. دار السعودية للنشر و التوزيع. الطبعة الثانية. 1982. ص: 11-12.

[2] اندرو ويتكروفت: العثمانيون: تفكيك الصور. مركز الامارات للدراسات و البحوث الاستراتيجية. ط: الاولى: 2014. ص: 160

(Myklagaard)، یان شارە گەورەکە ناوی براوە[1]. یۆنانیی و ڕۆمانییەکان پێیاندەگوت: بیزەنت (Byzantium) و (ڕۆمای نوێ) و پاشانیش بە ناوی قوستەنیتن شاوە پێیاندەگوت: (Constantinupolis)، واتە شاری قوستەنتین، کە ساڵی 330ی زاینیی کردییە پایتەختی ئیمبراتۆرییەکەی خۆی[2].



شوێنی شارەکە زۆر پێش ئەم مێژووە و ئەو ناوانەی وەریگرتووە، جێگەی نیشتەجێبوون بووە. ئەو شوێنەوارانەی لە بەشی خۆرهەڵاتی شارەکە دۆزراونەتەوە دەگەڕێنەوە بۆ ساڵانی 5500 بۆ 350ی پێش زایین. بەندەری شارەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فینیقیەکان و پاشان یۆنانییەکانی خەڵکی میگارا لە ساڵی 685ی پ.ز.دا داگیریان کردووە[3].

---

[1] J. J. THOMÆUS: Chbistianstad 1835, s: 190-191

[2] برنارد لويس: أستنبول و حضارة الخلافة الاسلامية. ص: 12

[3] http://www.marefa.org/index.php/.

بەمجۆرەش، هەر یەکە لە یۆنانی و ڕۆمانییەکان چەند جارێک شارەکەیان کردۆتە پایتەختی خۆیان تا لە ساڵی 1453 ز. دا و لە لایەن سوڵتان (محەممەدی فاتیح)وە بەتەواوی داگیر کراوە و کەوتۆتە ژێر دەستی تورکانی عوسمانی[1].

بەپێی گێڕانەوەکانی بێرنارد لویس، کە ئاماژەی زۆریش بۆ سەرچاوە لاتینی و عوسمانیی و عەرەبییەکان دەکات، سوڵتان محەمەد هەر تەنیا شارێکی نیمچە وێرانی نەخستە ژێر دەستی خۆیەوە[2]، بەڵکو بەسەر شارێکی یەکجار دەوڵەمەندیشدا لە ڕووی فرەکولتوورییەوە، کەوت، کە پڕ بوو لە شوێنەواری یۆنانیی و ڕۆمانی و بیزەنتیی کۆن و ئارامگا و پەرستگای دینە فرەخوداکان و



دینی مەسیحی تێدابوون[3]. ئەمە جگە لە جۆراوجۆریی دانیشتوانەکەی کە زۆربەیان

[1] *Magnus Västerbro: ttp://www.altomhistorie.dk/artikler/konstantinopel.*

[2] برنارد لويس: أستنبول و حضارة الخلافة الاسلامية. مصدر السابق، ص: 131.

[3] http://www.marefa.org/index.php/.

یۆنانی بوون و پێش داگیرکردنی شارەکە لەلایەن سوپای عوسمانییەوە، کۆچیان کردبوو و پاشانیش گەڕابوونەوە شوێنی خۆیان.

هاوکات بەوەش، شارەکە ژمارەیەکی زۆر یەهوودی و ئیتالی و پورتوگالی تێدابوون کە لە شوێنەکانی دیکەی ئەورووپاوە لەسەردەمی حوکمی بێزەنتییەکانەوە، لە ژێر ستەمی مەسیحییەکان بەدوای شوێنێکی دڵنیادا، پەنایان بۆ ئەوێ بردبوو[1]. عوسمانییەکان بۆخۆشیان هەر لەسەرەتای داگیرکردنی شارەکەوە، هاندەری ئەوە بوون کە خەڵکانێکی جیاواز بێنە ئەستەمبووڵ و تیادا نیشتەجێ ببن[2]. بۆیە لەگەڵ داگیرکردنی شارەکەدا، سوڵتان "دیموگرافایی شارەکەی گۆڕی و بۆ ئەمەش یاسا و دەستوورگەلێکی دەرکردن"[3]. بەپێی بەڵگەنامەیەک کە لەساڵی 1478ی زایینیدا نووسراوە، تیادا ژمارەی ئەو خێزانانە تۆمار کراون کە لەو شارە و غەلاتیادا ژیاون. ئەو بەڵگەنامەیە دەریدەخات کە لە ئەستەمبووڵ: (8951 خێزانی مسوڵمان، 3151 خێزانی یۆنانی، 1647 خێزانی یەهوودی، 267 خێزان لە نیوەدوورگەی قەرم، 372

---

1 برنارد لويس: أستنبول و حضارة الخلافة الاسلامية. مصدر السابق، ص: 135.

2 برنارد لويس: نفس المصدر، ص: 132

3 Kadri Yildrim: **Xaniye Duyem (Haci Qadire Koyi)**. Istanbul. Avesta, 2016, I: 63-64

خێزانی ئەرمەنی، 384 قەرمەنلیە و 31 خێزانی ئالنور ژیاون)[1].



لە هەموو ئەمەوە دەکرێت ئەو ڕاستییە بەدەست بهێنین، کە شارەکە بە هۆی ئەم مێژووە دەوڵەمەندەیەوە، پێگەیەکی کولتووریی ئەوەندە بەهێزی هەبووە، عوسمانیەکان نەیاندەتوانی هەروا بە ئاسانیی بیسڕنەوە و شوناسی خۆیانی پێ ببخەشن و تەنانەت ناوەکەشی بگۆڕن. هەرچەندە بۆماوەیەک لەسەر پارەی عوسمانی ناوی (ئیسلامبول) بەمانای ئاوەدانیی ئیسلام یان (مەعموورەی ئیسلام)، دەردەکەوێت، بەڵام لە زۆربەی

---

[1] برنارد لويس: نفس المصدر، ص: 133

ئەو ماوەیەدا، سوڵتانە عوسمانییەکان بە پێچەوانەی بەکارهێنانی خەڵکی عاممەوە، بۆ ناوی ئەستەمبووڵ لە قەڵەمڕەوەکەیاندا، ناوە مێژووییەکەی شارەکەیان وەکخۆی هێشتەوە، کە **قوستەنتینییە** بوو. هەرچەندەش بە چەندین شێوازی شیعری و ئایدیۆلۆژی وەک: (ئاستانە و دار ئەلسەعادە)، ناویان دەبرد[1].



چیرۆکی ژمارەی دانیشتوانیش لە ئەستەمبووڵ، زۆر شتمان بۆ ڕووندەکاتەوە. هەرچەندە تاکو ساڵانی سیی سەدەی نۆزدەیەم ژمارەی دانیشتوانەکەی ئەم شارە، وەک سەرجەمی قەڵەمڕەوی عوسمانی لە ناکۆکیی و بەرزی و نزمیدا بووە. بەڵام لەدوای ئەو ساڵانەوە ژمارەی دانیشتوانی چ لەناو عوسمانی و چ لە بەرەی ئەو

---

[1] برنارد لويس: أستنبول و حضارة الخلافة الاسلامية. مصدر السابق، ص: 12

میللەتانەی داگیرکرابوون و بە (ڕەعایا)، ناو دەبران، بە ڕێژەیەکی زۆر زیادی کردووە[1].



گومان لە زۆریی مەدرەسەی ئایینی و مزگەوت و دامەزراوەی ئایینی مسوڵمانان و ژمارەیەکی زۆری فەقێ و قوتابیی لە قوستەنتینیە ناکرێت، بەڵام ئەم شارە هەرگیز بە تەنیا شارێکی ئیسلامیی نەبووە و مسوڵمانەکانیش هەمیشە زۆرینەی دانیشتوانەکەی نەبوون. بەپێی هەندێک سەرچاوە، هەتاکوو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم، نزیکەی (400000) کەس لە ئەستەمبووڵ ژیاون[2].بەڵام ساڵانی پاشتر، بەهۆکاری جۆربەجۆر (کۆچی ناوەکی، باشبوونی باری تەندروستی،

---

[1] خلیل انجالیک (محرر): التأریخ الآقتصادی و الآجتماعی للدولة العثمانیة. المجلد الثانی (1600-1900)، ت: د. قاسم عبدة قاسم. دار المدار الآسلامی. بیروت-لبنان. 2007. ص: 513.

[2] اندرو ویتکروفت: العثمانیون: تفکیک الصور. 2014. ص: 168

هیوریی و ئارامبوونەوە)[1]، ئەم ژمارەیە زۆر زیاتری کردووە. لە ساڵانی 1830 بۆ 1840 لە ئەستەمبوولدا تەنیا (375)هەزار کەس ژیاون، بەڵام ئەم ژمارەیە لە ساڵی 1890دا دەگاتە نزیکەی (900)هەزار کەس.[2] لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتاکەش مسوڵمانان لەڕووی ژمارەوە سەردەستە نەبوون و ژمارەی مسوڵمانان (384836)، بەبەراوورد بە ژمارەی مەسیحییەکان (444294) کەمتر بوون، ئەمە وێڕای ئەوەی ژمارەی یەهوودییەکانیش لە (22394)کەس کەمتر نەبوون[3].

بەمجۆرەش، لە ساڵی 1876 تاکو 1896، لەو ماوەیەدا، زیاتر لە ملیۆنێک مسوڵمان لە ناوچەکانی باڵکان و خوارووی ڕووسیا و کوردستانەوە ڕوویان کردۆتە ئەستەمبووڵ و لەم دیو و لەو دیوی شورای شارەکەوە نیشتەجێ بوون[4]،



[1] خلیل انجالیک (محرر): التأریخ الآقتصادی و الآجتماعی للدولة العثمانیة، ص: 513.

[2] خلیل انجالیک: التأریخ الآقتصادی و الآجتماعی للدولة العثمانیة. ص: 520

[3] اندرو ویتکروفت: العثمانیون: تفکیک الصور. ص: 186

[4] اندرو ویتکروفت: ص: 186.

دانیشتوانە مسوڵمانەکەی هێشتا هەر لە کەمایەتیدا بوون. ئەوە تەنیا لە ماوەی "چارەکیی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدایە، کە قوتابیانی ئەستەمبووڵ خۆیان بە سەرەڕمبی ئیسلامیی جیهادی هەژمار دەکەن" و لە دژی هاتنەناوەوەی ئەورووپا و بەئەورووپاییکردنی وڵاتەکە خۆیان دەنوێنن[1].

بەمجۆرەش، کولتوور و شاری ئەستەمبووڵ بەردەوام سیما هەمەڕەنگ و دەسەڵاتە ناوەکییەکەی خۆی بۆ مانەوەی وەک شارێکی مێژوویی و فرەکولتووری دەپارێزێت و وەک شارێکی جیهانی دەمێنێتەوە، بە جۆرێک تەنیا لە 28ی مارسی 1930دا، دەسەڵاتدارانی تورک فەرمانیان دەرکرد تا شارەکە بە هەمان ناوەوە ناوببرێت، "کە لە سەدەی دەیەمەوە پێوەی ناسرا بوو، بۆ ئەوەی ببێتە ناوی فەرمیی شارەکە لە تەواوی زمانەکانی جیهاندا"[2]

ئەم ڕاستییە سەبارەت بە بەکارهێنانی ناوی شارەکەش لەلایەن مسوڵمانەکانەوە، زۆر شتمان بۆ دەسەلمێنێت. چونکە مسوڵمانەکانیش، بە تایبەتی لە مێژوونووس و جوگرافیزانەکانی سەدەی دەیەمی ز. بە پەیڕەویکردن لە

[1] اندرو ویتکروفت: ص: 183.

[2] https://ar.wikipedia.org/wiki.

بێزەنتییەکان، هەر بە (شارەکە he polis)، ناویان دەبرد[1]، کە (قوستەنتینییە) بوو. ئەمەش پێگەی شارستانیی شوێنەکە لە خەیاڵدانی مسوڵماناندا وەک شارێکی یۆنانی، ڕۆمیی ڕووندەکاتەوە.

هیچ گومان لە چوونی حاجی بۆ ئەستەمبووڵ ناکرێت، بەڵام ئەو هەرگیز ئەم ناوەی بۆ ئەو شارە بەکار نەهێناوە و بە زمانیدا نەهاتووە. حاجی لەمەشدا هەڵوێستێکی خۆی نواندووە و نەیویستووە بە زمانی خەڵکی عاممە لە قەڵەمڕەوی عوسمانیدا، ناوی ئەو شارە بهێنێت، دەنا دەبوو جارێکیش بێت بە (*ئیسلامبول، ئیستەمبول، ئەستەمبووڵ، ئاستانە، دار ئەلسەعادە، بابی عالی* و هتد)، ناوی ئەو شارە بهێنێت کە زیاتر لە سیی ساڵ لە تەمەنی خۆی تێدا بردۆتە سەر: (1864-1897). هەڵوێستی حاجی لە ناوهێنانی شارەکەدا، لەگەڵ هەڵوێستی فەرمیی عوسمانییەکان تەبایە، چونکە ئەویش هەر ناوە مێژووییەکەی شارەکە، کە (*قوستەنتینیە، ڕۆما، ڕۆم*)ە، بەکار دەهێنێتەوە، بەڵام کولتووریی شارەکە و پێگە ژیارییەکەی ڕەتدەکاتەوە شارەکە دەکاتە بارمتەی

---

[1] برنارد لويس: أستنبول و حضارة الخلافة الاسلامية. نفس المصدر، ص: 11.

ئەو دژایەتیەی بۆخۆی لەگەڵ عوسمانییەکان هەیبووە. بەمجۆرەش، شوێنایەتی شارەکە بە بارودۆخەکەیدا، هەڵدەسەنگێنێت. واتە شوێن (Place) بەوەدا دەبینێت کە چی لەسەر ڕوودەدات و لە چ بارودۆخێکدایە (situation) نەک لە خۆیدا چۆنە. وەکئەوە ویستبێتی لەم ڕێگەیەوە هەڵوێستەکەی لە دژی دەسەڵاتی خوێنستانەی عوسمانییەکان بۆ حسێب بکرێت.

ئەم هەڵوێستەی حاجی ئەگەرچی لە خۆیدا ناتەبابە، بەڵام لە جەوهەردا ئەوەندە بەنرخ و گەورەیە، کە دەبێت تێگەیشتنێکی قووڵی لە پشتەوە بێت. ئەمەش بەو مانایەی ئەم هەڵوێستە نە پەرچەکردارێکی سایکۆلۆژییە، نە ڕق و کینە. بەڵکو هەڵوێستێکی هزرییە لە ئاست (ئەویتر)ێکدا کە مامەڵەکردنی بە شارەکەوە لە باڵادەستی و ئینتیمای ئایدیۆلۆژییەوە بووە، نەک ناونانی شوێنێکی شارستانیانە و ئۆربانیستی. ڕەنگە حاجی قادر هیچی ئەوتۆی لەبارەی ئۆربانیزم و ناونانی شار و تەلارسازیی شارەوە نەزانیبێت، بەڵام بە وردیی لە نییەتی ئایدیۆلۆژیی عوسمانییەکان بۆ گۆڕینی ناوی شارەکە و هەوڵدانیان بە ئیسلامیزەکردنی و دواجار بە عوسمانیزەکردنی تێگەیشتووە. لە ئەنجامی ئەمەشەوە، بڕیاری داوە بەشداریی نەکات لە دووبارەکردنەوەی هەمان ناودا کە

چونە ژێر باری دەسەڵاتەکە و ستایشکردنێتی لە ئاستە ئایدیۆلۆژییەکەیدا بە زمانی گشتی و عاممەگەرایی. بۆیە لە ناوهێنانی شارەکەدا چۆتەوە سەر ناوە مێژووییە، یۆنانی ڕۆمییەکەی و لە سەراپای دیوانەکەیدا، ئەوێ بە (*قوستەنتینیە، ڕۆما، ڕۆم*) ناو دەبات و قووڵایی ژیاریانەی شارەکە لەوێدا دەبینێت.

لەم هەڵوێستەشیدا حاجی هیچ نەبێت ناوە عوسمانلییە تورکیەکانی شارەکە لە بیری کورد دەباتەوە، هەروەک چۆن ئەزموونکردنیشی وەک شوێن و شارێک دەخاتە پەراوێزەوە، بە ئەندازەیەک وا بزانین ئەو هەرگیز لەوێ نەبووە. لێرەشدا ئەو دڵسۆزیی بۆ میللەتەکەی پێش دڵسۆزیی و خۆشژیانی خۆی خستووە. ئەم هەڵوێستەشی لەگەڵ کۆی ئەو هەڵوێستانەی دیکەیدا لە ئاست ئەم شارەدا، بە تایبەتی وەکئەوەی لە شیعری (قسەیەکم هەیە دەیکەم) و هەندێ بەیتی دیکەیدا، کە سەرکۆنەی کوردان و شارەزووریان دەکات، کە بۆچی خولیا و خەمیان بۆتە ئەوەی بچنە ئەستەمبووڵ و بۆی دەگرین، یەک دەگرێتەوە.



دوو قەڵەمکێشی ژیان و کار لەسەردەمێکدا حاجی قادر لە ئەستەمبووڵ بووە و باری چینە هەژارەکە ڕووندەکەنەوە.



# (ڕۆما)ی حاجی قادر

من تەنیا ئەو نمونانە باس دەکەم کە ئەستەمبووڵ وەک (ڕۆما)، یان (قوستەنتین و قوستەنتینیە) ناوی هاتووە، حاجی شیعری دیکەیشی هەیە کە ناوی شارەکەی نەهێناوە، بەڵام ناڕاستەوخۆ باسیی دەکات و لە ڕێگەی وشەکانی وەک (دەوڵەت، خوێندن، نیزام، پێشکەوتن، مەدرەسە، ئیڤڵ) و گەلێک وشەی دیکەوە، شارمان بیر دەخاتەوە. باسی ئەو شیعرانەشی کارەکەی من زۆر دوورودرێژ دەکات و ئەوە جێدەهێڵم بۆ کەسانیتر. بۆیە سەرەتا ئەو نمونانە دەهێنمەوە کە حاجی تیایاندا ناوی شارەکە بە (*قوستەنتەنییە* و *قوستەنتین*)، یان (*ڕۆما* و ڕۆم) دەهێنێت. پاشانیش هەوڵدەدەم بە پێی توانا لە دەلالەتەکانی پشتەوەی ئەم ناوبردنە تێبگەم و لە سەر ئەوەشەوە، لە دیمەنێکی گشتیتردا بۆچوونی حاجی لەبارەی ئەم شارەوە بەرهەم بهێنمەوە:

نمونەکان:

سەوادی ئەعزەمی قوستەنتەنییە
گەلێ بێ ناوی کردە سەدری ئەعزەم (ل: 83)

مەڵێن بێکارە بوو حاجی لە ڕۆما
ئەمن پیاوم لە نێو شاری ژنانم (ل: 85)

یەکتان نەچوونە گەردش وا تێ دەگەن لە دنیا
هەر پادشای ڕۆمە و شاهی عەجەم لە تاران (ل: 97)

لە ڕۆما کەوتە بەرچاوم کەسێکی هائیم و حەیران
بە هەیئەت تێگەییم کوردە بە شێوەی ئەهلی کوردستان
(ل:100)

لە "کوێرە دێ"یێ کە "کەیفی" تیابێ فیردەوسە
جەهەننەمە کە نەما "کەیفی" شاری قوستەنتین (ل:106)

وەلێ کوڕانی ڕەزا نین بە خاکی ڕۆم و دەڵێن:
لەلای ویلایەتەوە چاوەنۆڕی مامی ترین (ل: 109)

میسلی شەراری کاغەزە سووتاوە عومرمان
ڕۆمی کە دەفع بوو گرێی دڵ دەفع دەبێتەوە (ل: 129)

لە ڕۆما گەر مەتاعێ بێ تەماعی

به خۆڕایی بدەن هێشتا گرانە (ل: 136)

موقتەزای ئاب و هەوای خاکی دیاری ڕۆمە
ئەهلی سووتاوی مەیە، بەستەیی ئاوازی نەیە (ل: 146)

ناگەن بە حیز و ڕێگری ئێمە لە موڵکی ڕۆم
عەللامەیی ویلایەت و شێخی ویلایەتی (ل: 164)

قیسسەیی حاڵەتی ئەو کەشفە لە ڕۆم و عەجەما
نییە وەک "حاجی"یی بێ چارە ئەبەد ڕیسوایێ (ل: 179).

تا لە ژێر باری ڕۆمیان نەمرن
زەحمەتە قەدری بەیتی من بگرن (ل: 195)
پاکی دەرچن لە کاری نا بە مەحەل
ڕۆمی ڕافڕێنن بۆ دەری ئەسفەل (ل: 196)

چی پیاو بێ تێدەگا ڕۆمی چییە
باسی ڕمبازی و سواری بۆ نییە (ل: 208)

وەک "موحەممەد حەنیفە" بەیتی مەتین
نییە ئیللا حەساری "قوستەنتین" (ل: 223)

من کاتێک ئەم بەیتانە بە تەنیا و بە لەبەر چاوگرتنی تەواوی مەتنەکەیان دەخوێنمەوە و بیریان لێدەکەمەوە، لە حاجیدا مرۆڤێکی بە ویژدان دەبینم کە هیچ قسەیەکی نابەجێ بە خەڵک و مرۆڤ ناڵێت. کورددۆستی حاجی بە دوورە لە ڕق و کینە لە میللەتی تورک و لە کۆمەڵگای تورکی. ئەم قسەیە بۆ ئەو شیعرەشی ڕاستە کە لەبارەی ئەرمەنستانەوە نووسیویەتی، لە ویشدا ڕووی قسەی لە میللەتی ئەرمەن نیە، هێندەی ئەوەی لە سیاسیەکانیانە.

ئەو ماوە درێژەی ئەو لە بارودۆخێکی نالەباری ئەو شارەدا ژیاوە، نایەکسانی و نادادوەریی و چەوسانەوەو مەحروومییەتی چەشتووە، بەڵام ئەزموونی خۆی بەسەر گشت کۆمەڵگاکەدا نەگشتاندووە و نەکەوتۆتە داوی هزرینی ڕەگەزپەرستیی پێچەوانە و پەرچەکردارییانە، وەکئەوەی لە ئەزموونی سەدەی بیست و بیست و یەکەمی ژیانی تاراوگەییدا بینیمان و دەیبینن، کە چۆن خودی تاراوگەنشینان دەبنە بەرهەمهێنەرەوەی ئەو نیگای کەچ و ڕەیسیزمەی لە سایەیدا دەچەوسێنرێنەوە و تیرۆر بەرەنجامەکەیەتی.

لە بەیتەکانی حاجیدا، جیاکارەیەکی ورد هەیە بۆ شارەکە، وەک (شوێن) و وەک (پایتەخت)ی عوسمانیەکان.

پایتەختەکەی پەسەند نیە و شارەکەش بە مەیدان و بە قوربانیی ئەو سیاسەتە دەزانێت. پاشان جیاکارەیەکی وردی کردووە لە نێوان وشەی (ڕۆمی) بە مانای عوسمانی و (ڕۆما) وەک پایتەختی عوسمانیەکان و (ئەهل) وەک خەڵکی ئاسایی شارەکە. حاجی قادر عوسمانیەکان و دەست و پێوەند و هەرەمییەتی دەسەڵاتەکە ڕیسوا دەکات و کەسیان نابوێرێت:

**ئەم سەگانەی کە لەلای ئێمە وەزیر و وکەلان**
**بێنە لای تۆ – بەخودا – نایکەیە گاوان و شوان**
**ئەمە کەرمیزە دەڵێن واریسی شەرعی نەبەوین**
**هەموو عەبدی سەنەمن، باسی مەکە گەورەکەیان**
(ل: 92)

بەڵام کاتێک قسە لەسەر خەڵکەکەی دەکات دەڵێت: (ئەهل) و هۆکاریی ئەو ڕەفتارانەش کە لەم خەڵکەدا هەن و بۆخۆی بەدڵی نین، ناگەڕێنێتەوە بۆ هۆکارێکی بووننناسیانە و جەوهەرگەرا، بەڵکو دەیگێڕێتەوە بۆ ئاووهەوای شارەکە و ژینگەکەی..

لە زۆربەی کاتدا ڕووی قسەی ئەو لە عوسمانی و دەوڵەت و پایتەختەکەیانە کە هەموویان مانایەکی سیاسییان هەیە. ئەگەر ئەم جیاکارەیەمان لەپێشچاو

گرت، بۆمان دەردەکەوێت حاجی هیچکات قسەی بە ژیار و خەڵک و شارەکە نەگوتووە. هەموو ئەمانە لە ئەخلاق و ویژدانێکی زیندوو و لە هووشیارییەکی بەرزەوەن کە حاجی هەیبووە. ئەو لە جیاتی ئەوەی خۆراکێکی ڕەگەزپەرستانەمان بداتێ ڕەخنە لەو چین و توێژانە دەگرێت کە ئەو شارەیان بەو دەردە بردووە و شەریکی جورمی عوسمانییەکانن.

ئەمە ئەو ڕووە ئاشکرایەی ئەزموونی شیعریی حاجییە لەو شارەدا. ڕووەکەی دیکەی ئەوەیە، کە دەبێت بۆخۆمان بیری لێبکەینەوە: واقیعێک کە حاجی بینیویەتی لە سایەی ئەم دەسەڵات و چین و توێژانەدا لە چ بارودۆخێکدایە. (جەهەننەمی)ی و (وێرانەیی) و (کەلاوە)یی ڕۆما (ئەستەمبووڵ)، لێرەوە بەرجەستە بووە، واتە بارودۆخێکی ئەوتۆ کە حاکمانی شار، بە هۆیەوە شارەکەیان لە شوێنایەتی (spatial) و ڕووبەرێکەوە بۆ ئەزموونێکی مرۆیی لەکار خستووە و ڕاپێچیان کردۆتە ژێر جەوری ئەو بارودۆخەی (situation)، لەسەر ئەو شوێنە سەپاندوویانە. بۆیە ڕەنگدانەوەی شارەکە لە ئەزموونی حاجیدا ڕەهەندە شوێنیی و ئۆربانیستییەکەی کاڵ و نادیارە، بەڵام ڕەهەندی بارودۆخەکەی ئاشکرا و جێی ڕەخنەی حاجیە و تووڕەی کردووە. شارەکە

بچووک بۆتەوە لە ڕووبەرێکدا، کە هەندێ بارودۆخی سەپاو، بۆ کارکردن و ژیانکردنێکی ناچارەکیانە لە پێناوی دەسەڵات و ئەرکەکانیدا کە بەسەر خەڵکەکەیدا سەپاندوون، تیایدا ڕوو دەدەن، نەک شوێنێک بۆ ئەزموونی کەسەکان.

حاجی تەلار و پرد و کەشتی، شەقام و کەنار دەریا و شوێنەوار، سکەی شەمەندەفەر و کارگە و گاریی و تراموا، حەمام و بازاڕ و مەیخانە و ڕووسپیخانە، ڕێستۆرانت و شانۆ و ئۆپێرا و قەیسەری و دەیان دیاردەی دیکەی شاریی و ئۆربانیستی، کە هەموویان کەمێک پێش چوونی ئەو بۆ ئەوێ و لەکاتی مانەوەیدا بەوپەڕی گەشەی خۆیان گەیشتوون[1]، باس ناکات و شارەکە بچووک و کورت دەکاتەوە لە بارودۆخێکدا، کە تیایدا چەند دەستەیەک لە سوڵتان (گای بنە) و خێزانەکانیان، سەدری ئەعزەم و والی و قازییەکان و هتد، بەسەر عاممەی خەڵکدا سەپاندوویانە و واقیعێکی نالەباریان لەو شار و شوێنەدا بۆ مرۆڤ هێناوەتە پێش.

---

[1] لەمبارەیەوە بڕوانە هەر دوو ئەم سەرچاوەیەی خوارەوە کە بەرچاوڕوونییەکی تەواومان لەبارەی گەشەی شاری ئەستەمبووڵ لەسەردەمی مانەوەی حاجی قادر پێشکەش دەکەن: -- پول دۆمۆن: سەردەمی تەنزیمات (1839- 1878). هەروەها: خلیل اینالجیک: تأریخ الاقتصادی و الاجتماعی للدوله العثمانیه. مجلد الثانی، (عصر الاصلاحات (1812- 1914).

بەڕاست، بۆ دەبێت ئەم داوا و چاوەڕوانییەمان لە حاجی قادر هەبێت، کە دەبوو ئەزموونی ژیانی لە ئەستەمبووڵ، وەک شار و شوێن، لە شیعرەکانیدا ڕەنگ بداتەوە؟ ڕەنگە ئەمە زیاتر کێشەی ئێمە بێت، نەک حاجی قادر و بەرپرسیارکردنی لە ئاست وەسفی شارێکدا کە ئەو وەک کەسێکی ئاسایی تێیدا نەژیاوە و لە ڕوانگەی (ئەویتر)ەوە، پێگەیەکی لاوەکیی وەک (ڕەعیێت[1]، کۆچکردوو، بێکار و پەراوێزیی) هەبووە لەو شارەدا.

شارەکە لە شێوەی نیوە دوورگەیەکدا جوانییەکی تایبەتی هەیە و لە سەردەمی حاجیشدا بەهۆی ڕەهەندە ڕۆمانتیکەکەیەوە، جوانتر. باشترین شوێنی نیشتەجێبوون تیایدا بەشی بەرزاییەکانی بوون. عوسمانییەکان ئەوەیان لە بیزەنتییەکانەوە بۆ مابۆوە، کە هەر لەو شوێنە بەرزانەدا و لەسەر بناخەی ڕووخاوی شارستانیەتی

---

[1] وشەی (رعایا)، یان ڕەعیێت، وشەیەکی عوسمانییە و ئاماژەیە بە کۆی ئەو کۆمەڵە مرۆییە، لە مسوڵمانان و نامسولمان، لە دەرەوەی دەستەبژێری سوپا، هەروەها ئەو چین و توێژانە، دەگرێتەوە کە سەرقاڵی کاروباری ئابووری و (کشتوکاڵین) و سەرانەیەکی زۆریان لێسەندراوە. بڕوانە:

- خلیل اینجالیک و دونالد کوترات: التأریخ الاقتصادی و الاجتماعی للدولة العثمانیة. المجلد الثانی 1600-1914. ترجمة: د. قاسم عبدة، بیروت، لبنان، دار المدار الاسلامی، 2007. ص806.

بێزەنتیی و مەسیحییەکانەوە، کۆشکەکانی خۆیان دروست بکەن.

"لەگەڵ ئەوانیشدا دەسەڵاتدارە بەهێز و دەوڵەمەندەکان شوێنە باشەکانیان بۆ خۆیان داگیر کردووە: بۆیە هەر لەوێشەوە بەدرێژایی سەدەکان ئاوەڕۆ و پاشەڕۆ و خاشاکی خۆیان فڕێدەدایە خوارەوە بۆ تەختی کەنارەکان ئەمەش لەبەر ئەوەی سیستەمی ئاوەڕۆ لەشارەکەدا نەبووە و پیسایی و زبڵی بەشەکەی سەرەوە لە شێوەی گردۆڵکەدا لە تەختاییەکان کۆ دەبۆوە"[1].

لە هەمان سەدەی نۆزدەهەمدا کاتێک سەفارەی بەریتانی (ڕۆبیرت واڵش)یان وەک قەشە لە سەفارەتەکەیان لە ئەستەمبووڵ، دامەزراند، واڵش کە تازە خەریک بوو بە ژیانی شاهانەی ناو کۆشک ڕادەهات، لە شوێنی کۆشکەکەی خۆیەوە کاتێ لە پەنجەرەیرا ڕوانیویەتی، بەمجۆرە ئەستەمبووڵی وەسفکردووە:

---

[1] اندرو ویتکروفت: العثمانیون: تفكيك الصور. ص: 163، کە ئەویش لەم سەرچاوەیەوە وەریگرتووە:

- Robert Walsh: Narrative of a Residence of Constantinople. London, 2 vol., 1836, vol. I, p.238

ئەمە لینکی کتێبەکەی (واڵش)ە:

https://archive.org/details/aresidenceatcon00walsgoog.

"له بەشێکی دیکەی دوورگەکەوە، شاری قوستەنتینیە هەڵدەکشا و هەتا چاو بڕکات بە هەردوو لایدا کێویک له خانوو دیار بوون لەسەر ئەو حەوت تەپۆڵکەیەی کە وەک شەپۆلێک لە ئاسۆوە درێژ دەبوونەوە. ئەمانە لە کۆی ئەوەی لە چواردەوریان بوون، جیاواز بوون و گونجانێکی ئەوتۆیان لە قەبارەدا پێکهێنابوو، کە وێکدەهاتەوە لەگەڵ بەرزایی ئەو تەپۆڵکانەی لەسەریان بینا کرابوون"[1].




بەڵام هەر ئەم قەشەیە، کاتێک بیری دەکەوەتەوە ئەو لە ڕێی پیادەوە چۆتە ناو ئەستەمبووڵ و ئەو دیو شورای شارەکەی وەسف دەکرد، دیمەنێکی دیکەی بینیبوو، کە زۆر دوور بوو لەوەی چاوەڕێی کردبوو: "کاتێک لە پایتەخت نزیک بوومەوە، بە درێژایی ڕێگای کەنارەکان، هیچ دیمەنێکی چڕی دانیشتوانم نەبینی و هیچ خانوویەک و گوندێکیش دیار نەبوون کە ئاماژە بدەن لە شارێکی گەورە نزیکبووینەتەوە. لە دوایین دە

---

[1] اندرو ويتكروفت: العثمانيون: تفكيك الصور. ص: 161

میلیی ڕێگاکەماندا، بەلای هیچ ماڵێکدا تێنەپەڕین و مرۆڤێکیشمان نەبینی. لە نکاو خۆمان لە ژێر شوراکەدا بینیەوە ئەمجا لێمان ئاشکرا بوو کە گەیشتووینەتە شارەکە. بە دەروازەی سلیڤریادا تێپەڕین و سامناکی لە ناوەوە زیاتر بوو وەک لە دەرەوە. لەگەڵ دەنگی تەقوهووڕی ناڵی ئەسپەکانماندا کە بەسەر پیادەڕۆ ڕەقەکەدا دەڕۆیشتن، هەرایەکە زیاتر بوو.. شەقامەکان ترسناک و بێدەنگ بوون، تەنیا هەرایەکی دیکەی دەبیسترا لە سەگێکی دڕەوە دەهات، کە خۆی لە چاڵایی بناخەی خانووێکی خاپووردا مەڵاس دابوو، حەپەی ئەو سەگە ترسی ئێمەی لەکاتی تێپەڕیندا بردە سەرێ"[1].

عوسمانییەکان شارەکەیان وەک بەشێک لە شکۆی خۆیان و نمایشێکی دەسەڵاتدارانە بینیوە، خۆیان لە باشترین شوێنەکانی شارەکە و لەسەر تەپۆڵکەکانی بەسەر دەریادا دەڕوانن، تەلار و کۆشکیان دروستکردووە و هاوکات لە هەستی خۆبەکەمزانی و بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییە دەروونییەکانی خۆیان، موجامەلەیەکی زۆری سەفارەت و قونسولگەریی وڵاتە ئەوروپاییەکانی وەک بەریتانیا، فەرنسا و ئیتالیایان کردووە تا ئەوانیش لە

[1] اندرو ویتکروفت: العثمانیون: تفکیک الصور. ص: 162

باشترین شوێنەکان نیشتەجێ بکەن. ئەوانیش هەر خەریکی سوودخوازی و جاسووسیکردن بوون بەسەر وڵاتەکە و بەسەر یەکترەوە، چونکە ململانێیەکی زۆرییان لە نێواندا هەبووە. بەهەردوو لاشیان، چ عوسمانی و چ ئەم ئەورووپاییانە بارێکی گران بوون بەسەر خەڵکەکەوە و جگە لە دەست و پێوەند و نزیکەکانی خۆیان کەسیتر ژیانێکی ئاسایی شاریانە نەژیاوە. وە نەبێت ئەمە تەنیا باری ژیانی غەیرە تورکەکان بووبێت، "بەڵکو شەقامە لاکەوتەکانی دواوەی ئەستەمبووڵ و ئەو کوخ و خانووە پەرپووتانەی لەسەریان بوون، شوێنی تورکە ئاساییەکان بوون"[1].

لەم نێوانەشدا هیچکات ئەم سەفارەت و قونسوڵگەرییانە هەڵوێستێکی ئەوتۆی مرۆییان لە ئاست سیاسیەتی عوسمانیەکاندا نەنواندووە کەجێی دڵخۆشی و لە ئاستی شکۆی وڵاتی خۆیاندا بێت و هەر خەریکی خۆنزیکخستنەوە و دادۆشینی سەروەت و سامانی وڵاتەکە و ئیمبراتۆریەتەکە بوون.

هەموو ئەمەش شارەکەی کردۆتە دوو بەش، بەشێک بۆ خۆیان و ئەوانەی خزمەتیان کردوون لە باشترین

---

[1] اندرو ويتكروفت: العثمانيون: تفكيك الصور. ص: 182.

جێگەکانی شاردا، نیشتەجێبوون و باقیی خەڵکەکەش لە شوێنە پەراوێزی و لەمدیو و ئەو دیوی شووورای شارەکەوە نیشتەجێبوون.
بەمجۆرەش، سرووشتی شارەکە بۆ بەشێکی ئەوانەی، بەتایبەتی کە لە سیستەمی پۆلێنکاریی عوسمانیەکاندا کەوتوونەتە ژێر ناوی (ڕەعایا)وە، ڕێگەی بەوە نەداوە ئەم چین و توێژانە، شار وەک شوێن ئەزموون بکەن. ئەمانە بەهۆی چەقین و مانەوەیان لە بوارێکی تایبەتی ئیشکردن و لە جێگەیەکی تایبەت، ئەو هێزی کارە بوون کە نەیانتوانیوە وەک *دانیشتووی شارێکی ئاسایی* بژین و شوێنایەتی شار ئەزموون بکەن.
هەموو ئەزموونکردنێکی شوێن پەیوەستە بە ئاستی ئازادیی مرۆڤ و جوڵە و چالاکییەکانییەوە لەو شوێنەدا. ڕەنگدانەوە، بەرهەمی هووشاریی و دوبارە بیرکردنەوەیە لەوەی ئەزموونکراوە. بەڵام ئایا حاجی و هاوپێگەکانی ئازاد بوون؟ ئایا ئەستەمبووڵ بۆ هەمووان هەمان شار و شوێن بووە؟ ئایا پیشە و کار و ئەتنیسیتی و ئینتیمای نەتەوەیی مرۆڤیان ناچار نەکردووە یەک تەمەن پابەند بێت بەو شوێنەوە کە کاری تێدا کردووە و ئەمەش ڕێگەی پێ نەدابێت شار لە فراوانی خۆیدا ئەزموون بکات؟

ئەم پرسیارانە هەموویان ڕەوان و جێی خۆیانن، چونکە سەرچاوەکانیش لەسەر ئەستەمبووڵ ئەوە ڕووندەکەنەوە، کە دابەشبوونێکی ئیتنیکی و چینایەتی لە شارەکەدا هەبووە[1].



سرووشتی شارەکانیش وەک یەک نیە. لە شاری مۆدێرندا هەم ئازادی و کرانەوە و هەم گێتۆ و دەستبەسەریی هەیە. هەندێ شوێنی شارەکە مۆدێرن و شوێنی کەشخەیی و هەندێ جێگەشی کەلاوە و پیس و پۆخڵ. بەسەر دەریادا خەون و بەهەشت و بەسەر عەرد

---

[1] بۆ نموونە هەر یەک لە برنارد لویس و ویدکرۆفت لە کتێبەکانیاندا جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکەنەوە.

و چۆڵەوانیدا سێدارە و چەتەگەری، وەکئەوەی لە تابلۆکەی *لویجی مایەر* (1800)، دەبینرێت.[1].



بۆ نابێت ئەستەمبووڵ بۆ هەندێ کەس و گرووپەکان گێتۆیەکی دەستبەسەریی بووبێت! ئەستەبووڵ بۆ گەشتیارێکی وەک (ژێرار دی نێرڤاڵ)ی فەرەنسی پاریسێکی دیکە و شاری پێکەوەژیان و لێبووردەیی بووە و تیایدا باسی لێبووردەیی عوسمانییەکان دەکات[2]، بەڵام

---

[1] ئەم وێنەیە و وێنەی (ل: 302) کە شەقامی پیرا لە ئەستەمبووڵی نیزکەی 1810 پیشاندەدات، لە کتێبەکەی ویدکروفت، ل: 277 و 284 وەرگرتووە.

[2] د. مصطفى الستيتي: "إسطنبول العثمانية بعيون رحالة فرنسي"، لە: http://www.turkpress.co/node/ 13يناير 2015.

بۆ هەندێک، سیاسی، ڕۆشنبیر و دەستگێڕ و کۆڵبەرەکانی، کە زۆرینەیان لە میللەتانی ژێر چەپۆکی دەوڵەتی عوسمانییەوە هاتوون (وەک ئەرمەنی و کورد)، یان دەستبەسەر و دوورخراوەبوون تا لە ژێر چاودێریی سیستەمەکەدا بمێننەوە و چالاکییەکانیان کۆنترۆڵ بکرێت، شاری نەهامەتی بووە.

ئەم شارە لە ناوەوەی و بۆ چینەکانی خوارەوەی خەڵک، وەک زیندانێک وابووە. ڕاستیی ئەم بۆچوونە لە سەرچاوە مێژووییەکانەوە ئاشکرا دەبێت. شاری ئەستەمبووڵ بەدرێژایی ئەو سەدانەی شارێکی مەسیحیی بووە، یان ڕاسترە بگوترێت شارێک بووە لە سایەی ئیمبراتۆریەتی بێزەنتیدا، کولتوورێکی بەهێزی مەسیحی تێدا بووە[1]، تێکەڵێک بووە لە کۆمەڵگای بچووک بچووک لە شێوەی گونددا، کە بە زەحمەت لە کەنار یەکتردا ژیاون. لە سەدەکانی دەسەڵاتی بێزەنتییەکانیشدا زۆرێک لەم گوندانە شورایان بەدەوری خۆیاندا لیداوە، کە لەگەڵ داگیرکردنی عوسمانییەکاندا بۆ ئەم شارە ئەو شورایانە نەماون. بەڵام ڕۆحی داخراوەیی بۆتە بەشێکیش لە شارە عوسمانیەکە و لێرەشەوە لەگەڵ ئەوەی ئەم شارە وردە

---

[1] جیمز أ. کوریک: امبراتوری بیزانس. ت. مهدی حقیقت خواه. تهران: ققنوس، 1384ص: 45 و بەرەو دوا.

ورده لە سەراپای ئیمبراتۆیەتدا، دەبێتە جێی سەرنج بۆ ئەوانەی هیچ ڕەگوڕیشەیەکەیان لەوێ نەبووە، ئەو گەڕەک و جێگانە پەیدابوون کە شوێنی کۆبوونەوەی کەمینەکان بوون و وەک گیتۆیان لێهاتووە[1].

هەرچەندە نکوڵیی لەوە ناکرێت، دەبێت عوسمانییەکان زیرەکییەکی ئەوتۆیان هەبووبێت، تا وا بکەن بە درێژایی سەدەکان لە دەسەڵاتدا بمێننەوە، بەڵام شێوازی دەسەڵاتەکەیان بەجۆرێک بووە کە نەیتوانیوە بەبێ زەبر و زۆر میللەتانی چوارچێوەی ئیمبراتۆرییەتەکەیان و بەتایبەتیش گەلانی نێو پایتەختەکەیان یەک بخەن. بەپێی شایەتحاڵەکان، لەوانەش قەشە ڕۆبێرت واڵش کە پێشتر ئاماژەم بە کتێبەکەی دا، ئەم شارە، شارێکی ئاساییش و متمانەبەخش نەبووە. بۆیە ئەگەر کەسێک وا تێبگات شاری ئەستەمبووڵ بەشێوەیەکی ڕێکخراو لە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتدا بووە، بە هەڵەدا دەچێت. "هەریەکە لەو گوند و گیتۆیانەی باسمان کردن، چ مسوڵمان، چ مەسیحی و یەهوودی، لەلایەن گەورەکانییەوە حوکم دەکران و لە دەوری مزگەوت، کەنیسە و پەرستگاکەیان

[1] اندرو ویتکروفت: العثمانیون: تفکیک الصور. ص: 166.

کۆدەبوونەوە. هەموو دەستە و کۆمەڵە ئیتنیکیەکان لە دەوری خۆیان کۆدەبوونەوە لە پێناوی یەکترپاراستندا"[1].

لە شیعری حاجیدا هەردوو ڕووەکەی ئەستەمبوول ئامادەن، بەڵام یەکێکیان دیار و ئەویتریان نادیارە. حاجی ئەو بەشە لە شارەکە و ئەو هەلومەرجانەی ئەم دابەشکارییە ناڕەوایەی عوسمانی و سەفارەتەکانی ئەورووپا بەسەر شارەکەیاندا هێناوە، بە ئاشکرا ڕەتدەکاتەوە و ئەو بەشەش لە شارەکە کە بەم هۆیەوە کەوتۆتە پەراوێز و میحنەتییەوە، بە وێرانە و جەهەننەم دەچوێنێت.

بێدەسەڵاتی عوسمانییەکان لەوەی شارەکە بکەنە شارێکی پێکەوەژیان و خۆشیان وەک مشەخۆر بەسەر ڕەنجی خەڵکەوە ژیاون، حاجی تووڕەکردووە چونکە ئەم دەسەڵاتدارانە نەیانتوانیوە هەلومەرجەکانی ژیانی دانیشتوانەکەی بگۆڕن. لەمەدا حاجی وەک یەکەمین ڕەخنەگرێکی ئەم شارە دەردەکەوێت. بەڵام هەرکات ئێمە لەسەر حاجی و هەڵوێستەکانیشی قسە دەکەین دەکەوینە هەمان ناکۆکییەوە کە حاجی تێیدا ژیاوە.

---

[1] اندرو ويتكروفت: العثمانيون: تفكيك الصور. ص: 166-167

ئەمە سرووشتی ئەزموونەکەی حاجییە کە تێگەیشتنمان لێی ئاسان دەکات. ئەو کاتەی دەبینین حاجی ئەستەمبووڵ سووک و ڕیسوا دەکات، وا دەزانین هەڵوێستێکی دژە شاریانەی هەیە، بەڵام ئەو لە هەلومەرجەکانی ژیانی خەڵک لەسایەی دەسەڵاتێکی خۆویستدا، شارەکەش دەکاتە قوربانی. ئەو کاتەش کە تێدەگەین حاجی بۆ ئەمکارەی کردووە، دیوەکەی دیکەی ئەم شارە، کە ئەو خۆی بینیویەتی ئەنجامی ئەوەی یەکەمە، خۆی بەدیار دەخات و ئەمەش لە ئێمەوە نادیارە. هەرچۆنێک بێت و چەندە هەڵوێستی حاجی لە ئاست ئەم شارەدا گرنگی خۆی هەبێت، هێشتا هەڵوێستێکی تەواو واقیعی نەبووە و بڕێکی زۆر چاوپۆشین و نەبینینی سیما و گەشەی شارەکەی لەو سەردەمەدا، لەخۆی گرتووە، کە حاجی قادر لەو شارەدا ژیاوە. حاجی چەندە هەڵوێستەکەی فیکریی و لە پرانسیپی ڕەتکردنەوەی داگیرکاریی عوسمانییەکانەوە هاتبێت، ئەو هەڵەیە ڕاستناکاتەوە کە بەسەریدا تێپەڕیوە و بەهۆیەوە مێژووی عوسمانییەکان و پەیوەندییە خراپەکەیان بە کورد و گەلانیتری داگیرکراویانەوە، بەسەر پێگەی شارستانیی شارەکەدا گشتاندووە و ئەستەمبوولی تەنیا وەک شار و دەستکەوتێکی عوسمانی بینیوە. ئەو وەسفە نێگەتیڤانەی

حاجی بۆ هەندێ ڕووی ئەمشارەیان دەکات، لەگەڵ واقیعی مێژوویی و گەشەی شارەکە لەو سەردەمەدا وێک نایەنەوە.

ئەوکاتەی حاجی دەگاتە ئەستەمبووڵ و ئەو ماوە زۆرەی تیایدا دەمێنێتەوە، شارەکە لە لوتکەی گەشەسەندن و پێشکەوتن و مۆدێرنیزەبوونی خۆیدا بووە و کۆی ئەو نمونانەی نوێبوونەوە کە حاجی بۆ سەرکەوتنی کورد ستایشییان دەکات و داوای پەنابۆبردن و دەستپێوەگرتنیان لە کورد دەکات، وەک (ڕۆمان و جەریدە و خوێندن و قوتابخانە و گشت سیماکانیتری شارنشینی)، لەو سەردەمەدا و کەمێک پێشئەوەش لە تایبەتمەندییەکانی ئەستەمبووڵ بوون[1].

کێشەی من ئەوەش نیە کە بۆچی ئەم دژوازییە لە شێوازیی بیرکردنەوەی حاجیدا دروستبووە، بەڵکو ئەوەی جێی توێژینەوەیەوە، ئەوەیە چۆنە حاجی توانیویەتی بەسەر هەستەکانی خۆیدا کە هۆکاریی ئەزموونکردنی شوێنن لە جیهانی بکەردا، باڵا دەست بێت.

[1] لەمبارەیەوە و بۆ بەراوودرکردنی ئەو وێنەیەی حاجی بە ئەستەمبوولی دەبەخشێت بەو واقعەی خۆی تیایدا ژیاوە لە هەمان شار و سەردەمدا، بڕوانەرە: پۆل دۆمۆن: سەردەمی تەنزیمان (1839-1878). وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵا، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس. هەولێر، 2008، لاپەرەکانی: (25، 52-58 و 82-84).

ئەمەش لە کاتێکدا هەر ئەم هەستانەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا، سەرچاوەی سەرەکیی ئێمە بوون بۆ توێژینەوەیەکی درێژ لەبارەی چۆنێتی ئەزموونکردنی شوێنەوە، لەلایەن حاجی قادرەوە ئەو کاتەی لە کوردستان بووە.

من لەم ڕوانگە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە بۆ مەسەلەکە ناچم. بۆ من ئەزموونکردنی شوێن و ڕەنگدانەوەی لە دنیای بکەردا، ڕەهەندێکی هەستەکی و جەستەیی و جوانیناسانەی هەیە. شوێن لەم توێژینەوەیەی مندا شوێنێکی دیاردەناسانەیە و بەدەروونی دەکرێت. حاجیش بە جەستە و هەستەکانییەوە لەو شارە بووە، بەڵام ڕەنگدانەوەکانی لە ئاستی هەستەکی و جەستەییدا ون و دەروونی خاڵییە لە شار و شوێنەکانی. لە ئاستی هزریی و ئادیۆلۆژیشدا ئەم شارە بۆ حاجی شوێنێکی پیس، نێگەتیڤ، بێزارکەر و قێزەونە. ئەوەی بۆ من گرنگە، ئەوەیە کە بۆچی ڕەنگدانەوەی هەستەکانی: بیستن، بینین، دەستلێدان، چێژ و بۆنکردن لە شیعری قۆناغی شاریانەی حاجیدا نابینین کە هەموویان لە بەرهەمهێنانەوەی شوێندا گرنگیی خۆیانیان هەیە؟ ئەم پرسیارە گرنگی خۆی هەیە و دەمانباتەوە سەر پرسیار لەسەر بوونی هەستەکیانەی حاجی و چێژی ئەو لە جوانی و ئێستاتیکای شار. ئایا

حاجی بە هەمان تێگەیشتنی پێشینەیی خۆیەوە لە شوێن، کە تیایدا ژیانێکی کۆچەریانەی کشتوکاڵیانە ئامادەیی هەبووە و شوێنە پیرۆزەکانی بەرجەستە کردوون، ڕووبەڕووی شاریش بۆتەوە و ئەمانەی لەوێدا نەبینیونەتەوە، بۆیە ڕەتیکردۆتەوە. یان لەبەر ئەوەی حاجی (من)ی نەتەوەیی خۆی لە شاری (ئەویتر)دا نەبینیوەتەوە[1] و نەیتوانیوە خۆی لەگەڵ بگونجێنێت و تاقە ڕێگایەکیش بۆ پاراستن و بەهێزکردنی ئەو (من)ـە نەتەوەییەی ئەوە بووە شوێنی (ئەویتر) لە ژیان و ئەزموونی خۆیدا بسڕێتەوە؟ یاخود حاجی نیشانەکانی جۆرە نەخۆشییەک ئاشکرا دەکات، کە پەیوەندیی هەبووە بە سڕبوونی هەستەکانییەوە؟

من نازانم توێژینەوەی کەسانیتر لە دواڕۆژدا دەگەنە چ ئەنجامێک و چییمان لەسەر ئەم پەیوەندییەی حاجی قادر بە ئەستەمووڵەوە، وەک شوێن بۆ ڕووندەکەنەوە، بەڵام ئەوە عەردێکی نەکێڵراوە و پێویستە بایەخی پێبدرێت تا ئەو مەتەڵە هەڵبێنین.

لە ئێستادا شیعری حاجی ناچێتە ژێر باری شییکارییەکەوە، کە وەک شیعری شاریی تەماشای

---

[1] د. ابراهیم رمانی: المدینه فی الشعر العربی، جزائر نموذجا. ص: 8.

بکەین. وەک جەی. ئێچ جۆنسۆن، دەستنیشانی کردووە، "شیعری شاریی ئەو شیعرەیە کە وەسفی شارێکی واقیعی دەکات بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ. یان وەسفی ئەو مرۆڤانە دەکات کە ژیانیان کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەزموونەکانیان لەو شارەدا، بەشێوەیەکی ڕوون"[1]. حاجییش لە شارێکی ئەوتۆی واقیعیدا بووە و پێویستی بەوە نەبووە بە خەیاڵ و خەون بیری لێبکاتەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا نە خەیاڵی بۆی چووە و نە خەونی پێوە بینیوە، نە گوزارشیشی لە ئەزموونە هەستەکی و ڕۆژانەییەکانی خۆی کردووە تیایدا.

بەڵێ، ڕەنگدانەوەی دیکەی ئەم شارە لە بیرکردنەوەی حاجیدا دەبینم و ئەوەش گرنگیی خۆی هەیە. بۆ نمونە حاجی زۆر ڕاشکاو و قسە لە ڕووە. شەففاف و ڕەخنەگرە، ڕاناوی (من) زۆر بەکار دەهێنێت، دژی دواکەوتوویی و ستایشکەری پێشکەوتن و زانست و خوێندەوارییە و پشتگیریی لە گەلانی ڕاپەڕیو دەکات و گەلیکیتریش. هەموو ئەمانەش سیفەتی کەسێتیی شارین و شار ئەم تایبەتمەندییانە دەکاتە تایبەتمەنی

---

[1] Johnson. J. H: the poetland the city. The University of Georgia Press, 1948, p 18. لە د. ابراهیم رمانی: المدینە فی الشعر العربی، جزائر نموذجا (1962-1925)، ص: 5.

تاکەکەسەکان و شوناسی شاریانەیان. شەففافیی و خودگەردانی و زەینییەتی ڕەخنەیی، دژە باوی، هەڵویست لە دژی ئایین و نەریت و پشتگیری لە ئازادیی گەلان، هتد، هەموویان ئاماژەن بە بوونی خودێک بە ڕۆشنبیرییەکی شاریانەوە و کاریگەریی شار لەسەر بۆچوون و لێکدانەوە و هەڵویستەکانی لەو سەردەمەدا کە حاجی لە ئەستەمبووڵ دەژیا.. بەڵام هیچکام لەمانە بەتەنیا و پێکەوە وەڵامی ئەوە نادەنەوە، کە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ و تاکەکەس لە شاردا ژیانێکی ئەزموونکارانەیە و دیاردەکانی شارنشینی و لە شاردا ژیان کاریگەریی ڕاستەوخۆ دەکەنە سەر کەسایەتی بکەر، یان خودێتی مرۆڤ.

بۆ نمونە دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین، حاجی لە ئەستەمبووڵ بەسەر شەقامەکاندا ڕۆیشتووە. کەنار دەریای بینیوە، خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوونی ئەزموون کردووە. باڵندەکانی بە ئاسماندا بینیون. لە چاخانە و خواردنگە دانیشتووە. گوێی لە دەنگە دەنگ و بۆنی شاری کردووە. سەرخۆش و شەوگەرد بەلایدا تێپەڕیون، مەیخانە و سەماخانە و کەشتیی و ترێن و دیمەنی ماسیگرەکانی دیتوون، شەوانە بەتەنیا یان لەگەڵ دۆستان کاتی بردۆتە سەر، لە ژێر زەمین یان لە ژووری

ئاپارتمانێک، یانژی خانوویەکی کرێدا ژیاوە، دراوسێیەکی هەبووە، شەوانە سەرخۆش بووە و حاجی وەڕس کردووە. ژنێکی ناسیوە و جاروبار خەڵوەتی لەگەڵ گرتووە. چۆتە بازاڕ و لەوێ قەیسەری و دوکانی دیتوون. گوێی لە تەقەی ناڵی ئەسپ و پرمەی وڵاخ بووە. کۆشک و تەلاری لێوە دیار بوون. باخ و پارک و دیمەنی سەوزایی و درەخت و پاشانیش ڕوویکردۆتە چاخانەیەک بۆ چا خواردنەوە و ئەو حاجی لەقلەقانەی بینیون کە چونەتە بەردەم مێزی چاخۆرەوەکان بۆ ئەوەی کلۆیەک شەکریان بدەنێ، یان بۆخۆیان دەندووکیان لێداوە و بردوویانە. گۆشتێکی قوربانی زۆر لە شارەکەدا هەبووە. کولێرەی تەنوور و نانی گەرم هەڵمی لێ هەڵستاوە. سەگێکی بەرەڵای زۆر خەڵکیان هەراسان کردووە، سوڵتان هەموو ڕۆژانێکی هەینی بە شاردا تێپەڕیوە و دانیشتوان لە پێشوازیدا و هتد. هیچکام لەمانە کە زۆرینەیان ئەزموونی هەستەکی مرۆڤن لە ژیانی ڕۆژانەیدا لە شارێکی وەک ئەستەمبووڵی ئەو سەردەمە، لە ئەزموونی شیعریی حاجیدا ڕەنگدانەوەیان نیە و کۆی ئەو ئەزموونەی لە چەند دێڕێکدا کە گوزارشن لە شەوێکی (بێ شەمع و میسباح) کورت کردوونەتەوە.

بەشی دووەم

# هاوکاتیی و هاوشوناسی

## خوێندنەوەیەک بۆ مانای «کات» لە شیعری حاجی قادری کۆیی دا

**پێشەکی:**

لە بەشی پێشووی ئەم توێژینەوەیەدا لەسەر ئەزموونی شیعریی حاجی قادری کۆیی، باسم لە شوێن کرد، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە باسێکیش لە کات بکەم و پرۆژەکە پێکەوە ببەستمەوە. قسەکردن لەسەر کات و شوێن لە ئەزموونی ئەم شاعیرەدا تەواوکەری یەکترن و شیعری حاجیش پێخۆر و بابەتگەلێکی زۆرمان لەمبارەیەوە پێشکەش دەکات. خاڵی بنەمایی کە ئەم دوو بابەتەش پێکەوە دەبەستێتەوە، مەسەلەی شوناسە. شوناسی مرۆیی شتێک نیە لە سەرەتاوە ببەخشرێت، مرۆڤ لە ڕێگەی چالاکیە ماناداره‌کانیەوە لە شوێنە جیاواز و سەردەمە جیاوازەکاندا، شوناسی خۆی پێکەوە دەنێت، دەیگۆڕێت، کامڵی دەکات و بەردەوامیش دەبێت لە دروستکردنی.

هەروەکچۆن شوێن کاریگەریی هەیە لەسەر چێکردنی شوناسی مرۆڤ، ئاواش کات لە میانەی تێپەڕینی خۆیدا ئەو هەل و دەرفەتانە بۆ شوناس دەڕەخسێنێت تا بەردەوامیی لە ڕەوەندی دروستکردنی خۆیدا وەربگرێت. *شوێن دۆخی نیشتەجێیی و سەقامگیرانەی شوناس و کاتیش دۆخی جوڵە و ڕەوەندە هەمیشەییەکەیەتی.* بەڵام ئەم سەقامگیری و گۆڕانە، ئەم پابەندبوون و ڕەوەند و

پرۆسەیەی شوناس لە یەکتر جیا نابنەوە و شوناس پەرتەوازە ناکەن. کات و شوێن پێکەوە شوناس بەرەو تەواوبوونی گریمانەکراوی خۆی دەبەن و لە مرۆڤدا بەرجەستەی دەکەن، بە جۆرێ کاتێک ئەم مرۆڤە لە خۆی دەڕوانێت، بۆی ئاشکرا دەبێت کە ئەو، یان شوناسەکەی هیچ نیە بێجگە لەو وێستگە شوێنکاتیانەی بەشێوەیەکی چالاک پێیاندا تێپەڕیوە و ئەمەی لێهاتۆتە بەرهەم کە هەیە.

ئایا لە شیعری کلاسیکیی ئێمەدا کات وەک بابەتێک و کێشەیەکی شعری بەرجەستە بووە؟ ڕەخنەی ئەدەبی وەڵامێکی ورد و یەکلاکەرەوەی بۆ ئەم پرسیارە پێنییە و نەیتوانیوە مەسەلەی کات وەک بابەتێکی ڕەخنەیی لە شیعری گەورە کلاسیکەکانی ئێمەدا بخاتە ڕوو. بەشێکی ئەم خەسڵەتەی ڕەخنەی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ کارنەکردن بەو مێتۆدانەی کە توێژینەوەی شیعرمان بەو ئاراستەیەدا لەلا ئاسان دەکەن، چونکە (کات) وەک بابەتێک لە شیعردا، بابەتێکە بۆ بیرکردنەوە، نەک بۆ خەیاڵ. ڕەخنەی ئەدەبیی ئێمەش خەیاڵ و بیرکردنەوە لێکدی دابڕ دەکات و ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی شیعر وەک مەسەلەیەکی (خەیاڵی) پێناسە بکا و بەرەو پیری بچێت، نەک وەک

مەسەلەیەکی فیکری، یان وەک پانتاییەک کە بیری تێدا دەکرێتەوە و بیر بەرجەستە دەکات. بۆیە کات وەک بابەتێک بۆ فیکر نابێتە هۆی سەرنجڕاکێشانی میتۆدێکی ڕەخنەیی کە شیعر بە بەرهەمی خەیاڵ و ئیلهام پێناسە دەکات.

بەشێکی دیکەی بە پەراوێزبوونی کات لە ڕەخنەی ئەدەبیی ئێمەدا، پەیوەستە بە شێوازی تەقلیدیانەی خستنەڕووی مەسەلەی کات، لەلایەن شاعیرەکان خۆیانەوە. زۆرینەی شاعیرە کلاسیکەکان، جگە لەوەی لە پەراوێزدا باسی کاتیان کردووە، ئەوە ئەم مەسەلەیەشیان بەستۆتەوە بە چەمکەکانی وەک «چەرخی گەردوون»، «کاروانی تەمەن»و «چەرخی چەپگەرد» و ئەمجۆرە دەربڕینانەوە، کە زیاتر سکاڵا کردنن لە دەست کات، نەک بەرهەمهێنانی تێڕوانینێکی تایبەت لەسەر کات. بۆیە ئەم خستنە ڕووەی شاعیرەکان، نەبۆتە هۆی جۆشدانی ڕەخنەگرەکانمان تاکو لەو مەسەلەیە ورد ببنەوە و ئەوانیش وەک شتێکی بەدیهی تەماشایانکردووە.

لایەنێکی دی ئەوەیە مەسەلەی کات چ بۆ شاعیرەکان و چ بۆ ڕەخنەگرەکان، مەسەلەیەکی ئاڵۆزە و لق و پۆپی زۆری لێدەبێتەوە و زمانی شیعری بە ئاراستەیەکی

دیکەدا دەبات، کە دەبێتە هەڵگری پرسیاری مەزن و تێڕامانی قووڵ و فەلسەفی، نەک ئەو زمانە بەلاغییەی کە ڕەخنەگرەکان شارەزای کەلێن و قوژبنەکانی بوون و ئەو شتانەیان تێدا دۆزیونەتەوە، کە ویستویانە و زانیویانە بیدۆزنەوە.

بۆ تێگەیشتن لە کات، وەکئەوەی لە شیعری کلاسیکیی ئێمەدا خراوەتە ڕوو، پێویستە ڕەخنەگر چاوەڕوانیی تری هەبێ و ئەو بابەتانە بدۆزێتەوە کە ناکرێ لە چوار چێوەی زمانی بەلاغیانەی شیعردا، بیاندۆزینەوە، ئەگەر نەمانتوانی ئەو زمانە لە خەسڵەتە بەلاغییەکانی دامالّین و وەک زمانی هزر و بیرکردنەوە تەماشای نەکەین.

حاجی قادر، وەک شاعیرێکی کلاسیکی، لەو ڕووەوە کە زۆری لەسەر نووسراوە، شاعیرێکی خۆشبەختە. وەلێ لەو ڕووەوە کە شاعیرێکە زۆر لە بیری (کات) دا بووە و بەدەگمەن ئەم لایەنەی شیعری ئەو، ئاوڕی لێدراوەتەوە، کەسێک نامۆیە بە ڕەخنەی ئەدەبیی ئێمە. ئەو هەمیشە وەکو شاعیرێکی (کورد پەروەر، پێشکەوتووخواز، ناسیۆنالیست، دیموکراتخواز) و هتد. ناوی براوە و باسیکراوە، بەبێ ئەوەی ئەوە لە یادی توێژەران و ڕەخنەگران بێت، کە حاجی لە زۆربەی شیعرەکانیدا باس لە هەر شتێ بکات، ئەو باسکردنەی لە چوارچێوەی

تێگەیشتنێکی تایبەتدایە بۆ کات. واتە نە کوردایەتیەکەی، نە پێشکەوتنخوازی و نە ڕەخنەکانی لە کۆمەڵگای ئەوسای کوردەواری، بەدەرنین لەو دەرککردنەی ئەو هەیەتی بۆ کات و تێپەڕینی کات و جیاوازیی نێوان دۆخەکانی کات.

من لەم توێژینەوەیەدا، (کە لەکەم و کوڕی و هەڵە بەدەرنیە)، هەوڵدەدەم چەمکی کات لەلای حاجی دووبارە بەرهەم بهێنمەوە. خاڵی هەرە جەوهەری لەم باسەدا ئەوەیە کە توانیبێتم ڕوونی بکەمەوە، تێگەیشتنی حاجی لەکات بە تێگەیشتنێکی تایبەتدا لەسەر (خود) و (شوناس) تێپەڕ دەبێت و شوناسی (خود)یش لە زمان و زمانی شیعردا بەرجەستە دەبێت. بۆیە حاجی چەندە بەدوای شوناسیەکدا بۆ خود، دەگەڕێ، ئەوەندەش ستایشی زمان و زمانی شیعر دەکات کە بەرجەستەکەری (خود)ـە لە (ئێستا)ی ژیانی خۆیدا. خود بۆ حاجی خودێکی (بکەرە) لە کاتی (ئێستا)دا و ئەو کردەیەش کە خود پێی هەڵدەستێ بریتیە لە بەرهەمهێنانی شیعری. شیعر بەڵگەیە لەسەر بوونی مرۆڤ لە (ئێستا)ی خۆیدا. شیعر چالاکییەکی ماناداره کە بەشدارییەکی گەورەی هەیە لە بەرهەمهێنانی شوناسدا.

بۆ چوونە ناو ئەم باسەوە، جگە لە قسەکردن لەسەر چەمکی کات لە ئەفسانە، فەلسەفە و تیۆلۆژیدا، سێ شیعری حاجیم لە نزیکەوە خوێندوونەتەوە کە تایبەتن بە مەسەلەی کات. لەیەکەمیاندا لەڕێگەی قسەکردن لەبارەی مەرگەوە و لە دووەمیاندا بەهۆی قسەکردن لەسەر گۆڕانەکانی سروشتەوە، قسان لەسەر کات دەکات و لە شیعری سێهەمیشدا جیاوازی دەکات لە نێوان دوو جۆر بەکارهێنانی زماندا، کە بە هۆی یەکێکیانەوە کات بەفیڕۆ دەدەین و بەهۆی ئەویتریانەوە هۆشیاریمان بەرامبەر بەکات دەردەبڕین. خاڵی هاوبەش لە نێوان ئەم شیعرانەدا ئەوەیە لە هەرسێکیاندا کات بۆ حاجی کاتی (ئێستا)یە نەک ڕابردوو، یان داهاتوو، ئێستاش ئەو کاتەیە کە مرۆڤ دەتوانێ شوناسی خودی خۆی لە زماندا بەرجەستە بکات، بۆیە لەبەشی دواییدا هەوڵمداوە زۆربەی ئەو خەسڵەت و بابەتە زمانیانە پۆلین بکەم، کە حاجی پێیوایە لە خەسڵەت و بابەتەکانی زمانی شیعرن و زمانیش، بەتایبەت زمانی شاعیرەکانیش هەڵگری نیشانەکانی ئەو کاتەن کە ئەوانی تێدا ژیاون و ئەمەش ڕێگەمان بۆ خۆشدەکا تاکو ئێمەش لە سەردەم و ئێستای خۆمانەوە پەیوەندییان پێوە بکەین و لە گەڵیاندا بکەوینە گفتوگۆوە.

لە کۆتایشدا چەند ئەنجامێکم لەباسەکەوە، وەرگرتووەو خستومنەتەڕوو. بە پێوستم زانیوە هەرسێ شیعرەکە وەکو خۆیان بڵاو بکەمەوە.

## کات و ڕەنگدانەوەکانی

یەکێک لەو چەمکانەی هەر لە دێرزەمانەوە مرۆڤی بەخۆیەوە سەر قاڵکردووە، (کات)ە. کات بابەتێکە لە ئەفسانە، شیعر و فەلسەفەدا و بیرکردنەوەی مرۆڤیش لە دۆخەکانی کات یەکێکە لە دەوڵەمەندترین و قووڵترین فەسڵەکانی ئەو بیر کردنەوەیە. هیچ کولتوور و کۆمەڵگایەکمان نیە تێیدا کات نەبوبێتە بەشێکی گرنگ لە وێناکردنەکانی و هیچ کۆمەڵگەیەکی مرۆیی لە جیهاندا نیە بیری لەکات نەکردبێتەوە. بیرکردنەوە لەکات بەشێکی گرنگە لە پێکهاتنی هووشیاریی مرۆڤ و ئەمەشی لە بەرهەمە ئەفسانەیی، شیعری، ئەدەبی و فەلسەفییەکانیدا بەرجەستە کردووە.

من لەم سەرنجانەدا کە تەرخانکراون بۆ ئاخاوتن لەسەر کات لەلای شاعیری هۆشیارمان، حاجی قادری کۆیی، بە پێویستی دەزانم، سەرەتا و زۆر بەکورتی، هەندێک گەڕانەوەم هەبێت بۆ ئەو تێگەیشتنانەی لە بواری جیاوازدا لەسەر کات بەرهەم هاتوون. پێموایە ئەم کارە

ئاسانکارییەکی باشمان بۆ دەکات بۆ تێگەیشتن لەچەمکی کات لای حاجی قادر، ئەمەش بەتایبەتی کە پێشتر لە ڕەخنە و خوێندنەوەکانماندا گرنگییەکی ئەوتۆ بەم بوارە نەدراوە و ڕەخنەی ئەدەبیی ئێمە نەیتوانیوە (کات) وەک مەسەلەیەک لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا ببینێ و دەرکی بکات.

**کات لە میتۆلۆژیادا:**

میتۆلۆژیاکان وەک باوە بگوترێ، هەر تەنیا کۆمەڵێ (حەکایەت) و بەسەرهاتی (خورافی)نین کە باسی سەردەمە کۆنەکانی ژیانی مرۆڤ و قۆناغی (نا عەقڵانیەتی) هزرمان بۆ دەکەن. بەڵکو ئەمانە بەرهەمی کۆنەستی مرۆڤن و هەڵگری تێڕوانینێکی تایبەتین سەبارەت بە پرسیار و مەسەلە گەردوونیەکانی وەک بوون چییە، لە چ کاتێکەوە دەستیپێکردووە و سەرەتای ژیان چۆن بووە؟ مرۆڤی سەرەتایی وێناکردن و تێگەیشتنەکانی خۆی لە چوارچێوەی ئەم ژانرە دەوڵەمەندەدا بەرجەستە کردوون و ناچارین لە پێناوی تێگەیشتن لەمرۆڤ و شێوازی بیرکردنەوەی سەرەتاییانەی بگەڕێینەوە بۆ بەرهەمە میتۆلۆژییەکان.

یەکێک لەو بابەتانەی لە میتۆلۆژیای گەلانی جیهاندا بەردەوام دووبارە بۆتەوە، کێشەی (کات)ە. بەو هۆیەشەوە کە بابەتی سەرەکیی میتۆلۆژیا بریتیە لە باسکردنی «مێژوویەکی پیرۆز» وەک مێرسیا ئەلیادەی ڕۆمانیایی دەڵێت، ئەوە ئەو مێژووە پیرۆزە هیچ نیە جگە لە بەسەرهاتی خواوەندەکان و پاڵەوانەکانی شارستانیەت. ئەوەی میتۆلۆژیاکان دەیگێڕنەوە بریتیە لەباسکردنی ئەو ڕووداوانەی کە (کاتی خۆی) ڕوویانداوە، واتە لە سەرەتای (بوون)ەوە. بەم پێیەش تێدەگەین کە کات لە میتۆلۆژیادا، کاتێکی (نامرۆیی)، یان (دەرە- مرۆیی)ە، ئەمەش بەو حوکمەی کە مێژووی (بوون) لە مێژووی (بوونی مرۆڤ) کۆنتر و لەپێشترە.

لە میتۆلۆژیادا (کات)خەسڵەتی پیرۆزیی و ئەزەلی هەیە و جیاوازە لە کاتی مێژوویی مرۆڤ. کاتی ناو میتۆلۆژیاکان، کاتی خواوەندەکان و سەرەتای ڕووداوە ڕاستەقینەکانە. لە میانەی ئەم کاتەیەدا کە باس لە دروستبوونی گەردوون، هاتنە ئارای مرۆڤ، ژیان و مەرگ، پەیدابوونی جۆرەکانی زیندەوەر و ڕووەک، پەیدابوونی ئاگر و ئایین و بۆنە پیرۆزەکان دەکرێت. بەم پێیەش کات لە میتۆلۆژیادا هەڵگر و بەرجەستەکەری

حەقیقەتە، ئەو حەقیقەتەی لە ئەنجامی بەشداریکردنی خواوەندەکانەوە لە پرۆسەی بووندا، دروستبووە.

بۆیە دۆخی (ڕابردووی) کات بەو پێیەی (پیرۆز)ە، نەگۆڕیشە، لە کاتێکدا دۆخی (ئێستا) و (داهاتوو) هیچ مانایەکیان نیە جگە لەو مانایەی لە ئەنجامی پەیوەندییان بەدۆخی (ڕابردوو)ەوە بە دەستی دەهێنن. ئەمەش پێماندەڵێت: (ئێستا) لە کاتی میتۆلۆژیدا ئەو دەمە مانای هەیە کە دووبارەکەرەوەی (ڕابردوو)بێت، (داهاتوو)ش ئەو (ئێستا) چاوەڕوانکراوانەیە کە بە گەڕانەوەیان بۆ سەردەمی پیرۆز بەرجەستە دەبن. بەم پێیە لە جیهانبینی میتۆلۆژیانەدا، کات بەپێی دووری و نزیکی لە (سەرەتا)وە دابەشکراوە و کاتێکمان هەیە (سەرەکی)یە و دوو دۆخی لاوەکی کاتیشمان هەیە. کاتێکمان هەیە (ڕابردووە) و لەسەنتەردایە و دوو دۆخی پەراوێزیی کاتیشمان هەیە کە (ئێستا) و(داهاتوو)ن[1].

---

[1] بۆ تێگەیشتن لە چەمکی کات لە میتۆلۆژیادا سوودم لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتووە: میرچا الیادە: مقدس و نا مقدس. ت: نصرلله زنگوئی. تهران: سروش، 1375، بەشی دووەم، ص: 55-84 میرچا الیادە: رسالە در تاریخ ادیان. ت: جلال ستاری. تهران: سروش، 1376، بەشی یازدەهەم، ص: 363-381

**کات لە هزری فەلسەفیدا:**

لە ڕاستیدا ئاخاوتن لەسەر کات لە هزری فەلسەفییدا، هەم لەبەر ئاڵۆزیی بابەتەکە و هەم لەبەر زۆری ئەو لق و پۆپانەی لەم بابەتە دەبنەوە، کارێکی زحمەتە. من لێرەدا زۆر بەترسەوە لە دەرگای ئەم بابەتە دەدەم و بایی ئەوەندەش قسانی لەبارەوە دەکەم، کە خزمەت بەڕوونکردنەوەی بابەتە سەرەکیەکەمان بکات.

بۆ قسەکردن لەسەر کات، ناچارین لە یۆنانی کۆنەوە دەستپێبکەین، چونکە یەکەمجار یۆنانەکان بوون مەسەلەی کاتیان لە چوارچێوەی تێگەیشتنێکی فەلسەفیدا خستە بەر باس، لەمەشدا بەتایبەتی ئەفلاتوون و ئەریستۆتالیس، دەستپێشخەربوون، ئەگەرچی بیروڕای ئەم دوو فەیلەسووفە لەسەر کات، (بەتایبەتی بیروڕای ئەفلاتون) ئەوەندەی بیروڕاکانی دیکەیان لە مێژووی فەلسەفەدا بایەخدار نین و سەرنجی توێژەرانی فەلسەفەیان ڕانەکێشاوە. جێی خۆیەتی لێرەدا، ئەوە بەبیری خوێنەر بهێنمەوە کە بابەتی کات لە هزری خۆرئاوادا بەتایبەتی لە (قەدیس ئاگۆستین)ەوە گۆڕانی گەورەی بەسەر دادێ، کە پاشان باسی دەکەم.

ئەفلاتوون:

کات لەلای ئەفلاتون (427–347 پ.ز.)، لەگفتوگۆی تیمایۆسTimaiosدا، کە تایبەتە بە بیروڕاکانی ئەفلاتون لە بارەی جیهان و مرۆڤەوە، باسیکراوە. لەوێدا ئەفلاتوون ئاشنامان دەکات بە خودایەک کە دروستکەری جیهان و ژیان و بزاوتنە و بەو کارەشی گەلێک خۆشحاڵە. دوای ئەوەی دروستکەری مەزن لە ئەفراندنی دنیای بوون و فیزیکی دەبێتەوە، بڕیار دەدات ئەم جیهانە دروستکراوە وەک نمونەکەی لێبکات، واتا هەمان سرووشت و خەسڵەت  بە جیهانی خاکی ببەخشێ، کە ئەسڵ و نمونە ئاسمانییەکەی هەیەتی و ئەویش زیندووبوونی هەمیشەیی و نەمرییە. بەڵام کۆکردنەوەی ئەم دوو ناکۆکە مەحاڵە، چونکە ناکرێ جیهانی (نمونەیی و نەمر و نەگۆڕ)ی ئاسمانی، هەمان سرووشتی هەبێت کە دنیای دروستکراوی بگۆڕ و مەرگین و هەستپێکراوی سرووشتی هەیەتی. بوونی کامڵ نەمرە، بەڵام لە جیهانی هەستپێکراودا نەمریی مەحاڵە[1]. بۆیە ئەفرێنەری مەزن دەکەوێتە سەر ئەو بڕوایەی «وێنەیەکی بزواو (متحرک) لە نەمریی دروستبکات و لە هەمان کاتیشدا و

---

[1] برتراند راسل: تاريخ فلسفهء غرب. ت: نجف دريابندرى، تهران: پرواز، 1372، ص: 222

بەمەبەستی ئەوەی ڕێکخستن و سیستەمێکی پێویست بە جیهان ببەخشێ، هات لە هەتاهەتایی و بێبڕانەوە (ئەبەدییەت)، کە بەردەوام لە دۆخی یەکتایی و وەستاندایە، وێنەیەکی دروستکرد، کە بە پێی زۆریی ژمارەکان بەردەوام لە جووڵەدایە. ئەمەش ئەو شتەیە کە پێی دەگوترێت کات[1].»

بەمجۆرەش، کات جووڵەی گەردوون و ئەستێرەکانە و خۆر یەکەیەکی پێوانەیی کاتە کە ئەفرینەری گەورە بە مرۆڤی عاقڵی بەخشیوە تا بە هۆیەوە شەو و ڕۆژ لێکدی جیا بکاتەوە[2].

لێرەوە، ئەو مۆدیلەی ئەفلاتوون بۆ تێگەیشتن لە کات دەیخاتە ڕوو، مۆدێلێکی ماتماتیکیانەیە. بەپێی ئەم مۆدێلە کات *دروستکراوە*، سەرەتای هەیە و بەپێی درێژبوونەوەی ژمارەکان، ئاراستەی خۆی وەردەگرێ. کات کەڵەکەبوونی ساتەکانە وەک ئەوەی ڕیزێ ژمارەبن بەدوای یەکدا. شەو و ڕۆژیش ژمارەکانمان بیردەخەنەوە

[1] أفلاطون: تيمائوس (دوره‌ء أثار) ت: محمد حسن لطفى. تهران، خوارزمى، 1380، ص: 1732.

[2] هەمان سەرچاوە، ص: 1734

و دەتوانین بەهۆیانەوە جووڵە و گەردشی گەردوون لێکبدەینەوە[1].

ئەریستۆتالیس:

تێگەیشتنی ئەریستۆتالیس (384-322 پ.ز.) لە کات جیاوازە لە تێگەیشتنی ئەفلاتوون بۆ هەمان بابەت. بەلای ئەریستۆتالیسەوە کات سەرەتای نییە، کات لە خاڵێکەوە دەست پێناکات و لە خاڵێکدا کۆتایی پێنایەت، بەڵکو ئەزەلیی و ئەبەدییە. واتە کات هەرگیز دەستی پێنەکردووە و هەرگیز کۆتاییشی پێنایەت[2].

بە پێچەوانەی بیروڕای ئەفلاتوونەوە، لەلای ئەریستۆتالیس کات جووڵە و گۆڕان نییە، چونکە ئێمە یەک (کات) مان هەیە و جووڵەی زۆر[3]. لەگەڵ ئەوەشدا تەنیا بەهۆی تێبینیکردنی جووڵە و گۆڕانەوە لەکات تێدەگەین، بۆ نموونە ئەو کاتەی «ئاگامان لە گۆڕان

---

[1] فردریک کاپلستون: تاریخ فلسفه. جلد یکم: یونان و روم. ت: سید جلال الدین مجتبوی. تهران: سروش، 1380، ص: 288

[2] هەمان سەرچاوە، ل: 368

[3] دیوید راس: أرسطو. ت: مهدی قوام صفری. تهران: فکر روز، 1377، ص: 144

نامێنێ، یاخود زەینی ئێمە ناگۆڕێت، وا هەست ناکەین کات تێپەڕیوە»[1].

کەواتە بیرکردنەوە لە گۆڕان لەهەمان کاتیشدا بیرکردنەوەیە لە ڕەوتی کات و ئەمەش پێماندەڵێت: کات لە جووڵە و گۆڕان دابڕاو نییە: «چونکە ئێمە لەیەک حاڵەتدا هەست بە کات و هەست بە گۆڕانیش دەکەین»[2]. هەموو جارێ کە هەستدەکەین کات تێپەڕیوە، هەستیش دەکەین هاوکات گۆڕانێک ڕوویداوە و بە پێچەوانەشەوە. بەم پێیە ئێمە کات (Time)بەوەدا دەناسینەوە کە سەرنجی جیاوازیی (پێش) و (پاش) لە جووڵەدا، بدەین. کات بریتیە لە «ژماردنی جووڵەکان بە ڕەچاوکردنی دۆخی (پێش) و (پاش)ی ئەو جولانەی ڕوویانداوە»[3]. بەمانایەکی تر، کات پێوەری جووڵە و بزوتنەوەیە سەبارەت بە (پێشکەوتن) و (دواکەوتن). کەوابوو، کات لە بزوتنەوەوە دێت و بزوتنەوەش بە ژمارە ئەپێورێ[4].

---

[1] Det Står Tenkerer Aristoteles. 0vst af A. Stigen, Munksgaard, 1996, s. 56.و بەرەودوا

[2] Ibid: s. 57

[3] Ibid: s. 58

[4] د. حەمید عەزیز سەعید: سەرتایەک لەبارەی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان. سلیمانی، چاپخانەی زانکۆی سلیمانی، 1979، ل: 295-296

خاڵی سەرنجڕاکێش لە تێگەیشتنی ئەریستۆتالیسدا و لە پەیوەندی بە بەشی دوایی باسەکەی ئێمەوە لەسەر حاجی قادر، ئەوەیە کە ئەم فەیلەسووفە باس لە کاریگەریی ڕاستەوخۆی گۆڕان و جووڵە دەکات لە تێگەیشتنی مرۆڤدا بۆ کات. ئەمەش دەقاودەق هەمان بابەتە کە خەیاڵ و زەینی شاعیرەکەی لەمەڕ ئێمەی بەخۆیەوە سەرقاڵکردووە، چونکە حاجی قادر بەردەوام جەخت لەسەر گۆڕان دەکاتەوە و (پێشکەوتنی گەلان) و (دواکەوتنی کورد) دەکاتە پێوەر لە تێپەڕینی کاتدا. حاجی قادر بەو پێیەی خاوەنی زەینێکی گۆڕانخوازە، لە عەزابێکی گەورەشدایە بەرامبەر بە تێپەڕینی کات و ئەمەش کێشەیەکی گەورەی بۆ دروستکردووە کە پاشان زیاتر لێی دەدوێم.

**ئاگۆستین:**

یەکێکی دی لەبیرمەندانی هزری خۆرئاوایی، کە مەسەلەی کات دەکاتە چەقی بیرکردنەوەکانی خۆی، (قەشە ئاگۆستین)ە و ئەمەیشی لە بەشی یازدەهەمی (دانپیانەکان)یدا خستۆتە ڕوو.

ئاگۆستین (354-430ز) لە شوێنێکدا کە زۆر پێدەچێت ئاماژە بێت بە ئەریستۆتالیس، دەنووسێ »ڕۆژگارێ لە

پیاوێکی دانام بیست کە کات جگە لە جووڵەی خۆر و مانگ و ئەستێرەکان شتێکی دی نیە و من ئەمەم پەسەند نەکرد»[1]. بەم مانایەش بیروڕای ئاگۆستین لەسەر کات شتێکی یەکسەرە تازە نیە و پێشتریش باس کراوە، بەڵام شێوەی توێژینەوەی ئەو لەوبارەیەوە پڕە لە تازەکاری. ئەمەش ئەو خاڵەیە کە خزمەت بە باسەکەی ئێمە دەکات.
بێگومان ئاگۆستین وەکو بیرمەندێکی ئاییینی بڕوای وایە کات (Time)وەک دیاردە و هەرشتێکی تر هاتۆتە بوون و لەلایەن پەروەردگارەوە دروستکراوە: مانای تەوراتیانەی «لە سەرەتاوە وشە هەبوو» ئەوە دەگەیەنێ کە بوونی کات پێش بوونی هەموو دیاردەکانی دیکەی ناو گەردوون و بوون هەبووە. پەروەردگار کۆنە و بوونێکی دەرەکاتیانە و پێشکاتیانەی هەیە، بۆیە سەبارەت بە یەزدان ناتوانین بڵێین (*پێش ئەو*) و (*پاش ئەو*)، یەزدان لەیەک کاتدا بوونی هەیە ئەویش (ئێستای ئەبەدی)یە.
**«چۆن کات دەیتوانی هەبێت، لەکاتێکدا هێشتا بەدەستەکانی تۆ خەڵق نەکراوە؟ تۆ ئەفرێنەری هەموو کاتەکانی (...) تۆ لەپێش کاتەوە هەبوویت، بەڵام لەپێشبوونی تۆ لە ڕووی کاتەوە نییە. ئەگەر وا بوایە تۆ**

---
[1] قدیس اگوستین: اعترافات. ت: سایەء میثمی. تهران: دفتر پژوهش و نشر سهروردی، 1380، دفتر یازدهم، ص: 374

له پێش هەموو کاتەکانەوە نەدەبوویت. لەسەرمەدیەتدایە کە تۆ لەهەمانکاتدا لەپێش هەموو ڕابردوویەک و لەپاش هەموو داهاتوویەکدا، هەیت. سەرمەدیەت لەهەموو کاتەکان باڵاترە، چونکە بریتیە لە ئێستایەکی ئەبەدی"[1].

بۆیە، ئاگۆستین بە پێچەوانەی ئەریستۆتالیسەوە، کات بە پێوەری جوڵە و پێوانەی بزووتنەوە نازانێ. ئەریستۆ زیاتر گرنگی بە کاتی بابەتیانە دەدات و ئاگۆستین گرنگیی دەدات بە کاتی ڕۆحی، یان کاتی ژیانکردن. ئاگۆستین لەژێر کاریگەریی ئەفلاتوون و پلۆتیندا، لە نێوان "کات "Time" و "ئەبەدییەت"Eternity دا جیاوازی دەکات[2].

"ئەبەدییەت لەلای ئاگۆستین، جیاوازە لە کات، چونکە بەبێ جوڵە و گۆڕان کات بوونی نیە و لە ئەبەدییەتیشدا گۆڕان نییە، کەواتە کاتیش نیە"[3]

ئاگۆستین بڕوای وایە ئەبەدییەت پەیوەستە بە بوونی باڵای خودابانی و کات دروستکراوێکی خودابیە و زەمەنی تێپەڕینی ژیانی مرۆڤ و جیهان و شتە

---

[1] اعترافات، ص: 365

[2] ڕێبوار سیوەیلی: قەشە ئاگۆستین: فەلسەفە و باوەڕ. کوردستان، دەزگای زەریاب، 2012، ل: 87-105

[3] Saint Augustine: The City of God. Edited with an Introduction by Vernon J. Bourke. New York, Image Books, p. 211

ماتەریاڵییەکانە لە دنیای ئێمەدا. یان بە مانایەکی تر، کات لە دوای ئەبەدییەتەوە دروستبووە و ئەگەر بمانەوێ بە زمانی ئەفلاتوون بدوێین، ئەوە دەبێ بڵێین ئاگۆستین ئەبەدییەت بە نمونەی بەرزی کات و کاتی ئەزموونکراویش، بە نمونەی سیبەرە کات و ئەو کاتە دەزانێ کە مرۆڤ و بوونەوەرەکانیتر تیایدا دەژین. بەمجۆرەش هەم بوونی خودا دەکەوێتە دەرەوە و پێش بوونی کاتەوە و هەم جیاکارەیەک لە نێوان ئەبەدییەت و بیربرانەوەی خودابانی و کات و تێپەڕینەکانی ژیانی مرۆیی، دروستدەکات[1].

"قسەی بنەمایی ئاگۆستین ئەوەیە کە خودا ئەبەدییە، بەڵام مرۆڤ دیلی کات و پابەندی هەلومەرجەکانیەتی. خودا بە شێوەیەکی هەنووکەیی و لە ئامادەییەکی دەرەکاتیانەدا، لە هەموو شتێک تێدەگات، بەڵام مرۆڤ بەشێوەیەکی کەموکوڕ و نزم لە بوون تێدەگات، واتە هەردەم بەشێ لە ڕاستەقینە لە چاوی مرۆڤەوە نادیارە[2] "

---

[1] سیوەیلی، 2012، ل: 96

[2] تروند برگ اریکسن: تاریخ زمان. ت: اردشیر اسفندیاری. تهران: نشر پرسش. 1385، ص: 90

پاشان ئاگۆستین جیاوازی نێوان ئێستای هەمیشەیی خودایانە و زەمەنی مرۆیی بەرجەستە دەکات، بەبێ ئەوەی هێشتا پێناسەی کاتی کردبێت، یان وەڵامی ئەو پرسیارەی دابێتەوە کە دەپرسێ: کات چییە؟:

"ساڵەکانی تۆ نە تێپەڕ دەبن و نە دێن، بەڵام ساڵەکانی ئێمە لەدەست دەردەچن و ساڵی دیکەیان بەدوودا دێن تاکو گشت ساڵەکان بە نۆرە دەرکەون. ساڵەکان لەلای تۆ یەک ڕۆژە، وەلێ ڕۆژی تۆ ڕۆژانە هەڵنایەت، بەڵکو بەردەوام ئەمڕۆیە. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئەمڕۆی تۆ شوێنی خۆی ناداتە هیچ سبەینێیەک و جێگەی هیچ دوێنێیەکیش ناگرێتەوە. ئەمڕۆی تۆ ئەبەدییەتە"[1]

بەم پێیەش ئاگۆستین زەمینە دروستدەکات بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارە سەرەکییەکەی لەسەر چییەتی کات، بەبێ ئەوەی پەلە بکات. ئاگوستین لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا دەنووسێ:

»تا ئەو کاتەی کەسێ ئەو پرسیارەی لێنەکردووم، باش دەزانم کات چییە. بەڵام ئەگەر کەسێک لێم بپرسێت و منیش بمەوێ ڕوونیبکەمەوە، تەواو شپرزە دەبم و دەتوانم بەدڵنیایشەوە بڵێم کە دەزانم ئەگەر هیچ شتێک

[1] اگوستین: اعترافات. پیشوو، ل: 365

تێنەدەپەڕی، کاتی ڕابردوو بوونی نەدەبوو، ئەگەر بڕیاریش وانەبایە شتێک ڕوویدات، کاتی داهاتووش نەدەبوو و ئەگەریش شتێ نەبووایە، کاتی ئێستاش نەدەبوو[1]«

بەم جۆرە ئاگۆستین ڕێخۆشکەری دەکات بۆ ئەوەی پێمان بڵێ: نە ڕابردوو هەیە و نە داهاتوو، ئەوەی بەشێوەیەکی واقیعی و ڕاستەقینە هەیە (ئێستا)یە، چونکە: »چۆنە ڕابردوو و داهاتوو دەتوانن هەبن، لەکاتێکدا ڕابردوو چیدی نەماوە و داهاتویش هێشتا نەهاتوە؟[2]« بەڵام نابێت لەم خستنەڕووەی ئاگۆستین وەها تێبگەین کە ئەو بەتەواوی (ڕابردوو) و (داهاتوو) ڕەتدەکاتەوە، چونکە ئەو مەبەستێتی بڵێ: ئێمەی مرۆڤ ئەو دوو کاتە تەنیا بە هۆی کاتی (ئێستا)وە و لە دۆخی هەنووکەیی زەماندا تێبینی دەکەین. بۆنمونە: منداڵیی ئێمە لە ڕابردوودایە و ڕابردووش چیدی نەماوە، بۆیە ئەگەر بمانەوێت باسی منداڵیمان بکەین دەبێ پەنا بۆ (بیرەوەری)مان ببەین و ئەمەش کارێکە لە (ئێستا)دا دەیکەین. شتێک کە حاجی قادر بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە. بەهەمان شێوە کاتێ کە دەمانەوێت کارێک لە

---

[1] اگوستین: اعرافات. دفتر یازدهم، پەرەگرافی 14، ل: 366.

[2] سیوەیلی: 2012، ل: 99

داهاتوودا ئەنجام بدەین، لەپێشەوە بیری لێدەکەینەوە، وەلێ ئەو شتەی بیری لێدەکەینەوە هێشتا نەهاتووە و بوونی نیە، چونکە پەیوەستە بە کاتێکەوە لە (داهاتوو)دا. داهاتووش هێشتا بوونی نیە و چاوەڕێی دەکەین. بۆیە ئەوەی بە شێوەیەکی واقیعی هەیە (ئێستا)یە و ئێمەش لە ئێستادا (داهاتوو) لە بیرکردنەوەی خۆماندا بەرجەستە دەکەین[1].

"ئەودەمەی دەکەوینە وەسفکردنی ڕاستەقینەی ڕابردوو، ڕووداوەکانی ڕابردوو لە بیرەوەرییەکانی خۆمانەوە دەرناکێشین، بەڵکو لە وشەگەلێ سوود وەردەگرین کە بنەماکەیان چەند وێنەیەکی لەبیر نەکراوی ئەو ڕووداوانەیە. چونکێ لە کاتی ڕوودانیاندا، ئەوانە بەهۆی دەرککردنە هەستەوەرییەکانی ئێمەوە چەند کاریگەرییەکیان لە زەینی مەدا بەجێهێشتووە. منداڵیی من ئیدی بوونی نییە، لە دەمی ڕابردوودایە و ئەویش ئیدی نەماوە. وەلێ ئەودەمەی ئەو ڕۆژانەم بەبیر دەکەوێتەوە و وەسفیان دەکەم، ئەوانە لە کاتی هەنووکەدا بۆخۆم وێنا دەکەم، چونکە هێشتاکە وێنەکەیان لە بیرەوەری مندا ماوە"[2]

---

[1] سیوەیلی: 2012، ل: 100

[2] اوگوستین: اعرافات. ص: 370-371

لێرەوە ئاگۆستین بە پێچەوانەی ئەریستۆتالیس و تێگەیشتنی ماتماتیکیانە لەکات، بونیادێکی زەیینی دەداتە کات. واتە کات دەکاتە بەشێ لە پێکهاتەی زەیینی مرۆڤ و پێیوایە کات شتێ نییە لە دەرەوەی زەیین و بیرکردنەوەوە بێت تا بەهۆی جوڵەی خۆر و مانگ و ئەستێرەکانەوە بپێورێ. هەرچەندەش خۆر ڕاوەستێ و ئەستێرەکان لە نێو نووری مانگدا مەحوو ببنەوە، ئێمە هەر ئەزموونی کات دەکەین. هەر دەخەوین و کار دەکەین، هەروەها ئەگەر خۆر لەجیاتی ئەوەی بە شەووڕۆژێک بەدەوری زەویدا، بە کاتژمێرێک بسوڕێتەوە، هیچ لە کاتی ئێمە ناگۆڕێت. ئێمە بە پێوەرێکی دەرەکی ئەزموونی کات ناکەین، بەڵکو بەلای ئاگۆستینەوە تێگەیشتنی ئێمە لە کات پەیوەستە بە سێ دۆخی زەیینیەوە، کە بریتین لە بیرەوەری و ئیدراک و چاوەڕوانی. بەهۆی بیرەوەرییەوە لە ڕابردوو تێدەگەین، بەهۆی ئیدراکی هەنووکەییەوە لە ئێستا و بە هۆی چاوەڕوانیشەوە لە داهاتوو تێدەگەین. بەمجۆرەش کات بوونێکی دەرەزەینی، یان سەربەخۆی نیە، بەڵکو لە

بیرکردنەوەی بیرکەرەوەدایە کات مانا پەیدا دەکات[1].
بیرکردنەوەش بیرکردنەوەیە لە دۆخەکانی کات:
**»ئێستای ڕابردوو، ئێستای هەنووکە و ئێستای داهاتوو. ئێستای ڕابردوو بیرەوەریە، ئێستای هەنووکە ئیدراکی ڕاستەوخۆیە و ئێستای داهاتووش چاوەڕوانییە.[2]«**

ئەم سێ دۆخەش بوار بۆ مرۆڤ دەڕەخسێنن تاکو پەیوەندیی خۆی بە جیهانەوە بکات و بێدار و هوشیار بێت بەرامبەر بەبوونی خۆی لە ناو کاتدا. وا دێتە پێشچاو، ئاگۆستین زیاتر کاتی ئەمێستاکەی بە ڕاستەقینە دانابێ و ڕابردوو و داهاتووی کەمتر بە کاتی واقیعی و ڕاستەقینە زانیبێ. خودی ئەم تێگەیشتنە ئەوە ئاشکرا دەکات کە ئاگۆستین لە شێوەی ڕەوان و جووڵاندا بیری لە کات کردۆتەوە.

بەشێکی زۆری فەیلەسووفەکانی دوای ئاگۆستین لە دەلاقەی ئەم تێگەیشتنەوە لە کات، تا ئاستێکی زۆر دەستیان لە بۆچوونەکانی پێشووتر هەڵگرت کە بڕوایان وابوو ئێمە بە هۆی جووڵەی شتەکانەوە لە کات تێدەگەین. واتە بەهۆی جوڵەی خۆر، مانگ، ئەستێرەکان و بەهۆی ئاماژەکردنیان بۆ ئەو دیاردانە، کاتیان دابەش

---

[1] سیوەیلی: قەشە ئاگۆستین، سەرچاوەی پێشووتر، ل: 101-102

[2] اگوستین: اعترافات، ص: 372

دەکرد بەسەر ڕۆژ، مانگ و ساڵەکاندا . ئاگۆستین بەوەی سەرەتای بوونی کات دەگێڕێتەوە بۆ پێش بوونی شتەکانی تر، ڕەهەندێکی میتافیزیکیانە و پێشتر بڕیارلەسەر دراو، بە کات دەبەخشێ، بەڵام بەوەدا کە بوونی کات وەک بەشێ لە پێکهاتەی زەینیی مرۆڤ تەماشا دەکا، کە تیایدا بیر لە کات دەکرێتەوە، ڕووخسار و جەوهەرێکی مرۆڤانە دەداتەوە بە کات و ڕۆڵی ئەزموون بەرجەستە دەکات.
ئەوەی لە ئاگۆستینەوە فێری دەبین و گرنگە بۆ تێگەیشتن لە تێگەی کات لەلای حاجی قادر، ئەوەیە، کە بیرکردنەوەی مرۆڤ لە کات، دابڕاو نییە لەو ئەزموونانەی مرۆڤ لە میانەی تێپەڕینی بەتاو و بێ ئەمانی کاتدا پێیاندا تێپەڕ دەبێت. چونکە ئەگەر قەبووڵمان کرد ڕابردوو چیدی لە ئارادا نییە و داهاتووش هێشتا نەهاتووە، ئەوە مرۆڤبوونی ئێمە کە بەشێکی ئەوەتا لە ڕابردوودا و بەشێکی پەیوەستە بە داهاتووەوە، لەبەردەم کێشەیەکی گەورەدایە سەبارەت بە شوناسی خۆی. بەبێ یادوەری و بەبێ چاوەڕوانی، ڕووداوەکان و ئەزموونە هەنووکەییەکان بۆ مرۆڤ تاریک و بێمانا دەبن. لێرەوە، بەسترانەوەی مرۆڤ بە کاتەوە، کاریگەریی هەیە لەسەر سەراپای دەرککردنی و دووچاری لەتوپەتبوونی

شوناسی خۆی دەکات[1]. ئەمەش ئەو هەڕەشەیە بووە کە حاجی قادر لە ئەزموونی تاراوگەیی خۆیدا بە قووڵیی هەستیپێکردووە و نەیتوانیوە بۆ یەک چرکەش خۆی لێ ڕزگار بکات.

ئەمەش ئەو بارودۆخەیە کە لەلای حاجی قادر دەبێتە هۆی دروستکردنی قەیران و پرسیار لە شوناسی خۆی لە میانەی تێپەڕینی کاتدا. هەرچەندە لە مەسەلەی دۆخەکانی کاتدا، حاجی قادر لە ئاگۆستین جیا دەبێتەوە و زیاتر جەخت لەسەر دۆخی داهاتووی .کات بۆ چارەنووسی کورد، دەکاتەوە و ئەمەش پێچەوانەی بیروڕا میتافیزیکی و دینییەکانی ئەوە، بەڵام بڕوای حاجی بە مرۆڤ وەک بوونەوەرێکی ئیرادەگەرا و خۆدروستکەر، لە چارەنووسباوەڕیی ئاگۆستین جیای دەکاتەوە. خاڵی جەوهەریی لە نێوان ئەم دوو کەسەدا ئەوەیە: ئاگۆستین دواجار *ئەزموونی مرۆڤ دەکاتە قوربانیی تێگەیشتنێکی قەدەریانە لە مرۆڤ*، بەڵام حاجی قادر *تێگەیشتنی لە ئیرادەی مرۆڤ، وا دەکات هەر چارەنووسێکی پێشینە و لە ناوچەوان نووسراوی مرۆڤ، بخاتە پەراوێزەوە و لە چاوەڕوانییەکدا نەیهێڵێتەوە*، کە

---

[1] سیوەیلی: 2012، ل: 103-104

*جگە لە خۆی، هیچ هێزێکیتر مژدەی پێ دابێت.* ئاگۆستین بە مرۆڤ دەڵێت: چاوەڕێ بە تا ڕۆژی پەسلانێ دێت و لەوێ سزا و پاداشتی خۆت وەربگرە. وەلێ حاجی قادر بە مرۆڤی کورد دەڵێت: لە ئێستادا ئەو بڕیارانە بدە کە پاشەڕۆژت بۆ دەستەبەر دەکەن، چونکە ئەگەر (ئێستا)ت نەکردە ئێستایەکی چالاک، ئەوە (ڕابردوو و داهاتوو)ش (پەشم)ن، واتە هیچن! بەمجۆرەش، تێگەیشتنی حاجی لە کات نامیتافیزیکیانەیە و خۆی جیا دەکاتەوە لە هەر تێگەیشتنێکی میتافیزیکیانە کە لەسەر بنەمای هێشتنەوەی مرۆڤ لە چاوەڕوانیدا، مژدەی داهاتوویەکی پێبدات کە خۆشی نازانێت تیایدا سزا دەدرێت، یان پاداشت، دەمێنێتەوە یان بەرەو تاقی بیرچوونەوە دەبرێت..

بێگومان ئەم تێگەیشتنەی حاجی لە کات، لە پاڵ تێگەیشتنە مۆدێرنەکانیتریدا، تەواوکەری جیهانبینییەکە ئەگەر بچوایەتە چوارچێوەیەکی هزری و سیاسییەوە، ئێستا لە مێژبوو ئەو هێزە کۆمەلایەتی و کولتوورییانەی حاجی هەمیشە بە ڕێگری دەزانین لەبەردەم داهاتووی کوردا، پووکابوونەوە. لە کاتێکدا ئەو هێزانە هێشتاش لە لوتکەی دەسەلاتی خۆیاندان و بگرە بەردەوامیش خۆیان بەرهەمدەهێننەوە. بۆیە ئەگەر ئێستا حاجی قادر زیندوو ببێتەوە و دیسانەوە تێهەڵچێتەوە لە کوردبوون، هەر ئەو

شیعرانە لە دژی هێزە دواکەوتووکانی کۆمەڵگای کوردی دەنووسێت، کە پێش سەدەیەک زیاتر نووسیوونی!

## کات لەلای شاعیر:

لێرەوە لە تێگەیشتی فەیلەسووفەکانەوە بۆ کات دەپەڕینەوە بۆ تێگەیشتنی شاعیرەکان لە هەمان بابەت. هەروەکو (بەرتراند ڕاسڵ)یش دەنووسێ، شاعیران بەدەست هێز و دەسەڵاتی کاتەوە، زۆریان ناڵاندووە، چونکە هەموو ئەو شتانەی خۆشیانویستوون، لە ڕەوتی تێپەڕینی کاتدا نەماون[1]، تەنیا شتێ کە شاعیرەکان پێیانوایە لە دەست جەوری زەمانە ڕزگاری دەبێ، هەر شیعر و دیوانەکانی خۆیانن، بۆیە پێویستە نرخیان بۆ دابنرێ و لەبیر نەچنەوە. بێگومان هەمان تێڕوانین بۆ لەناوچوونی هەموو شتێک و مانەوە و نەمریی شیعر، لەلای حاجی قادریش دەبینینەوە. بە تایبەتی لە شیعری (زەمانە) دا کە بە ساڵێک پاش مردنی خۆی لە ژمارە (3)ی ڕۆژنامەی کوردستان ساڵی 1898 دا بڵاو کراوەتەوە.

---

[1] براتراند راسل: تاریخ فلسفەء غرب. پیشوو، ل: 88

حاجی لەو شیعرەیدا پاش دەربڕینی هۆشیاریی خۆی سەبارەت بە تێپەڕینی کات و ئەوگۆڕانکاریانەی لە ئەنجامی ئەمەوە هاتوونەتە دی، هەروەها پاش ئەوەی کات لە بۆتەی ئێستاییبوونی خۆیدا بەهۆی تەعبیری (دەوری ئێمە)وە بەرجەستە دەکات، دەکەوێتە ستایشکردنی کتێبی (شێخی خانی: مەم و زین) و بە کتێبێکی بێ (هەمتا)ی لە قەڵەم دەدات. لە کۆتاییشدا تاکە شتێ کە حاجی بە شایانی هاوتاکردنی لەگەڵ شیعری خانی و نالی دایدەنێ، شیعرەکانی خۆیەتی:

لە کوردان غەیری (حاجی) و (شێخی خانی)
ئەساسی نەزمی کوردیی دانەناوە.

کات لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا ئامادەییەکی زۆری هەیە و تێڕوانینی شاعیرەکان لەسەر (ڕەوتی زەمانە)، (بێ وەفایی زەمانە)، (چەرخی دەوران)، (ئاشی گەردوون)، (کاروانی تەمەن) و گەلێ بابەتی دی، دەخاتە ڕوو .

نمونەیەکی دیاری ئەو تێڕوانینە بۆ کات لەلای (نالی) و بەتایبەتی لە قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور) دا دەبینینەوە، کە تیایدا نالی لە میانەی دەربڕینی هەست و پرسیارەکانیدا، باس لە دۆخەکانی

کات دەکات. واتە باس لە کاتێک دەکات کە تێپەڕیوە و بەراووردی دەکات بە (ئێستا)یەک کە نالی تیایدا بیر لەوکاتەی تێدا دەکاتەوە. بەڵام وەک لە (کتێبی نالی) دا باسمکردووە، کاتی ڕابردوو لە لای نالی کاتێکی پیرۆزە، کاتێکە هەموو پاکژی و جوانی و گەنجێتییەکی تێدایە. ئەمەش بە پێچەوانەی (ئێستا)وە کە پڕە لە حوزن و فرمێسک و پیری. بۆیە ئەگەر تێگەیشتن و تێڕوانینی نالی بە جەمسەرێکی ئەو تێگەیشتنە لە کات، کە لە ئەدەبی کلاسیکی ئێمەدا هەیە، دابنێین، ئەوە جەمسەری دووەمیان حاجی قادرە.

حاجی قادر مەگەر بە (خەواڵوویی) ستایشی ڕابردوو بکات، وەکئەوەی لە قەسیدەی (گوتم بە بەختی خەواڵوو) دا دەیخوێنینەوە، دەنا ئەو زۆربەی کات کەسێکە هەنگامەی بیرکردنەوەی لە کات، لە (ئێستا)یە و (حاڵ) لەلای ئەو چەقی زەمەنە.

من لێرە بەدواوە و بە لەبەر چاوگرتن و لەهەمان کاتیشدا بیرکردنەوە بەو تێگەیشتانە لە کات، کە پێشتر خرانە ڕوو، هەوڵدەدەم سێ شیعری حاجی قادر بخوێنمەوە. پێموایە حاجی لەو شیعرانەیدا تێگەیشتنێکی تایبەت لەسەر کات دەردەبڕێ، کە جیاوازە لە تێگەیشتنی بەشێکی زۆری شاعیرە کلاسیکە کوردەکان. لە کۆتایشدا

دەمەوێ مەسەلەی کات و پرسیاری حاجی لە (ئێستا) و (حاڵ) ببەستمەوە بە کێشەی شوناس و مۆدێرنیتەوە بەو مانایەی کە دەکرێ باس لە مۆدێرنبوون لەسەردەمی حاجی قادردا بکەین. بەو جۆرەش پێکەوە بەستنەوەیەکی پتەو لە نێوان تێگەیشتنی حاجی لە شوێن و کات دێتە بەرهەم.

# خوێندنەوەکان

شیعری یەکەم:

## ئێمەش دەمرین

ئێمەش دەمرین، دەبینە خاکی سەرەڕێ
ئەم ڕۆژ و شەوە، تەنووری صوبحی دەگرێ
دەسگا و دووکانی شارەکان دادەنرێ
ئەمیان دەفرۆشێت و ئەویتر دەکڕێ
ئەم باووکی مردووە، یەخەی دادەدڕێ
ئەو بووکی نووی هەیە، کەوای بۆ دەبڕێ
بێ بستە، فەلەک، ئاشەکی وای ناوەتەوە
بۆ هاڕدنی ئێمە، چ عەجایب دەگەڕێ!
لادێیش ڕەزی ئاو دەدات و وەردی دەبڕێ
حەیوانە دەزێ، سەگ دەوەڕێ، کەر دەزەڕێ
لوقمان لەمەدا شوانە، گەر خۆی بکوژێ
گاوانە فلاتوون، لە غەما گەر بدڕێ
ئەم دەستە کەچوو، دەستەیەکی تازەیە دێ
مەعلووم نەبوو ئەم کەشمە کەشە، کەی دەبڕێ
عالەم هەموو مردن لە غەمی زانینی
ئەم حیکمەتەیان نەزانی، هیچ لێی مەگەڕێ

لەم لاوە هەتا (حاجی) نەچێتە ئەو لا
مومکین نییە تێ بگا لەوە گەر بفڕێ.

## وەسفی دیاردەناسانە :

حاجی قادر لە شیعری یەکەمدا سەرەتایەکمان لە بارەی کاتەوە بۆ باس دەکات لە ڕێگەی باسکردنی مەرگەوە، واتە مەرگ دەکاتە سەرەتایەک بۆ قسەکردن لەسەر کات. ئەم قسەکردنەش لە چوارچێوەی وەسفێکی دیاردەناسانەدا دادەڕێژێت و دەیەوێ لە میانەی ئەو وەسفکردنەدا مەسەلەی تێپەڕینی کات بکاتە کێشەیەکی شیعری، کە تێگەیشتن لێی ئاسان نیە، یاخود (مومکین نیە).

حاجی لێرەدا لە زانراوێکەوە دەستپێدەکات کە مردنە:

ئێمەش دەمرین، دەبینە خاکی سەرەڕێ

بۆ ئەوەی لەو ڕێگایەوە بچێتە سەر وەسفکردنی ئەو شتەی کە لە کاتدا ڕوودەدات و ئەمەش کاتی پێش مردنە. بەم مانایەش مردن سنوورێکە لەبەردەم کاتدا، چونکە ئێمە پاش مردن، یاخود لە مردندا هیچ نازانین. پێش مردن، ئەگەر زانراوێک هەبێ ئەوە زانینە لە ئاست مەرگدا. ژیان (واتە ئەو ڕووداوانەی لە ڕەوتی کاتدا ڕوودەدەن)، ناچنە خانەی زانینەوە، بەڵکو دەچنە خانەی

دیتن و ئەزموونکردنەوە. لە ژیاندا ڕۆژ هەڵدێ و شەو دادێ و (تەنووووری صوبح دەگرێ)، واتە ژیان لە چوارچێوەی هاتنی ڕۆژ و شەودا هیچ ناکات جگە لە داخستنی تەنوورێک بۆ سوتان و هەڵقرچانی ئێمە، یاخود هاڕینی ئێمە لە (ئاشی فەلەک) دا:

ئێمەش دەمرین، دەبینە خاکی سەرەڕێ
ئەم ڕۆژ و شەوە، تەنووری صوبحی دەگرێ

............

بی بستە، فەلەک، ئاشەکی وای ناوەتەوە
بۆ هاڕدنی ئێمە، چ عەجایب دەگەڕێ!

.................

ئەم دەستە کەچوو، دەستەیەکی تازەیە دێ
مەعلووم نەبوو ئەم کەشمە کەشە، کەی دەبڕێ

لەگەڵ ئەوەشدا حاجی نکوڵی لەوە ناکات، کە هەم مەرگ و هەم ئەزموونکردنی ژیان، دوو بابەتن لەبەردەم خولیای مرۆڤدا. مرۆڤ دەیەوێ تێبگات و بزانێ، بەڵام ئەم زانینە (لەم لا و لە غەریبابەتی نیشتیمان) واتە لە کاتی ژیاندا، خۆی نادات بەدەستەوە، تەنانەت ئەگەر مرۆڤ بە خێرایی فڕینیش بەدوایدا بگەڕێ. ئەو کەسانەش کە بەدوای ئاشکراکردنی ئەو نهێنییەدا

سەرەڕۆیی دەکەن (وەک لوقمانی حەکیم و فلاتوون)، وەکو ئەو شوان و گاوانەیان لێدێ کە ئەویان خۆی دەکوژێ و ئەمیشیان لە غەمی نەگەیشتنیدا بەوەی کەدەیەوێ بیزانێ، دیق دەکات و دەدڕێ :

لوقمان لەمەدا شووانە، گەر خۆی بکوژێ
گاوانە فلاتوون، لە غەما گەر بدڕێ

..................

عالەم هەموو مردن لە غەمی زانینی
ئەم حیکمەتەیان نەزانی، هیچ لێی مەگەڕێ

کێشەکە بۆ حاجی قادر شتێکی ترە. ئەو جیاوازیی دەکات لە نێوان دوو شوێندا: (ئەم لا) و (ئەو لا) و دەشبینێ کاتێ (ئەم لا) چۆن تێپەڕ دەبێت و ژیان لە ناویدا چۆن بەرجەستە دەبێت :

دەسگا و دوکانی شارەکان دادەنرێ
ئەمیان دەفرۆشێت و ئەویتر دەکڕێ
ئەم باووکی مردووە، یەخەی دادەدڕێ
ئەو بووکی نووی هەیە، کەوای بۆ دەکرێ
لادێیش ڕەزی ئاو دەدات و وەردی دەبڕێ
حەیوانە دەزێ، سەگ دەوەڕێ، کەر دەزەڕێ

ئەم وەسفە فینۆمینۆلۆژیە (دیاردە ناسانەیە)، کە تێگەیشتنێکی دیداریانە (مرئی) و هەستەوارانەی لە پشتەوەیە و پابەندە بە زەینییەتێکی کولتووریی کشتوکاڵیانە و شوێنێکی تایبەت، حاجی قادر دەهێنێتە سەر ئەو بڕوایەی کە بە خۆی بڵێت: زانین و ئاشکراکردنی نهێنیی مەرگ، کێشەی مرۆڤ نیە (لەم لا). ژیان ئەگەر ئەو کاتە بێت کە تیایدا ئێمە دیمەنە جۆربەجۆرەکانی ئەزموون دەکەین، یان لە دەوروبەرمان ئەو ڕووداوانە ڕوو دەدەن کە ڕووداوی ناو ژیانن، ئیدی پێویست ناکات لە ناو کاتێکدا کە بۆ ژیان تەرخانکراوە، بەدوای ئاشکراکردنی نهێنییەکدا بگەڕێین کە حیکمەتێکی نەزانراوە. بە مانایەکی دی: خۆ خافڵکردن و بیرکردنەوە لە شتێ کە (لەم لا) نیە و لە (ئەولا)یە، جگە لە کات بە فیڕۆدان، جگە لە (تاڵکردنی لەززەتی خۆت بەقسەی بی سەروپا) شتێکی دی نیە. بۆیە لە بەیتی کۆتاییدا، حاجی بەرامەیەکی گاڵتەجاڕانە بە مەبەستەکەی دەدات و دەڵێ هەتا لەم لاوە (لە ژیانەوە) نەچینە ئەولا بۆ (دنیای مەرگ/نیشتیمان/بەهەشت، یان جەهەننەم) مومکین نیە لە تێپەڕبوونی کات تێبگەین، تەنانەت ئەگەر بە خێرایی فڕینیش بەرەو ئەو تێگەیشتنە بڕۆین، کە دیسان ئیمکانی نییە. ئەوکاتەش کە (ئەم لا)مان بە جێهێشت، ئیتر کات بۆ

ئێمە دەوەستێ و مەرگ سنووورێک لەبەردەم هەستکردنی ئێمەدا بەکات، دادەنێ :

**لەم لاوە هەتا (حاجی) نەچێتە ئەولا**

**مومکین نییە تێ بگا لەوە، گەر بفڕێ**

لە شوێنێکدا وا تێدەگەم، کە حاجی قادر دەیەوێ پێمان بڵێ، با لە ژیاندا بە خەیاڵی مەرگەوە، بە خەیاڵی شتێکەوە کە هوشیارین بەرامبەری و ناتوانین خۆمانی لێبدزینەوە، نەژین و کات بە فیڕۆ نەدەین و نەگەڕێین. پێویستە کاتی ژیان بە بیرکردنەوە لە مەرگ، واتە بەشتێکەوە کە بە ناچاری دێت، نەکوژین. چونکە ئەوە دوورماندەخاتەوە لەکاتی (ئێستا)، لە ژیان لە ئێستادا. لەلایەکیتریشەوە، حاجی ئاماژەیەکی وردی بە گەڕانەوە بۆ زێدی نیشتیمان وەک سەرابێک داوە و بەتەواوی چوونەوە بۆ ئەوێ، ڕەتدەکاتەوە، مەگەر لە مردندا، کە ئەویش دەکەوێتە دەرەوەی کاتی ئێستاوە. دەمەوێت لەبەشەکانی داهاتوودا ئەم خوێندنەوەیە بەهێزتر بکەم و نمونەگەلی دی لە شیعری حاجییەوە بهێنمەوە.

شیعری دووەم

## بای وەعدە

بای وەعدە بەفری بردەوە، یەخبەندی کردەوە
گوڵ شەمعی پێکرا، شەرەری جەمرە مردەوە
ئەسپی ڕەش و سپی بەگرە و، غاردەدەن بەتاو
وەک ڕۆژ و شەو، دیارە لە شەو ڕۆژ دەباتەوە
بولبول دەخوێنێ، با لە دەفی بەرگی گوڵ دەدا
غونچە لە باتی گوێ بگرێ، دەم دەکاتەوە
نەرگس لە مێرغوزار دەزانی بەچی دەچێ
بنوارە ئاسمان لەشەوا، عەینیهی ئەوە.
تامی نەماوە قیصەو و فورسەت غەنیمەتە
مەعلوومی خاص و عامە: هەچی چوو، نەهاتەوە
میسلی شەراری کاغەزە، سووتاوە عومرمان
ڕۆمی کە دەفع بوو، گرێی دڵ دەفع دەبێتەوە
لەم وەقتە، هەرکەسێ وەکو (حاجی) لە گوڵشەنا
دەستە گوڵی بەدەستەوەیە، دەستی بردەوە.

## سروشت و کات:

هەروەکو چۆن دەکرێ مەرگ سەرەتا و دەلاقەیەک بێت بۆ قسەکردن لەسەر کات و ئەمەش کاتی ژیانمان لێ بەفیڕۆ بدات، ئاواش دەکرێ سرووشت بکرێتە دەلاقەیەک بۆ قسەکردن لەسەر گۆڕان و ئاواش لە (ئێستا)ی ژیانمان نزیکبخاتەوە.

حاجی لەم شیعرەدا هەوڵ دەدات لە ڕێگەی باسکردنی ئەو جووڵە و گۆڕانانەی لە سروشتدا ڕوو دەدەن، (هەمووشیان بەلای جوانی و کرانەوە و ڕووناکیدا دەشکێنەوە)، لە گرنگیی و بەهای کاتی ئێستا ئاگادارمان بکاتەوە.

تێڕوانین لە سرووشت و جووڵەو گۆڕانە بەردەوامەکانی، دواجار دەبێتە هۆی دروستکردنی تێڕوانینێک لەسەر کات، کە تیایدا (قیصە تامی نەماوە) و (فورسەت غەنیمەتە) :

**بای وەعدە بەفری بردەوە، یەخبەندی کردەوە**

**گوڵ شەمعی پێکرا، شەرەری جەمرە مردەوە**

جوڵە و گۆڕان لە دژی چەقبەستن و لە پێناوی ژیاندا، بەفر دەباتەوە و دەیتوێنێتەوە. یەخبەندیش کە دۆخێکی ڕەقبوون و بەستنی بەفرە، دەکاتەوە. ئەمەش بوار بۆ گوڵ دەڕەخسێنێ تا مۆمی تەمەنی هەڵبکات و ئیدی

(جەمرە): ئەو هەڵم و گەرمایەی لە کۆتایی زستاندا لە زەوی و لە شێوەی بڵێسەدا، بەرز دەبێتەوە، نامێنێ و بوار بۆ درەختەکان دەڕەخسێت بێدار ببنەوە. ڕۆحی سەوزایی لە خۆیاندا بگەشێننەوە و ببنە نیشانەیەک بۆ زیندوێتی.. لە ئەنجامی ئەمەشەوە، هیچ شتێی لە دۆخی خۆیدا نامێنێ و هەموو شتێک دۆخی ئێستاییبوونی خۆی وەردەگرێ و ئەمەش لە شێوەی غاردانی ڕۆژ و شەودایە وەک دوو ئەسپی ڕەش و سپی، کە گرەویان کردبێ، بەڵام دیارە ڕۆژ گرەوەکە دەباتەوە، کە کاتی بێداریی و جوڵە و گۆڕانە، نەک شەو:

ئەسپی ڕەش و سپی بەگرە و، غاردەدەن بەتاو
وەک ڕۆژ و شەو، دیارە لە شەو ڕۆژ دەباتەوە
بولبول دەخوێنێ، با لە دەفی بەرگی گوڵ دەدا
غونچە لە باتی گوێ بگرێ، دەم دەکاتەوە
نەرگس لە مێرغوزار دەزانی بەچی دەچێ
بنوارە ئاسمان لەشەوا، عەینیهی ئەوە.

بەمجۆرە دەبینین هەموو شتێ لە جوڵەدایە و هەموو جووڵەکانیش بەڵگەن لەسەر ئێستاییبوون: بولبوول و با هەردووکیان ئامادەیی خۆیان لە ئێستادا دەسەلمێنن: ئەویان بەهۆی خوێندنەوە و ئەمیان بەهۆی جوڵە و

تێپەڕینەوە. ئەم دەنگ و جوڵەیەش لە دەوری خونچەیە و لە شێوەی کۆنسێرتێکی موزیکدا دەردەکەوێ، کە شوێنی پێشکەشکردنەکەی فەزای گوند و ژیانی سرووشتە. وەلێ لەباتی ئەوەی خونچە بوونی خۆی لە ڕێگەی گوێڕادێرانەوە بسەلمێنێت، دەم دەکاتەوە. واتە لەو زەمەنەدا دەژی کە (ئێستا)ی خۆیەتی و ئەمەش لەو گۆڕانەوە دێت کە لە خونچەوە دەیکاتە گوڵ. لە دۆخی داخرانەوە دەگۆڕێ بۆ دۆخی کرانەوە و (ئێستا)ش کامڵترین قۆناغی تەمەنیەتی. بۆیە خونچە لە باتی گوێگرتن لە کۆنسێرتی بولبوول و با، واتە لە جیاتی کاتبەسەر بردن بەهۆی گوێگرتن لەو شتەی لە دەرەوەی خۆی ڕوو دەدات و ئەمەش هەر لە قۆناغی خونچەبووندا دەیهێڵێتەوە، دەیەوێت کاتی تایبەت بە خۆی بژی. کاتی تایبەت بە خۆیشی ئەوەیە کە ببێتە گوڵ، واتە هەم دەم بکاتەوە و هەم سەردەمی خونچەبوونیش تێپەڕێنێ و بێتە کاتی بەگوڵبوون و گوڵینی خۆیەوە.

لەم جەختکردنەوە زۆرەوەیە لەسەر (ئێستا)، ئیدی ڕابردوو بۆ حاجی بایەخی نامێنێت و بێتام دەبێت. چونکە لە ڕابردوودا تەمەنی ئێمە سووتاوە و باسکردنی سووتان جگە لە چوونەوە لای بڵێسە و خۆڵەمێش بە شوێنێکیترمان ناگەیەنێت.

(ڕابردوو)، گرێیەکە لە دڵدا. داگیرکارییەکە وەک ئەو گرێی داگیرکارییەی ڕۆمییەکان، (کڵاوسوور و کڵاوڕەشەکان) لە دڵی گەورە کلاسیکەکانی ئێمەدا (نالی و سالم) و پاشانیش حاجی قادر دا، دروستیانکردووە. گەڕانەوە بۆ چیرۆکی ئەوەی بەسەر چووە، نەک هەر (قیصە)یکی بێ تامە، بەڵکو خافڵبوونیشە بەرامبەر بە دەستکەوتەکانی هەنووکە:

**تامی نەماوە قیصەو و فورسەت غەنیمەتە**

**مەعلوومی خاص و عامە: هەچی چوو، نەهاتەوە**

**میسلی شەراری کاغەزە، سووتاوە عومرمان**

**ڕۆمی کە دەفع بوو، گرێی دڵ دەفع دەبێتەوە**

کاتێ هەموو کەس (خاص و عام) ئەوەیان لێ ئاشکرا بووبێ کە ئەوەی چوو، لەناو کاتدا بەسەر دەچێ و نایەتەوە، ئیتر چیرۆکی ڕابردوو بێتام دەبێت. لە هەمان کاتدا هووشیاربوون لەسەر ئەو ڕاستییە، نزیکمان دەخاتەوە لە ڕاستییەکی دی، کە ئەویش بریتییە لە تێگەیشتنە لە هەنووکە. ئەو کەسەی گرەو دەباتەوە، ئەو کەسەیە کە لەم (وەقتە)دا دەستەگوڵی بەدەستەوەیە. حاجی قادر لەمەشدا خۆی بە براوە دەزانێت:

**لەم وەقتە، هەرکەسێ وەکو حاجی لە گوڵشەنا**

**دەستە گوڵی بە دەستەوەیە، دەستی بردەوە.**

ژیان بۆ حاجی دەبێتە جۆرێ لە گەمەکردن و ململانێ لەگەڵ کاتدا. بەشێ لە کات بەرەو ڕابردوو ڕاپێچمان دەکاتەوە و لەناو هەزار بە هەزارەی چیرۆکەکانیا خافڵمان دەکا. ئەوانەی خۆیان تەسلیمی دەسەڵاتی ڕابردوو دەکەن لەناو بێتامی چیرۆکەکانیدا خۆیان لەبیر دەچێتەوە و دەسکەوتە هەنووکەییەکان دەدۆڕێنن. تەنیا ئەوانە دەستەگوڵەکە دەبەنەوە کە ژیان لەسەردەمێتی و (وەقت)ی خۆیدا دەژین و دەپەڕنەوە بۆ داهاتوو. بەڵام ئەو دەستە گوڵەی حاجی لەو گەمەیەدا لەگەڵ کات دەیباتەوە چییە؟ ئەمە پرسیارێکە پاشان وەڵامی دەدەمەوە.

شیعری سێیەم:

## بە قسەی بێ سەروپا

بە قسەی بی سەر و پا، تاڵی مەکە لەززەتی خۆت
بێ موبالات مەسووتێنە، چرای فیکرەتی خۆت
(حاڵە) نەقدینەیە، (موستەقبەل) و (ماضی) پەشمە
بی ئەمەل سەرفی مەکە، سیم و زەڕی فورسەتی خۆت
ئەی سولەیمانی زەمان: ئاخیری دەیگێڕییەوە
بەحیکایەت، وەکوو خۆت سەڵتەنەت و حیشمەتی خۆت.
من بە پەیغام و بە قاسید موتەسەللی نابم
تاکوو بانگم نەکەیە بارەگەهی حەزرەتی خۆت
وەرە ئەی دڵ بەسییە، بیدە سەگانی دەری یار
دڵەکەی کوت کوتی من یا جگەری لەت لەتی خۆت
زوڵفی سەد دەفعە گوتی: خانە خەراب ڕووی مەدەرێ!
حەیفە بەربادی مەکە شانی من و شەوکەتی خۆت
بۆچی یارانی وەتەن دڵ دەشکێنی «حاجی«
"ظاهرا" ناچیەوە تۆ، باسی مەکە غوربەتی خۆت.

**لە مەسرەفکردنی زمانەوە بۆ بەرهەمهێنانی مانا:**
یەکێک لە جۆرەکانی کات بەسەربردن و خۆدزینەوە لە کات، بریتیە لە قسە دەرپەڕاندن و لە مەسرەفکردنی وشە، کە حاجی قادر بە (قسەی بێ سەروپا) ناوی دەبات و پێشتریش نالی لە دۆخێکی زویربوون و تووڕەییدا ئەمەی ناونا بوو "هەرزەگۆیی و گەپ لێدان":

**نالی حەریفی کەس نییە، ئیلف و ئەلیفی کەس نییە**
**بەیتی ڕەدیفی کەس نییە، هەرزەنویسە، گەپ دەکا**[1]

لەلای حاجی قادر، قسەی بێ سەروپا بەرهەمهێنانی زمان نیە، بەڵکو مەسرەفکردنیەتی، چونکە لە بەرهەمهێنانی زماندا، کە نیشانەی بیرکردنەوەیە، چێژمان دەستدەکەوێ، لە کاتێکدا بەکارهێنانی زمان بەبێ بیرکردنەوە ئەو چێژەمان لێ تاڵ دەکات. بێ موبالاتی لە بەکارهێنانی زماندا، نیشانەی گوێنەدانە بەو ڕووناکاییەی لە ئەنجامی بیرکردنەوەوە، پەیدا دەبێت. کەواتە هەروەکو چۆن قسەی بێ سەروپا، ئەو قسەیەی نە سەرەتای هەیە و نە ئەنجام، تاڵکردنی ئەو چێژەیە کە لە ئەنجامی تێفکرینەوە دێتە دەست، ئاواش بەلاڕێدا بردنی زمانە لە مەداری

[1] مەلا عەبدولکەریمی مدرس: دیوانی نالی، ل: 100

خۆی. ئەگەر زمان بەرهەمێکی بیرکردنەوە بێت و بەرجەستەکەری ئەو ڕووناکییە بێت، کە هزر بەرەمی دەهێنێت لە ڕێگەی ڕێکخستنەوەی لە زماندا، ئەوە قسەی بێ سەروپا بێموبالاتییە بە بەرامبەر بە مانای زمان:

**بە قسەی بی سەر و پا، تاڵی مەکە لەززەتی خۆت**

**بێ موبالات مەسووتێنە، چرای فیکرەتی خۆت**

بەڵام چ شتێ، چ جۆرە بەکارهێنانێکی زمان لە دەرەوەی بیرکردنەوە، دەبێتە قسەی بێ سەروپا، واتە دەبێتە (نا-زمان) و بە فیڕۆ سووتاندنی ئەو چرای فیکرەت کە هزرین هەڵیدەکات؟!

حاجی لەمەدا ڕاشکاوانە مەبەستی خۆی ڕوونکردۆتەوە. ئەو پێیوایە ئەگەر چێژێ لە زماندا هەبێ، ئەوە ئەو چێژە لە ئەنجامی بیرکردنەوەیە لە ئێستا. بۆیە ئەگەر بیرکردنەوە، بیرکردنەوە نەبوو لە ئێستا، ئەوەی لە زماندا بەرجەستە دەبێت قسەی بی سەروپایە. واتە قسەکردنە لەسەر داهاتوو، کە هێشتا نەهاتووە و پەیڤینە لەسەر ڕابردوو، کە چیدی لێرە نەماوە. قسەکردنیش لەبارەی (نا-ئێستا) وە بۆ حاجی وەک (حیکایەت) دێتە پێش چاو، کە قسەکردنە لەسەر (نا-واقیع). ناواقیعیش ئەوەیە کە لە ئێستادا نییە. بۆیە قسەکردن لەسەر ئەو شتەی کە لە

ئێستادا نییه، سەرفکردنی ئەو (سیم) و (زەڕڕ)ەیە کە لە(حاڵ)ی هەنووکەدا هەمانە. ئەمەش جگە لە بێ هیوایی (بێ ئەمەلی) شتێکی ترمان بۆ ناهێنێ.

مرۆڤ کە دەرکی بە (ئێستا) نەکرد و لە هەنووکەدا نەژیا، با (سولەیمانی زەمان)یش بێت، ئەوە لە ناو حەکایەتدا، واتە لە (نا ئێستا)دا دەژی و ئەمەش وا دەکا ئەو (سەڵتەنەت و حیشمەتە)ی هەیەتی بابەتێک، یان سەرمایەیەک نەبێت بۆ ژیان، بەڵکو بابەت و سەرمایەیەک بێت (بۆ گێڕانەوە):

حاڵە نەقدینەیە، موستەقبەل و ماضی پەشمە
بێ ئەمەل سەرفی مەکە، سیم و زەڕی فورسەتی خۆت
ئەی سولەیمانی زەمان: ئاخیری دەیگێڕییەوە
بەحیکایەت، وەکو خۆت سەڵتەنەت و حیشمەتی خۆت.

حاجی لە شیعرێکی دیکەیدا باس لەوە دەکا، کە ئەو نیازی وابووە، یان تەماعی وا بووە هەم دنیا و هەم قیامەت بۆ خۆی بێت، بەڵام لە غوربەت تێدەگات کە دنیای لە دەست دەرچووە و بە قیامەتیشی نەگەیشتووە. بۆیە ژیانی غوربەت ئەگەر ژیانێکی پادشایانەش بێت، هێشتا مرۆڤ ناتوانێ تێیدا سەردەمی لاوی و یادی وڵات، لەبیر بکات :

تەماعم بوو دونیاو و عوقبا بخۆم
ئەمم چوو لەدەست ئەوم بۆ نەهات
لە غوربەت بە شاهیی لەبیر ناکرێ
زەمانی جوانی و یادی وڵات

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، وەکئەوەی حاجی بیەوێت بۆ ساتێک خۆی لە هەنووکەی خۆی بدزێتەوە، کە نغرۆی نۆستالیژیا و دەردی دوورییە و دەیەوێت لە درزێکی ئەم شیعرەوە، شتێکیترمان پێ بڵێت. ئەوەی کە حاجی نایەوێت ببێتە حیکایەتخوانی غوربەت و لە نۆستالیژیای ڕابردوودا خۆی نغرۆ بکا، (ئەمەش بەو شتەیە لەم درزی بەیتەوە دەیەوێت پێمان بڵێ)، ئەوەیە کە دەزانێت بەو کارە هەم دڵی یارانی وەتەن دەشکێ و هەم ئێستای حاجی گیرۆدە دەبێ بە زەمەنێکەوە کە چیدی نەماوە. بۆیە دوا بەیتی ئەم شیعرەی لێرەدا ڕاڤەی دەکەم، جەختکردنەوەیە لەسەر بەیتی یەکەم، کە تیایدا گوتبووی: نابێت چێژی هەنووکەیی خۆمان تاڵ بکەین و لە جیاتی بەرهەمهێنانی مانا لە زماندا، قسەی بی سەروپا بکەین. زمان بۆ حاجی قادر زیاتر لەوەی ئامراز بێت، ستاتوو و پێگەیەکە. بەهەمان شێوە حاجی لەگەڵ ئەوەشدا کە ناتوانێت (زەمانی جوانی) و (یادی وڵات) لەبیر بکات، بەڵام ناشیەوێت کاتی ئێستا بەهۆی باسکردنی

(غوربەت)ەوە بە فیڕۆ بدات، چونکە ئەوەش جۆرێکی تری قسەکردنی بی سەروپایە. جۆرێکی تری تاڵکردنی لەززەتی بیرکردنەوە و بی موبالاتیە لە ئاست بیرکردنەوە لە ئێستا:

بۆچی یارانی وەتەن دڵ دەشکێنی (حاجی)

ظاهرا ناچیتەوە تۆ، باسی مەکە غوربەتی خۆت

حاجی سەراپای تەمەنی لەو دیو پەردەیەکی نۆستالیژیانە و باسکردنی ڕابردووەوە خۆی پیشان ئێمە داوە، کەچی لەم بەیتەدا بۆ ساتێک درزێک لەم پەردەیە دەکات و سەر لە گوێچکەمان نزیکدەخاتەوە بۆ ئەوەی پێچەوانەی ئەمەمان پی بڵێت! بۆیە ئەم درزدروستکردنە لە ئەزموونی شیعری حاجیدا یاسا نیە و لە یاسا بەدەرە. یاسای شیعری حاجی قسەکردنێکی نۆستالیژیکە لەبارەی ڕابردووەوە.

ئێستا دەگەڕێمەوە بۆ ئەو بەیتەی پێشووتری حاجی و دووبارە پرسیار دەکەم: ئەو دەستەگوڵەی حاجی لە گەمەی نێوان خۆی و کات دا، بەدەستییەوەیەتی و گەمەکەی پێدەباتەوە چییە؟:

لەم وەقتە هەرکەسێ وەکو (حاجی) گوڵشەنا

دەستەگوڵی بەدەستەوەیە، دەستی بردەوە

ئێمە تێگەیشتین کە ژیان بۆ حاجی، ژیانە لە ئێستادا، ئێستای (نەقدینە) و پڕ لە فورسەت و (سیم و زەڕ). ئەمەیە ژیان لە گوڵشەندا بە مانا ئێستاییەکەی. مرۆڤ لە دەرەوەی تێفکرین لە ئێستا قسەی بی سەروپا دەکات و لە هەنووکەدا ناژی، بەڵکو لە حەکایەتدا دەژی. ئەو کەسەش کە لە حەکایەتدا بژی ناتوانێ دەستە گوڵی بە دەستەوە بێت. واتە ناتوانێت ئەو دەستمایەیەی بە دەستەوە بێت کە بۆ بردنەوەی گەمەکە لەگەڵ کات و لە پێناوی دەرککردنی ئێستادا پێویستی پێیەتی. ئەو کەسە ئەگەر حەزرەتی سولەیمانی زەمانیش بێت و خاوەنی سەڵتەنەت و حیشمەتیش بێت، گەمەکە لەگەڵ کاتی هەنووکەدا دەدۆڕێنێ و لە ئەنجامدا جگە لەگێڕانەوە و حیکایەتکردن هیچ دەستکەوتێکی تری نابێت. چونکە ئەو بێموبالاتانە چرای بیرکردنەوەی خۆی سوتاندووە و ڕووناکییەکی نەبووە ڕێگای ژیانی بۆ ڕووناک بکاتەوە.

حاجی پێیوایە تاقە ڕێگایەک کە وامان لێدەکا لەگوڵشەندا بژین، قسەکردن و بیرکردنەوەیە لە ئێستا و هەر ئەمەش بەرەو بردنەوەمان دەبات. ئێستای حاجی، ئێستای بەرهەمهێنانی زمانە و خۆ دوورخستنەوەیە لە قسەی بی سەروپا. ئەوەی حاجی لە ئێستادا بەرهەمی دەهێنێ، جۆرێکی، یان دۆخێکی تایبەتە لە زمان کە ئەویش زمانی

شیعره، پاشئەوەی تێگەیشت شوێنی لەدەستداوە و ناتوانێت بۆی بگەڕێتەوە. ئیتر شیعر دەکاتە نیشتیمان و جگەرگۆشە و خێزانێکی لەگەڵ پێکەوە دەنێت. شیعر بۆ حاجی ئەو دەستە گوڵەیە کە ناهێڵێت لە گەمەکردنیدا لەگەڵ کات، بدۆڕێ. شیعر بۆ حاجی بەرجەستەکردنی کاتی ئێستایە و شوناسیەکە حاجی لەلایەکەوە خودی خۆی لە ڕابردوودا، لەگەڵ خودی خۆی لە ئێستادا، پێ جیا دەکاتەوەو لەلایەکیتریشەوە، خۆی لە ئەوانیتر پێ جیا دەکاتەوە. واتە لە ئەوانەی کات بە فیڕۆ دەدەن و ڕابردووی خۆیان دەکەن بە حیکایەت و داهاتوویان پڕ دەکەن لە (پەشم). بەوجۆرەش حاجی دەیەوێ شوناسی خۆی پەیوەست کات بە (ئێستا)وە. کاتی هەنووکە بکاتە کێشەیەک و شیعریش بکاتە گەرانتی ئەو شوناسیە. مۆدێرنیزمی حاجی لە دروستکردنی دەوڵەت و گەیشتنەوە بە کاروانی گەلان لەسەر ئەرزی وڵات و زێد، دەبێتە مۆدێرنیتەیەکی زمانی، کە ئەو لە ڕێگەیەوە هەم خۆی و هەم نیشتمان دروستدەکاتەوە و هەمیش پێکیان دەگەیەنێتەوە. *بیرکردنەوەی حاجی دەگۆڕێت، بەڵام ئەم بیرکردنەوەیە لەسەر عەردی واقیع هیچ گۆڕانێک دروست ناکات*، جگە لەوەی شوناسێک دەهێنێتە بەرهەم. ئەمەش دەرگای باسێکی دیکەمان لەسەر دەکاتەوە.

# ئێستا، شیعر، شوناس

هەموو پرسیارکردنێک لە ئێستا و هەر جۆرە بەرجەستەکردنێکی کاتی هەنووکە، لە پەیوەندییەکی قوڵدایە لەگەڵ کێشەی شوناسدا. بە مانایەکی دی: هەموو پرسیارکرنێک لەوەی (من کێم؟) لە هەستیارییەکی قووڵەوە دێت بەرامبەر بە تێپەڕین و تێگەیشتنێکی تایبەتی لە کات. پرسیارێکی لەو بابەتە نەک هەر پرسیارێکە لەناو چوارچێوەی کاتێکی تایبەتدا دەکرێ، بەڵکو پرسیارێکیشە کاتی ئێستا و هەنووکەییبوون دەکاتە کێشەی سەرەکیی بۆ پرسیارکەر. چونکە ئەگەر هەموو پرسیارکردنێک لە شوناس، دەستنیشانکردنی ئەو چوارچێوەیە بێت کە تیایدا خود پێناسەیەک بۆخۆی بەدەست دەهێنێ، ئەوە چۆن خود دەتوانێ ئەو بەشە لەخۆی کە لە ڕابردوودایە و ئەوبەشەی کە لەداهاتوودایە و ئەمانە هەردووکیان لە (ئێستا)دا نین، یەکبخاتەوە و لەکاتی هەنووکەدا خۆی وەکو خودێکی یەکپارچە پێناسە بکات .

بەشێوەیەکی پراکتیکی حاجی قادر ئەو ڕێگایەمان لێدەگرێ کە خود وەک خودێکی یەک پارچە پێناسە

بکەین، چونکە ئەو، ئەو بەشە لە کات ڕەتدەکاتەوە کە لەڕابردوودایە و ئەو بەشە لە خود کەمبایەخ دەکات کە لە داهاتوودایە. خود لەلای حاجی دەبێتە خودێکی بی ڕابردوو و بی داهاتوو. یان ڕاسترە بگوترێ: ڕابردوو و داهاتوو سەبارەت بە خود لە (ئێستا)دا، بایەخێکی ئەوتۆیان نیە، چونکە کاتێک خود بە ڕابردووەوە گیرۆدە دەبێ، دەکەوێتە حەکایەتکردن و ئەوکاتەش کە فورسەتی حاڵی نەقدینە ناقۆزێتەوە، لە داهاتودا بێ (ئەمەل) دەبێ.

بەم پێیە خود تەنیا لە دۆخێکی هەنووکەییدا، خودێکی خاوەن شوناس و خودێکە کاتی خۆی دەژی و لە ئێستاییبوونی خۆیدا بەرجەستە دەبێت.

حاجی قادر خۆی وەک ئەو خاوەن شوناسە پێناسەدەکا، کە دەرکی (ئێستا)ی کردووە و بەمەش گرەوی لەکات بردۆتەوە بەوەی نەهێڵێ کات لەڕەوتی تێپەڕینی خۆیدا، حاجیش بکاتە بەشێ لە ڕابردووی خۆی. چونکە حاجی قادر خۆی بە بەرهەمی ئێستا دەزانێ و بە بەرجەستەکردنی خۆی لە ئێستادا (بەهۆی شیعرەوە)، ڕێگیریی دەکا لەوەی لەناو زەمەندا بیر بچێتەوە :

**زەمانی حاڵە (حاجی) حاصلی تۆ،**

**دەبێتە دوێنێ، ئەمڕۆ، میسلی فەردا**

یان:

**زەمانی (حاڵ) و سەرمایەی بەد و نیکت نەبوو کەڵکی**
**لە موستەقبەل بڵێ: حاجی لە (ماضی) دا زەمانی بوو**

بۆ ڕوونکردنەوەی زێدەتری ئەم بۆ چوونە، بە پێویستی دەزانم جۆرە بەراوردێک لە نێوان ئەو شیعرانەی حاجیدا، کە ڕاستەوخۆ باس لە کات دەکەن لەگەڵ ئەو شیعرانەی کە باس لە شیعر دەکەن، بکەم. چونکە حاجی بە دیوێکدا ستاییشی (ئێستا) دەکات و بە دیوەکەی تریشدا و لە هەمان دۆخی ئێستادا ستاییشی شیعر دەکات. بەمجۆرەش پەیوەندییەک لە نێوان زەمەنی ئێستا و شیعردا دروستدەکات و وەک پێشتریش گوتم، شیعریش ئەو (دەستە گوڵە)یە کە حاجی بەهۆیەوە گرەوی پێ لە زەمەن دەباتەوە.

شیعر وەک دۆخێک لە زمان و زمان وەک کردەیەکی مرۆڤانە و وەک بەرجەستەکەری شوناس، ئەو دەربڕینەیە کە زەمەن لە خۆیدا جێدەکاتەوە، بەجۆرێ کە لە (موستەقبەل)دا، کە هێشتا نەهاتووە دەتوانرێ بگوترێ: حاجی لە (ماضی) دا، خاوەن (زەمان)ی خۆی بوو. واتە کاتی داهاتوو بەوە شانازی بکات، کە بەیادهێنەرەوەی (زەمانی حاڵ)ی شاعیرە لە ڕابردوودا و بەمەش ئەو ڕابردووە لە (ئێستای داهاتوو)دا بەرجەستە ببێت. ئەمەش بە مانای ئەوەیە شیعر وەک دۆخێک لە زمان و زمان

وەک بەرجەستەکەری شوناس، ئەو بوارەیە کەئیمکان دەداتە حاجی باس لە مانەوە و زیندوێتی خۆی بکات لە ناو (حاڵ)ی هەموو ئەو کاتانەی لە داهاتووشدا دێن. ئەو ڕاشکاوانە گوتویەتی:

**لە سایەی شیعرەکانی وەک فەرەیدوون**
**دەمێنی "حاجی" تا دەورانی گەردوون**

یان:

**ئەوی شاعیر نەبێ کۆرە وجاغی**
**لە سایەی شیعرەکان، بابی کوڕانم**

یان نووسیویە:

**ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانی**
**موحەققەق داکی حیزە، بابی زانی**

تا دەگاتە ئەوەی ڕاشکاوتر بنووسێت:

**بە ئومێدی ئەسەری حوسنی ڕەزا دەچنە وڵات**
**شیعرەکانم کە سەراپا وەکوو خۆم بێ سەروپان**

**یاوەکوو بەیتی شیرین و فەرهاد**
**شیعری حاجی لەبەر کرایە بە یاد**

بە چاوپۆشی لەو ڕوانگە نێرانەیەی لە هەندێک لەو بەیتانەدا ئامادەییان هەیە و بەهۆیەوە لەلایەکەوە: شیعر وەک وەچەی ڕیز لێگیراوی سیستەمی باوکسالاری، کە

کوڕە، خراوەتە ڕوو، لەلایەکی تریشەوە، بنەچەیەکی باوکسالارانەی بۆ زمان لەپێشچاو گرتووە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا حاجی مەسەلەی زمان و شیعر وەک مەسەلەیەکی چارەنووسساز دەخاتە ڕوو، کە پەیوەندی بە شوناسی مرۆڤەوە هەیە.
بۆ تێگەیشتن لەو پەیوەندیەش، پێویستە بزانین حاجی لە دیوانەکەیدا زیاتر لە یازدە شیعری بە تایبەتی و ڕاستەوخۆ بۆ دووان لەبارەی کاتەوە، تەرخانکردووە، یاخود دەتوانین بڵێین کاکڵەی مانای ئەو شیعرانە لە دەوروبەری کات دەخولێنەوە. لەو یازدە شیعرە، یان بەیتە شیعریانە حەوت بەیتیان جەخت لەسەر (ئێستا) دەکەنەوە، لە قەسیدەی (گوتم بە بەختی خەواڵوو)شدا تا بەیتی ژمارە (32) ستایشی ڕابردوو دەکات و پاشان کە خەبەری دەبێتەوە، زەمەن دەبێتەوە کاتی ئێستا.
لە هەمان کاتدا، حاجی زیاتر لە (18) شیعر و بەیتە شیعری هەیە کە تیایاندا ڕاستەوخۆ ستایشی شیعر دەکات، یان ناوی ئەو شاعیرانە دەهێنێ کە لە بواری شیعردا بۆ حاجی سەرمەشقن و لە ناو ئەوانەشدا (نالی) سەردەستەی شاعیرانە، کە یازدە جاران ناوی هاتووە.
بەم پێیە تێڕوانینی حاجی بۆ شیعر پەیوەستە بە تێگەیشتنی ئەو لەکات، بە تایبەتیش کاتی ئێستا.

به پێی ئەو تێگەیشتنە، کاتی (ئێستا) کاتی (نەقدینە) و کاتی (فورصەت) و کاتی کردە و جوڵەیە. مرۆڤ لە ناو کاتدا بوونەوەرێکی چاوەڕانکردوو و بێدەسەڵات، یان کائینێکی گریاو نییە بەسەر ڕابردوودا، بەڵکو بکەرێکە، لە هەنووکەی بوونی خۆیدا دەژی و بوونی خۆی بەهۆی کردەکەیەوە لە (حاڵی نەقدینە) دا دەسەلمێنێ. واتە بە هۆی کردەکەیەوە دەبێتە خاوەن شوناس، شوناسی ئەویش ئەنجامی هووشیاربوونی ئەوە بەرامبەر بە کاتی ئێستا و ئێستاش ئەو کاتەیە کە تیایدا وەک بکەر دەربکەوین و بەمەش ببینە خاوەن خودی خۆمان[1]

ئەو کردەیەی کە خود وەک بکەر لەکاتی ئێستادا پێی هەڵدەستێ، بریتیە لە دوورکەوتنەوە لە حیکایەت و قسەی بێسەر و پا، واتە بریتیە لە بەرهەمهێنانی فۆرمێک لەزمان کە ئەویش زمانی شیعرە. خود تەنیا لە ناو زمانێکی تایبەتدا، خودێکی خاوەن شوناسە و ئەم شوناسەش ئەوەیە کە دەمێنێتەوە، یان پێویستە بمێنێتەوە، چونکە بەڵگەیە بۆ بوونی ئێمە لە زەمەنی خۆماندا. شیعری (خانی و نالی)ش لەو بابەتەن و حاجی

---

[1] من وشەی شوناس بە مانایەکی تایبەتی کە ڕەهەندی مەعنەوی دەگرێتەوە لە وشەی ناسنامە کە ڕەهەندی ماتریالیی و کاغەزی و ئیداریی دەگرێتەوە، بەکار دەهێنم. بڕوانە: ڕێبوار سیوەیلی: شوێن و شوناس: ل: 71

دەیەوێت لە ڕێگەی بەرهەمهێنانی شیعرەوە، بێتە خاوەنی هەمان شوناسی ئەوان:

ئەمانە زادەیی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن، ئەگەر شەل و ئەعما

وای بخوێنن لەوەجهی موحتاجی
وابزانن بە خۆیەتی (حاجی)
هەم ڕەواجی بدەن لە هەر لاوە
تێ نەگەن مردووم، بڵێن: ماوە

لە ڕاستیدا ئەوەندەی حاجی قادر لە (ئێستا)ی خۆیدا تەماهی لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی خۆی و پێش خۆیدا دەکات، ئەوەندە خۆی لە هاوسەردەمەکانی بە نزیک نازانێ و ڕەخنەیان لێدەگرێ و ئامۆژگارییان دەکا بەوەی کە قەدری زمان بزانن و شیعری شاعیران بپارێزن:

وونی مەکەن وەکو ئاثاری (نالی)ی و (کوردی)
ئیتتیفاقەن ئیتتیفاقم بوو لەگەڵ (نالی) وەکوو
تاجیر و گەوهەر لەگەڵ گەوهەر فرۆش و موشتەری

سەد قوببەیی خەورنەق و سەددی سکەندەری
ناگاتە بەیتە کاولی (نالی) و مەکانەتی

کوردەکی کۆیی – کەوتەوە یادم
پێم گوت: ئایا چلۆنە ئوستادم؟
.............
واقیعە خزمەتی لە بۆ خوایە
چ دەبوو گەر بە کوردی نەبوایە
هەر کەوای گوت، وەها موکەددەر بووم
وام دەزانی کەوا لەدین دەرچووم
گوتم: ئێستاش لەسەر کەری ماوی
چابوو مستم نەدا لە نێو چاوی

شیعر بۆ حاجی زادەی بیرو خۆشەویستیە بۆ زمان، نەک بۆ هاوزمانان، هاوزمانان قەدری شیعر نازانن، هەروەک چۆن قەدری شیعری شاعیرانی پێشووتریشیان نەزانی و ونیان کردن. ئەمە جگە لەوەی بەشێکی زۆر لە (ئەهلی زەمانە) بەگشتی لەلای حاجی، خەڵکانێکی نەزان و گێلن و بۆ گەیشتن بە بەهەشت عەقڵی خۆیان تەسلیمی ئەو کەسانە کردووە کە جگە لەتەمبەڵی هیچی دیکە فێری مرۆڤ ناکەن، بەبێ ئەوەی بزانن کە بۆ چوونە (جەننەت) تەمبەڵی و ڕیش بەردانەوە، دادی کەس نادات:

ئەهلی جەننەت، نەشوان و گاوانە
صاحیبی فەنن و عیلم و عیرفانە

هەرچی بێ بەهرەیە لە کەسبی کەماڵ
دەبتە دەروێش و مارگر و حەمماڵ

..........

کوردی ئێمە نەزان و پاشکەوتن
پێکەوە پووش و ئاگر و نەوتن

..........

لێی گەڕێ قەومی تۆ هەموو مارن
دزو حیز و پیاو کوژ و هارن

کەواتە حاجی لە هاوزمانان و هاوسەردەمەکانی تووڕەیە، چونکە لە ڕێگەی ونکردنی شیعرەوە، شوناسی خۆیان ونکردووە. لە کاتێکدا ستایشی ئەوانەی وەکو (خانی و نالی) دەکا، کە لە سەردەمانێکی تردا شوناسی خۆیان لەناو شیعردا بەرجەستە کرد و بەمەش هەم خۆیان و هەم زمانی ئێمەیان لە شالاوەکانی دەسەڵاتی بیرچوونەوە پاراست. لێرەشەوە دەتوانین بڵێن: لە ڕوانگەی حاجی قادرەوە هاوسەردەمی مەرجی هاوشوناسی نییە. چونکە زۆرن ئەوانەی لە سەردەم و کاتی شاعیردا دەژین و خافڵن لە ئێستای خۆیان و لە قسەی بێ سەروپا زیاتریش، هیچی تریان لەدەم نایەتە دەر. ئەوان مانا بەرهەم ناهێنن لە زماندا، بەڵکو زمان

وەک هۆیەکی کات بەسەربردن مەسرەف دەکەن، بۆیە شوناسی ئەوان جیاوازە لە شوناسی حاجی  کە لە ئەنجامی ئامادەبوون لەدۆخی (ئێستا)دا بەرجەستە بووە و ئەم ئێستایەش ئێستایەکی شیعرییە. واتە لە فۆرمێکی تایبەتی زماندایە.

بەمجۆرەش کاتی ئێستا بۆ حاجی ئەو کاتە نییە کە هەمووومان وەک کورد تیایدا دەژین و یەک شوناسمان هەیە، بەڵکو ئەو کاتەیە کە ئێمە هاوشوناسین. کاتێ کە شیعر شوناسی ئێمەیە. لێرەشەوە تێدەگەین بۆچی ستایشکردنی ئێستا، یان کاتی هەنووکە لە لای حاجی هاوتەرییە بە ستایشکردنی شیعر و شاعیران. چونکە شاعیرەکان هاوکاتی ئێمەن و هاوزمان و هاو شوناسمانن، نەک هاوسەردەمەکان. حاجی بەباشیی دەرکی بەوە کردووە، ئەوەی دەمێنێتەوە شیعرە و فۆرمی شیعریانەی زمان بەرجەستەکەری شوناسی مرۆڤە لە ئێستادا. بۆیە ئەگەر حاجی بیەوێت بمێنێتەوە، دەبێت بوونی خۆی وەک بکەرێک لە ئێستای ژیانی خۆیدا، بەهۆی شیعرەوە بسەلمێنێ و خۆی بخاتە ڕیزی ئەو شاعیرانەی کە وێرای تێپەڕینی سەردەمەکەیان، کەچی هاوکات و هاوشوناسی ئێمەیشن لە ئێستادا.

بەم پێیەش ئاشکرا دەبێ کە گەمە و شەڕ و هەستیاریی حاجی بەرامبەر بەکات، نە لەترسی مەرگە، بەڵکو لە پێناوی شیعر و زماندایە وەک ئەو بوارەی کە مانەوەمان بۆ دەستەبەر دەکا و ناهێڵێ لەگەڵ تێپەڕینی بێ ئەمانی کاتدا ون و نغرۆ ببین.

وەلێ ئایا بەڕاست ئەو خەسڵەتانە چین لە شیعردا کە ناهێڵێت مرۆڤ بکەوێتە خانەی لەبیرچوونەوە و ئەو هێزە چییە لە زماندا وادەکات ببێتە هێزێکی بەرەنگاری لە ئاست (زەمەن)دا؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە هەوڵدەدەم لە خەسڵەتەکانی زمان و زمانی شیعری، وەکئەوەی حاجی باسیان دەکات، بدوێم. ئەمەش بۆ ئەوەی تێبگەین کە تێگەیشتن لە کات نەک هەر پەیوەستە بە شوناسەوە، بەڵکو پەیوەستیشە بەتێگەیشتن لە تواناکانی زمانەوە، بەتایبەتیش زمانی شیعر.

## خەسڵەتەکانی شیعر، دەسەڵاتی زمان

لەم بڕگەیەدا هەوڵی من بۆ ئەوەنییە تیۆرەکانی زمان و فەلسەفەی زمان بەسەر بکەمەوە، یان بیانکەمە هۆکارێکی بەرچاوڕوونیی بۆ تێگەیشتن لە شێوازی دەرککردنی حاجی قادر بۆ زمان و زمانی شیعری. بەڵکو دەمەوێ

بزانم چاوەڕوانییەکانی حاجی لە زمان چین و زمانی شیعر لەلای ئەم شاعیرە چ توانایەکی هەیە و خەسڵەتەکانی کامانەن. بەمانایەکی تر، دەمەوێ ئەو سنوورانە بناسمەوە کە حاجی لە چوارچێوەیاندا هوشیاری خۆی بەرامبەر بەزمان دەردەبڕێ. هەڵبەتە بە پێویستی دەزانم ئەوە بەیادی خوێنەر بهێنمەوە کە حاجی قادر لە شیعری کلاسیکیی ئێمەدا یەکەم شاعیر نییە باسی لە زمان و زمانی شیعری کردبێ و لەو دەلاقەیەشەوە هووشیاری خۆی لە ئاست زمان و دەسەڵاتی زماندا بەیانکردبێ. شیعری کلاسیکیی ئێمە نمونەگەلێکی بەرچاوی سەبارەت بە هووشیاری شاعیرانمان لەسەر زمان تێدایە و پێشینەی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ شاعیرانی مەزنی وەک (جەزیری، خانی و مەولەوی و ئەوانیتر و لەگەڵ نالیی شاعیریشدا ئەم هووشیارییە دەگاتە پلەیەکی زۆر بەرز). وەلێ ئەگەر لەلای ئەم شاعیرانە، جگە لە نالی، بیرکردنەوە لە زمان لە چوارچێوەی چەند بەیت و نیوە بەیتێ تێپەڕی نەکردبێ، ئەوە لەلای حاجی زمان و هووشیاریی بەرامبەر بەزمان دەبێتە پرۆژە و بەشێکی زۆری شیعرەکانی ئەم شاعیرە شایەتی ئەم بۆ چوونە دەدەن.

خاڵی جیاکاره له نێوان حاجی و شاعیرانی پێش خۆی هەر لەڕووی چەندایەتییەوە نییە، بەڵکو هووشیاریی ئەو بەرامبەر بە زمان ڕەهەندێکی چۆنایەتیش وەردەگرێ. ئەگەر بۆ شاعیرانی پێش حاجی، زمان تەنیا هۆکارێکی دەربڕین و جوانکاریی شیعر و خۆسەلماندنی زمانی کوردی بوبێت وەک زمانێکی پەراوێزی لە ئاست و هاوشان بە زمانە دەسەڵاتدارەکانی وەک فارسی و عەرەبی و تورکی، ئەوە لەلای حاجی، وێڕای ئەو خەسڵەت و ئەرکانەی زمان، ڕەهەندگەلی جیاوازتریش و ئەرکی زۆر زیاتریشی دەکەوێتە سەرشان.
دەتوانین بوونی زمان لەلای حاجی بکەینە دوو لق، واتە زمان لە تێڕوانینی ئەودا دوو ئاست بەخۆیەوە دەگرێ: ئاستی گشتی و ئاستی تایبەت. ئاستی گشتی زمان، ئەو ئاستەیە کە هاوزمانان و خەڵک، کورد و کۆیی و سلێمانی و.. لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا بەکاری دەهێنن. بەهۆیەوە لە یەکتر حاڵی دەبن و زۆر جارانیش قسەی بێ سەروپای پێدەکەن، لە بابەت ئەو قسانەی کوردە کۆییەکە سەبارەت بەزمانی کوردی بەحاجی قادریان دەڵێت. یاخود لەبابەت ئەوانەی خۆیان بە (ئوستادی فارسی و تازی) دەزانن و دەیانەوێ لەسەر حیسابی زمانی کوردی ببنە (فەخری رازی):

ئاخر ئەم عەقڵەیان هەبوو بۆیێ
گەر سولێمانییە وە یا کۆیێ
بوونە ئوستادی فارسی و تازی
تا گەیشتن بە فەخرەکەی ڕازی

زمان لەلای ئەمانە ئەو زمانەیە کە لە خانەقا و تەکیەکاندا، بەناوی شەریعەت و ئایینداریییەوە، خەڵکی فێری (تەمبەڵیکردن، ڕمووز و ڕاز ونیاز) دەکات و ئەوانیتریش، واتە غەیرە مسوڵمانان لەسەر ئاستی (گاوربوون، هیندبوون و جوولەکەبوون) پۆلێن دەکات. زمانی ئەمانە زمانی زیکر و دووعایە، زمانێکە لە مرۆڤدا ڕۆحی ملکەچی، ڕیاکاریی و چێژپەرستی و تەماعکاری بەرهەم دەهێنێ. ئەم زمانە بەرجەستەکەری دۆخی بیر کردنەوە و تێڕامان نییە و هزر لە زمانێکی وەهادا ڕووناکی بەخش نیە. ئەم زمانە نامان گەیەنێ بە ڕۆشنگەری.

وەنەبێ ئەمە تەنها ئاستی زمانی خەڵکە ئاساییەکە و شێوازی ژیانی ئەوانە بێت کە لە پەنجەرەی خانەقاوە دەڕواننە جیهان. بەڵکو ئەمە هەمان ئاستی زمانیشە لەلای (عولەما)کان و ئەوانیش لە زمانی خۆیاندا هەمان نەزانی بەرهەم دەهێننەوە کە دژی دینامیەتی زمان خۆیەتی و

بێئاگایی لێدەڕژێ، وەکئەوەی حاجی باس لە پسپۆڕە ئەکادیمییەکان و ڕۆشنبیرانی ئەمڕۆمان بکات:

**یەکسەر عولەما درشت و ووردی**
**ناخوێننەوە دوو حەرفی کوردی**
**ئوستادی خەتن لە ئەم سیانە**
**وەک دی لە زوبانی خۆی نەزانە**

ئەم ئاستە لە زمان لەسەر پرنسیپی چەقبەستن و دووبارەکردنەوە کار دەکات. توانای تێپەڕاندن و نەریتشکێنی نییە و ڕێگریشە لەبەردەم گەشەی «خوێندەواری و کیتابەت». ئەم زمانە «نە تەرجەمەی پێدەکرێ» نە توانای ئەوەی هەیە «ئەسراری کتێبی خەڵقی تر» ئاشکرا بکات. زمانێکە مەسرەف دەکرێت و بەرهەم ناهێنێ، هەر بۆیەش ئەم زمانە زمانی هۆشیارکردنەوە نییە و بێئاگایە لە تێپەڕینی کات و بێتوانایە لە بەرجەستەکردنی شوناسدا. ئەمە زمانی ملکەچییە و قاموسەکەی پڕە لەو وشە و دەستەواژانەی مرۆڤ بچوک دەکەنەوە، فێری ئەوەی دەکەن خۆی بە (غولام) و (نۆکەر) و بزانێ و بە «قوربان قوربان»شوێنکەوتەی ئەوانیتر بێ، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی ڕۆحی کۆیلایەتی تێدا بخەملێت. هەر ئەم ڕۆحی خۆ بەکۆیلە و کەمزانییەشە وایکردووە

هاوزمانەکانی حاجی لەناو خۆیاندا دوژمنی یەکتربن و بۆ ئەوانیتریش ببنە گزیر و سەپان و نۆکەر و بوونی خۆیان لە بوونێکی سەربەخۆوە بچووک بکەنەوە بۆ سەر ئاستی بوونێکی شەرمنانە.

با چەند نمونەیەک لە شعرەکانی حاجی بهێنینەوە، کە ڕێگەی ئەم جۆرە خوێندنەوەیەمان بۆ ئاسان دەکەن:

هەر کوردە لە بەینی کوللی میللەت
بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت
بێگانە بە تەرجەمەی زوبانی
ئەسراری کتێبی خەڵقی زانی

..............................

میللەتی بێ کتێب و بی نووسین
غەیری کوردان نیە لەڕووی زەمین

میللەتیش هێند کەرن وەکو جاران
دەستیان ماچ دەکەن، دەڵێن: قوربان

قەید و تەذبیب و شەرع و حاشیەکان
بوونە سەددی مەعاریفی کوردان

عولەمامان بە قەولی بێ سەروپا
پاکی خنکا لە بەحری ووشکی هەوا
صنعەتێک فێر نەبوون لەپاش تەحصیل
سەیری چۆن بۆ مەناهی بوونە دەلیل

بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزییر
نەک لە خۆیان یەکێکی بێتە ئەمییر

حاجی قادر لەبەرامبەر ئەم دۆخەدا، لەلایەکەوە، خەم دەخوات، عەزاب دەکێشێ و دەیەوێ لە هۆکارەکانی تێبگات و کوردان هاندەدات لەو بارودۆخە خۆیان ڕزگار بکەن:

من لەغەمخواری ئەم قسانە دەکەم
وەرنە پەشمە لەلام هەموو عالەم

دەفەرمووی ئەم عەزابە بۆچ دەکێشی
چ مەلزوومە ئەگەر چاووت نەیێشی

لەلایەکی دیکەشەوە، حاجی لە دژی زمانی کۆیلەیی و نەریتپەرستی و ئەو زمانەی کە لە ناخی مرۆڤدا «بێ شعوری و گێژ و وێژی» دەچێنێ و وایان لێدەکات ببنە «موتیعی لۆتیی خوێڕی و هەرزەبێژ»، کار دەکات بۆ هێنانە ئارای زمانێکی تر. زمانێک توانای دەقشکێنی و

تێپەڕاندنی هەبێت لە هەموو ئەو ڕێگرانەی کە لەبەردەمیدان و ناهێڵن مرۆڤی کورد بەرەو ڕۆشنگەری بڕوات و لە هەرزەبێژی ڕزگاری ببێت. ئەم زمانەی حاجی کاری پێ دەکات، ئاستێکە لە زمان کە دەرک بە گۆڕانی زەمەن دەکات و بارگاوییە بە خەون و ڕوئیا. زمانێکی فرە ڕەهەندە و چەقبەستوو نییە و دینامیکانەیە.
ئەمە ئاستی دووەمی زمانە، زمانێکی تایبەتە و زمانی شوناس و خۆسەلماندن و مانەوەیە. ئەمە زمانی شیعر و شاعیرەکانە، یان ڕاستترە بگوترێ: ئەمە هەمان زمانە کە زەینی شاعیرانی بۆ بەرجستە کردووین و شیعرەکانیشیان گەواهی ئەوە دەدەن کە ئەوان لە (کات)ی خۆیاندا ژیاون و ئاگا بوون بەرامبەر بەو جیهانەی تێیدا ژیاون.
ئێمە بەهۆی ئەم ئاستە لە زمانەوە، لەگەڵ ئەواندا دەچینە پەیوەندییەوە، لە کاتێکدا هەزاران کەس هاوسەردەمی ئەوان بوون و ئێستا ئێمە ناتوانین پەیوەندییان پێوە بکەین، چونکە شوێندەستێکیان بۆ بەجێ نەهێشتووین و مردوون. شاعیر دەتوانی لەیەک سەردەمدا لەگەڵ هاوزمانەکانیدا بژی، بەڵام مەرج نییە هاوشوناسیان بێت، چونکە زمانی هاوسەردەمەکان زمانێکی گشتی و پڕە لە قسەی بێ سەروپا، کە نیشانەی بێئاگایی ئەوانە لە ئاست

(ئێستا)ی خۆیاندا. شاعیر بەهۆی زمانە تایبەتیەکەی خۆیەوە، هەم خۆی لە هاوسەردەمەکانی دابڕ و جیا دەکاتەوە و هەم لە سەردەمەکانیتردا خۆی بەرجەستە دەکاتەوە و دەبێتە هاوزمان و هاوشوناسیان. خۆی لە هاوسەردەمەکانی دابڕ دەکات چونکە ئەوان زمان تەنیا لە ئاستی مەسرەفکردنی ووشەکاندا بەکار دەهێنن و چاوەڕوانییەکی تایبەتییان لە زمان نییە. لەکاتێکدا حاجی قادر وەک شاعیرانی سەرمەشقی خۆی، بەوەی کە لە سەردەم و کاتی ئێستای خۆیدا ئامادەیی هەیە و هووشیارە بەم ساتە وەختە، ئەوە هەموو ڕەهەندەکانی ئێستاش لە زماندا بەرجەستە دەکات. زمان بۆ حاجی دەبێتە ئامانج، هەر بۆیەش ئەو زیاتر لە(45) جار لە شیعرەکانیدا باس لە شیعر و زمان دەکات و زیاتر لە (25) بابەت دەست نیشان دەکات کە هەموویان ئەو بابەتانەن حاجی چاوەڕێ دەکات لە شیعر و زماندا ئامادەییان هەبێت. هەموو ئەو چاوەڕوانیانەی حاجی لە زمانی شیعر، چاوەڕوانیی واقیعیانەن و سیمایەکی زیندووی ئێستایی دەدەنە زمان و شیعر، کە لە زۆر ڕووەوە جیاوازن لەو خەسڵەتانەی کە لە زمانی هاوسەردەمەکان و مەسرەفکەرانی زماندا هەن و پڕن لە دەربڕینی ناواقیعیانە و خورافیانە.

بەوجۆرەش، حاجی بە بارگاویکردنی زمان بە کێشە و بابەتەکانی (هەنووکە)، زمان لە کۆت و بەندی بابەتە کۆنەکان ڕزگار دەکات و زمان دەکاتە زمانی بۆ ئێستا، یان دەیکاتە زمانی ئێستا و بەمەش دەسەڵات بۆ مرۆڤ دەگەڕێتەوە تا بەهۆی زمانی ئێستاوە، بە جۆرێک تەعبیر لە جیهانی خۆی بکات، کە تەعبیرکردنی خودێکی هۆشیار و خاوەن شوناس بێت، نەک خودێکی ملکەچ و ترسنۆک و بێ شوناس.

بۆ ئاسانکردنی کاری خوێنەر دەمەوێت لە ڕێگای دوو پۆلێنکردنەوە هەم بابەتەکان و هەم نمونەی ئەو شیعرانەی حاجی کە تیایاندا باس لە زمان و شیعر دەکات، بخەمە پێش چاو. دەمەوێت ئەوەش بڵێم کە بەهیچ جۆرێک نە بابەتەکان و نە نمونە شیعرییەکان، هەموو ئەو بابەت و نمونانە نین کە لە دیوانەکەی حاجیدا هەن. بۆی هەیە لە ڕێگەی توێژینەوەی  ووردەوە، گەلێ بابەت و نموونەی تر بدۆزرێنەوە کە هەموویان جەخت لەسەر ئەو چاوەڕوانی وخەسڵەتانە دەکەنەوە، کە حاجی پێی وابووە خەسڵەتی زمانێکی زیندوون و بابەتی شیعرن. بەمکارەش ئەو هیچی نەدەکرد لە فراوانکردنی پانتایی زمانی شیعری و داڕشتنەوەی پێناسەیەکی دی بۆ

زمانی کوردی، زیاتر وەک جێگرەوەیەک بۆ نیشتیمان و شوێنە لەدەستچووەکەی.

## پۆلێنکردنەکان

بابەتەکان وخەسڵەتەکانی زمان و شعر لەلای حاجی قادر:

بەپێی ئەم پۆلینکردنە بۆ بابەتەکان، یان خەسڵەتەکانی زمان و زمانی شیعری، دەتوانین بڵێن: زمان بەگشتی و زمانی شیعریی بەتایبەتی لەلای حاجی قادر، (پێکهاتوە لە:)، یاخود (سوودەکانی ئەمانەن:) و ئیمکانیەتەکانی ئاوا و ئاوان و سنوورەکانی بڕییتن لە...

حاجی بەهۆی ئەو پەیوەندییە زۆرانەی لە نێوان زمان و زمانی شیعریی و ئەو بابەتانەدا، دەسنیشانیان دەکات، دەلاقە و بواری فراوان لەبەردەم زماندا دەکاتەوە و دەیکاتە زمانی ژیان و ئەزموون و لە چەقبەستوویی ڕزگاری دەکات. سەرەتا بابەتەکان و پاشان نموونەی شیعرەکان دەنووسمەوە.

بابەتی شانازیکردن بە شیعرەوە:

هەتا لە خیتتەیی بێگانە فەخری پێوە بکەم

لە بەینی زومرەیی ئەحیاو و مەجمەعی مەوتا

بابەتی: زمان هەڵگری خەت و هەڵەیە:

لەپاش ئەوەی کە تەصیحە و موتاڵەعەی بکرێ
به یادی من لەبەری کەن لەڕوویی میهر و وەفا

نیه لە مومکینی ئیمکان خەتاو و سەهوی نەبێ

بابەتی پەیوەندیی شیعر و خۆشەویستی:

ئەمانە زادەی ئەفکار و خۆشەویستی منن
ئەگەر قەبیح و کەریهن، ئەگەر شەل و ئەعما

بابەتی زمان و ڕەوانبێژی:

مەڵێن فەصاحەتی کوردی بە فارسی ناگا
بەلاغەتێکی هەیە، هیچ زووبانێ نایگاتێ

شەهسواری بەلاغەتی کوردان
یەککەتازی فەصاحەتی بابان

بابەتی شیعر و زێڕ و زیو و دراو:

بەڵام ئەوانی کە صەڕرافی زێڕ و زیوی قسەن
بەشەە ڕەوایی دەزانن، چ سککەیێکە ڕەوا

لەلای ئەربابی خۆی بۆ قەدر و قیمەت
خەزێنەی گەوهەر و کیسەی دراوە

خەزنەییێکە بەیتی من، دوو میصرەعم داخستووە

بە ئوممێدی دووسێ دانەیە حاجی
بە هەرزانی دەدا دووڕڕی گرانی

ئێستە خەڵقی لە حەسرەتی دەمرن
بەیتەکانی لە زێڕو زیوو دەگرن
بابەتی زمان وەستان، سنووری زمان و وڕێنەی زمانیی:
گەلێ قسەم لە دڵا بوو، حیکایەتم مابوو
کە چی لەبەختی کەچم خامە نووکی لێرە شکا

داستانی هیجری من شەرحی بەنووسین ناکرێ
پێت دەڵێم: چۆنە ئەگەر چاوم بە چاوت کەوتەوە

با بلێن: ئەم شێتە قەحپە مردووە
چەند وەڕیوە، چەند وڕێنەی کردووە

سەد قائیمە و قەصیدە، کەس نایکڕێ بەپولێ

ڕۆژنامە و جەریدە کەوتۆتە قیمەت و شان

غەرەز دەست خەتتی تۆیە، ناعیلاجی
بڵا مەعنای نەبێ وەک بەیتی حاجی

نەقدی عومرم بە غەزەل داو و دوکانم دانا
هیچ کەسێ نەیکڕی، ترسام لە ڕزین و لە خوران

بابەتی دەسەڵات و فەرمانی زمان:
بۆ چی (حاجی) نەخوێنێ وەک تووتی
ئەم زوبانە هەزاری خستە قەفەس

شیر و قەڵەم شەریکن لەم عەصرەدا، دریغا
شییرم قەڵەم تراشە و کالانییە قەڵەمدان!

لە قافیە شوعەرا عەیبە لابدەن، ئەمما
بەیادی چاوی ئەمن، لادەدەم بە مەخصوصی

بەشییر و خامە دەوڵەت پایەدارە
ئەمن خامەم هەیە، شییر نادیارە

بابەتی شیعر و کارتێکردنی زمان:

هەرکەسەکی کەسە، ناکەس نیە، حەرفێکی بەسە

بە ئومێدی ئەثەری حوسنی ڕەزا دەچنە وولات
شیعرەکانم کە سەراپا وەکوو خۆم بێ سەروپا

بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن
مەقصەدم: لەم بەندو باوە دەربچن

*بابەتی شیعر کردنە دیاری، داخوازیکردنی شیعر و بەئەمانەت بوونی شیعر کە لە نەوەیەکەوە یان لە کەسێکەوە دەدرێتە نەوە و کەسێکی تر:*

چونکە توحفە لازمە هەر کەس لە غوربەت بێتەوە
بەم دوو فەردە من قەزای سەد گۆنە توحفەم کردەوە

خامە داخوازی دەکا ئەبکاری مەعنا، پێی دەڵێ:
ڕووسیاهی دووزمان، قەتعی سەرت کابینمە

چەند غەزەل بوون تازە بافتی کارگاهی موشتەری

یەک یەکی هێنایە دەر، گەردی کەسادی لێ تەکاند

دایه من فەرمووی دریغا کەس نییە سەوداگەری

بابەتی زمان و مانەوە بە هۆی شیعرەوە:

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنوسرایە زوبانی
مەلاو و شێخ و میر و پادشامان
هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی

(حاجی)یە شیعرەکانی وەک (کاوە)
ڕۆژێ دەبینن درەفشی هەڵداوە

وای بخوێنن لە وەجهی موحتاجی
وابزانن بە خۆیەتی حاجی
هەم ڕەواجی بدەن لە هەر لاوە
تێ نەگەن مردووم، بڵێن: ماوە.

لە سایەی شیعرەکانی وەک فەرەیدوون
دەمێنێ حاجی تا دەورانی گەردوون

زمان و زمانانی تر، زمان و تەرجەمە و نهێنی:

بۆ تەصیحەی زوبانی کوردانە

شیعرەکانم دەلیل و بورهانە

یا لەگەڵ فارسی چ فەرقی هەیە
بۆ چی ئەو ڕاستە، بۆ چی ئەم کەچەیە

کوردی ئاخر بڵێ چییە عەیبی
هەر کەلامی حەقە نییە عەیبی

بێگانە بە تەرجەمەی زوبانی
ئەسراری کتێبی خەڵقی زانی

چاکە ئێستا دەکا لە بۆ کوردان
تەرجەمەی شەرع و ئایەتی قورئان

بابەتی شیعر و حەقیقەت، ئاین و یەزدان و زمان:
بەیتی من چونکە کەڵکیان دەگرێ
لە غەریبی و بێ کەسی دەمرێ

بە قسەی چاکە دەستیان دەگرم
تەرکی ناکەم بە لۆمە تا دەمرم

مەعلومە بۆ چی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی
تاکەس نەڵێ: بە کوردی نەکراوە مەدحی باری

مەفهومی دوو حەدیسی صەحیحم لە بەیتەکا
جێ کردەوە، نەزەر بکە کوردی و فەصاحەتی

بابەتی زمان و یەکخستن، زمان و ئەزموون، مەعنا، شیعر و هەمەڕەنگی:

ئەگەر کوردێ قسەی بابی نەزانی

ببنە یەک لە تەعلیم و لە نوسین
جل و بەرگ و زوبان و ڕەسم و ئاین

قسەیێکم هەیە دەیکەم، مەڵێ بێ تەجرەبەیە
با وجوودی ئەوی نادانە لە لای وەک گەمەیە

شیعرەکانم کە غەریبی وەتەن و نەوسەفەرن
وەرە بیخوونەوە ئەم نوقتە، سەوابێکی هەیە
ئەم قسەی ئێستا عەیبی لێدەگرن
ئەو دەمەش دێ ئێوە بۆی دەمرن

نالی ئوستادەکی گەلێ چابوو
خزری ئابی حەیاتی مەعنا بوو

ئەمەش دەلیلە لە تە ئسیری مەرسیەی کە گوتم:
چوار زوبانی تێدایە قەصیدەیی ڕەنگین

# خوێندنەوەیەکی تر بۆ کات
# لە کۆی شیعرەکانی حاجی قادردا

لەدوای ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە لاپەڕەکانی پێشوودا خستمە ڕوو، دەمەوێ دەلاقەیەکی تریش بۆ خوێنەر بکەمەوە تا بەهۆیەوە بتوانێ پەیگیری بۆچوونی حاجی بکات سەبارەت بە کات.

لەم خوێندنەوەیەدا، کە پشت بە بۆچوونی فەیلەسووفی فەرەنسی جۆرج باتای دەبەستێ سەبارەت بە پۆلێنکردنی ئەو بۆ کات[1]، دەکرێ کۆی شیعرەکانی حاجی بەسەر دوو جۆر داهاتوو و دوو جۆر ڕابردوودا پۆلێن بکەین، بەم شێوەیەی خوارەوە:

یەکەم: داهاتوو دابەش بکەین بە دوو لقەوە کە بریتین لە داهاتووی سادە و داهاتووی یۆتۆپی. مەبەستم لە داهاتووی سادە ئەو کاتەیە کە تەعبیر لە بەرەو پیرەوەچوونی ئامانجێک و خواستێک دەکات و ئەو ئامانج و خواستەش قابیلی وەدیهاتن و دەست پێگەیشتنە.

---

[1] Birgit H. Jensen, Karl E. Scsollhammer og Rigmor K. Schmidt: Den Hovedeløse Bataigges kosmologi. Århus. Forlaget Anis, 1984. s. 98-103

هەر بۆیەشە دەتوانین بڵێین ئەمە ئەو زەمەنەیە کە ئامانجێکی عەقڵانیانەی تێدا دێتە دی. لە کاتێکدا مەبەستم لە داهاتووی یۆتۆپی ئەو کاتەیە کە ئامانجی خۆی هەیە و وێنای ئامانج و مەبەستێکی تێدا دەکرێ، بەڵام ئەو ئامانجە ئامانجێکی کۆنکرێتی و عەقڵانی نییە .

دووەم: بەهەمان شێوە، دەتوانین ڕابردووش دابەش بکەین بەسەر دوو لقدا: ڕابردووی نزیک و ڕابردووی دوور.

مەبەست لە ڕابردووی نزیک، یان سادە، ئەو کاتەیە کەمێ پێش ئێستا تێپەڕیوە و هێندە لێمانەوە دوور نییە و هەموو فرسەتەکانی ئێمەی لەگەڵ خۆیدا بردن بەبێ ئەوەی سوودیان لێوەربگرین.. لەکاتێکدا مەبەستمان لە ڕابردووی دوور، ئەو کاتەیە کە لە «سەرەتا»وە هەبووەو سەرچاوەی هەموو شانازی و قەدەرەکانی ئێمەی لەخۆیدا هەڵگرتووە.

لەسەرێکی تریشەوە: ڕابردووی نزیک، درێژەی خۆی لە داهاتووی سادەدا وەردەگرێ و ئەم دوو دۆخەی کات چنینێکی هاوبەش پێکدەهێنن، بەجۆرێ کە مرۆڤ لەدوای هەموو لەدەستدانی هەلێک دڵی خۆی بە هەلێکە تر خۆش بکات، کە لە داهاتوویەکی نزیکدا بۆی دێتەوە پێش. بەهەمان شێوە ڕابردووی دووریش درێژەی خۆی لە

داهاتووی یۆتۆپیدا وەردەگرێ. بەم مانایەش هەموو بیرکردنەوەیەکی یۆتۆپیانە سەرچاوەکانی خۆی و کاریگەرییەکانی خۆی دەگەڕێنێتەوە بۆ ڕابردوویەکی دوور و پاساوی ئەوەی کە هێشتا «نەهاتووە»، بەهۆی شتێکەوە دەداتەوە کە زۆر لەمێژە «هەبووە.«
لەم ڕوانگەیەوە بەشێکی زۆری شیعرەکانی حاجی دەکرێ بەسەر چوار دۆخی کاتدا پۆلێن بکەین، وەکئەوەی لەم نمونانەدا دەیبینن:

ڕابردووی دوور:
ئەمانە ئەو بەیت و نیوە بەیت و شیعرانەن کە حاجی تیایاندا ئاماژە بە زەمەنێکی زووی کوردیی دەکات، کە تیایدا ڕەگێکی ئەفسانەیی و مێژوویی ئامادەیە. یان دەیەوێ بۆ پاساودانەوەی نیگەرانی و تێکشکانەکانی ئێستای خۆی، نیشانەیەک بۆ شانازی، یاخود ناوی ناودارێکی دەسەڵاتدار و قۆناغێکی پرشنگداریی مێژوویی بەیادی خوێنەری شیعرەکانی بهێنێتەوە. هەروەکو لەم نمونانەدا بەرچاو دەکەوێ:

گەلێکم بیستووە پەستی و بڵندیی دەوڵەتان، ئەمما
جیهان نەیدیوە پەستی وا میثالی حاڵی کوردستان
لە وەقتی خۆی هەموو شا بوون، سەراپا بێ غەم و شا بوون

لە جوودا حاتەمی طائی، لە شەڕدا ڕۆستەمی مەیدان
لە پێشا خاکی مە لانەی پڵنگ و شێری ئازا بوو
ئەمێستا مار و مێروو، گورگ و ڕێوی لێی دەکەن سەیران

صەلاحەددین و نوورەددینی کوردی
عەزیزانی جزیر و مووش و وانی
موهەلهەل، ئەردەشێر و دەیسەمی شێر
قوباد و باز و مییری ئەردەڵانی
ئەمانە پاکیان کوردن، نیهایەت
لەبەر بێ دەفتەری ون بوون و فانی

خۆ دەزانن سولالەیی ئەکراد
لێرەوە بگرە تا دەگاتە قوباد
لە وەفا سموەئیل و ئیسماعیل
عەهد و پەیمانیان چیای قەندیل
کوردی شاهنامە پاکیان کوردن
کافی ئەم صافە کافی ئەو وردە

ڕابردووی نزیک:

ئەمانە ئەو شیعرانەن کە باس لە کاتێک دەکەن، کە نزیکە لەسەردەمی حاجییەوە، یان خۆی بەبیری دێت و لە

بازنەی بیرەوەریی خۆی تێپەڕ ناکات. بۆی هەیە لە غوربەتەوە یادی نیشتیمان بکاتەوە، یان لە پیرییەوە منداڵیی و لاوێتی خۆی بیر بکەوێتەوە و ئاماژە بە قۆناغ و ڕووداوێکی تایبەت بکا و بەو جۆرە:

گوتم بە بەختی خەواڵوو بەسە ئەتوو بی خودا
لە خەو هەڵستە زەمانێ بچینەوە ئەو لا
گوڕەی بەهاریە ئێستێکە شاخ و داخی وڵات
پڕە لە لالەو و نەسرین و نەرگسی شەهلا

.......................................

صەبا دەزانی ژیانم لە دوورییان مەرگە
دەسا وەرە بە کزەی خۆت خجل بکە عیسا
ئەگەر منم لە فیراقیان کزەم لە جەرگەوە دێ
ئەگەر دڵە وەکوو جەرگم دەڵێی ئەوا سووتا

خاکی جزیر و بۆتان، یەعنی وڵاتی کوردان
صەد حەیف و صەد مخابن دەیکەن بە ئەرمەنستان

.......................................

کوا والییی سەنەندوج، بەگزادەیی ڕەواندوز
کوا حاکمانی بابان، میری جزیر و بۆتان
کوا ئەو دەمەی کە کوردان ئازاد و سەربەخۆ بوون

سوڵتانی موڵک و میللەت، صاحیبی جەیش و عیرفان

قوتبی زەمانە خالید ئاوارە بوو وەکوو من
بێ قەدر و قیمەت و شان، بێ خان و مان و بێ نان

هەر دوێنێ ئەهلی سوودان هەستانە پێ وەکو شێر
ئێستێکە موستەقیللن مەحسوودی کوللی ئەدیان

کوردەکی کۆیی کەوتەوە یادم
پێم گوت: ئایا چلۆنە ئوستادم
وەکوو بیستی بە میثلی هەوری بەهار
هاتە گریان و پێی گوتم: ئەی یار
عالیمی چاکمان هەموو فەوتان
ئەهلی فەتوا موسافیری مەوتان
کەس نەماوە بە غەیری کاک ئەحمەد
شەیخی مەعروف و عالیمی ئەرشەد

لە جوملەی ماجەرای دووری ویلایەت
ئەمەش باسێکە خۆشە وەک حیکایەت

بە فیکرت دێ زەمانێ چووینە باڵەک

بەپێ خاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەک
دەڵێن ئێستا هەواری گورگ و شێران
وەکوو قەلبی حەسوودی تۆیە وێران

داهاتووی سادە:
لەم شیعرانەدا حاجی نیگەرانی و خۆشحاڵیی خۆی بەرامبەر بەداهاتوویییەکی نزیک پیشاندەدا، یان پێشبینییەک دەکا، خۆزگەیەک هەڵدەخوازێ، مەرجێ دادەنێ و داهاتوویەک دەخوێنێتەوە.

فەلەک بە تیر و کەمانی لە ئێمە چوویتە کەمین
شکارگاهی زەمینە، لە چەنگی کێوە دەچین!
ئەمین مەبە لە سبەینێ ئەمەت بەسەر دێنێ
حەوادیپاتی زەمانە کە نایەتە تەخمین
وجوودی ئێمە کە ڕۆژی حەیاتی ئاوا بوو
یەقین بزانە کە شەو لێ گەڕاوو و دەربەدەرین
ئەم ئەرزە کۆنە هەوارە، خەلایقیش کۆچە
تەماعی سووری نەبێ کەس لە ژێری چادری شین

وا دیارە ڕەسم و قانوونێکی دەوران دادەنێ
کوردی ئێمە گەردشی گەرمێن و کوێستان دادەنێ ◦

هەر کە تاجی نایە تەختی لە کوردستان دادەنێ
خەرج و پیتاکی لەسەر گۆران و سۆران دادەنێ
هەر لەپاش چەند ساڵی تر تەسخیری بەغدادیش دەکا
شارەزووری قشڵەیە، دەببۆ لە بابان دادەنێ
خانەتان وێران دەکا، قەسر و قوسووری لێ دەکا
بۆ ئەمەی نەچنە عەجەم ئیلچی لە تاران دادەنێ

تا ڕێک نەکەون قەبیلی ئەکراد
هەر وا دەبنە خەرابە ئاباد

(حاجی) دەمرێ لە داخ و هاوارە
کوردی بێچارە دەبنە ئاوارە

داهاتووی یۆتۆپی:

ئەمە ئەو تێڕوانینەیە بۆ کات کە حاجی تیایدا ئومێدێک دەردەبڕێ، حوکمێک دەدات و وێناکردنێکی تایبەت بۆ داهاتوویەکی هێشتا نەزانراو دەخاتە ڕوو. یاخود مەترسیی و قەدەرێک دەستنیشاندەکا:

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز

به کوردی گەر بنووسرایە زوبانی
مەلا و شێخ و میر و پادشامان
هەتا مەحشەر دەما ناو و نیشانی

وا دیارە هەتاکو دنیا بێ
کوردەکان حاڵیان دەبێ وابێ

## گریێ نالی

لەناو کوردەکاندا ئەو شاعیرە کلاسیکە گەورانەی لە لایەن شاعیرانی دوای خۆیانەوە، ناویان براوە و شیعرەکانیان بەنمونە هێنراونەتەوە، ژمارەیان هێندە زۆر نییە. ڕەنگە لەناو ئەوانەدا (جەزیری، خانی، نالی، سالم و کوردی، حاجی قادر، شیخ ڕەزا و مەحوی) لە هەموویان زیاتر دووبارە بوبنەوە. بەڵام هیچ گومانی تێدا نییە نالی بەختەوەرترین شاعیرە کە شاعیرانی دوای خۆی زۆر باسیانکردووە، بەیتە شیعرەکانیان کردۆتە نمونە، یاخود ستایشیانکردووە و لەهەندێ نمونەشدا ڕەخنەیان لێگرتووە. بەمجۆرەش نالی بۆتە گرێ و مەراقێک بۆ

شاعیرانی پاش خۆی و لەناو ئەوانەشدا حاجی قادری کۆیی لە پێش زۆربەیانەوەیە.
گرێی نالی گرێیەکی پۆزەتیڤە، کە تیایدا شیعر و سنعەتی شاعیرانەی نالی دەکرێتە پێوەر بۆ شیعری نایاب و نمونەیی کە پڕە لە ووشەئارایی و ڕەوانبێژی و حیکمەت. لە هەمان کاتیشدا ئەمە ئەو شیعرەیە کە خۆی وەک شیعری ستانداردی کلاسیکی کوردی پێناسە دەکات. لە ڕاستیشدا ئەم گرێیە بەر لەوەی گرێی شاعیرانی دوای نالی بێت، گرێی نالی خۆیەتی و ئەوە کە نیشانەکانی ئەم گرێیەی لە شیعرەکانی خۆیدا بەرجەستە کردوون، کە لە هەستیاریی ئەوەوە بەرامبەر بە شیعر و زمان و توانای شیعر سەرچاوەی گرتووە. بۆیە بەر لەوەی بکەومە نمونە هێنانەوە لە شیعری حاجی قادری کۆیی بۆ سەلماندنی گرێی نالی لەلای حاجی، دەمەوێ نمونەکانی هەبوونی هەمان گرێ لە شیعری نالی خۆیدا بخەمە پێشچاو.
دەمەوێ خوێنەر لەوە ئاگادار بێت، گرێی نالی لەلای حاجی دوو ئاراستەی وەرگرتووە، یەکەمیان ئەوەیە کە نالی وەک شاعیرێک لەلایەن حاجی قادرەوە ستایش دەکرێ و نمونەی شاعیرێکە حاجی چاوی لێدەکا. بە ئوستادی دادەنێ و خۆی بە هاوشانی دەناسێنێ. لە

ئاراستەی دووەمیشدا حاجی هەڵوێستی لە نالی وەرگرتووە، ڕووبەڕووی دەوەستێتەوە و پێیوایە کاتێ بۆخۆی هاتۆتە مەیدانی شیعرەوە، نالی بەجێهێشتووە. ئەم دوو هەڵوێستە جیاوازە، کە ئاشکراکەری دوودڵی و نیگەرانیی حاجییە بەرامبەر بە چارەنووسی شاعیرانەی خۆی و ئەمەش ئەوی خستۆتە ناو شەڕێکی دەروونییەوە، لەلایەکەوە پەیوەندیی هەیە بە سەردەم و بارودۆخەکەوە و لەولای تریشەوە پەیوەندیشی بە شاعیریتی حاجی قادر و لەخۆ تێگەیشتنی ئەوەوە هەیە. بەڵام نالییش لەمەدا هاندەرێکی سەرەکییە، چونکە ئەویش لە شیعرەکانیدا بانگەشەی «حاکمیتی سێ موڵک» دەکا، خۆی بە «مەعنا ئارا»یەکی بێنمونە دەداتە قەڵەم و خەڵکی بە «کۆدەک و بەستە زوبان» پێناسە دەکا. هەموو ئەمەش ڕاگەیاندنی جەنگێکی شیعرییە کە شاعیران ناچار دەکا هەڵوێستی لەبەردا وەربگرن.

بە دیوێکی تردا، پێدەچێت ئاسان نەبووبێت بۆ هەموو کەس لە دوای نالییەوە خۆی وەک شاعیر بناسێنێ و سەردەم و بارودۆخەکەش ئەمەی لە هەموو کەس قەبووڵ نەکردبێ و شاعیرانی دوای نالی بەردەوام خۆیان لەبەردەم بەراووردکردن بەو شاعیرە گەورەیەدا ببینییێتەوە و لەسەر ئەمەش لە کۆڕی ئەدەبیاتی هاوکاتدا،

ڕووبەڕووی گەلێ قسە و قسەلۆک بووبنەوە، کە ئەمەش ئەوانی ناچار کردبێ بەرگریی لە شاعیربوونی خۆیان بکەن. هەرچی پەیوەندیشی بە شاعیریێتی حاجییەوە هەبێت، ئەوە گومان لە هوشیاریی حاجی ناکرێ سەبارەت بەوەی کە چی لە شیعر ویستووە و چ جۆرە شیعرێکیشی نووسیوە. شاعیرێتی حاجی و هووشیاری خۆی بەرامبەر بەم ڕاستییە و ئەو ڕاشکاوییەی حاجی لە دەربڕیندا خاوەنی بووە، وایکردووە حاجی بێ سێ و دوو خۆی بە نالی بەراوورد بکات و بگرە خۆیشی لە نالی بەلاوە شاعیرتر بێت و لەو کاتەدا کە ستایشی دەکا، بەرەنگاریشی بووبێتەوە.

من لێرە بەدواوە، سەرەتا بە نمونە هێنانەوە لە دیوانی نالی، ئەو بەیتە شیعریانە دەنووسمەوە کە تیایاندا گرێی نالی بۆ نالی خۆی بەرجەستە بووە. واتە ئەو شیعرانەی لەخۆ تێگەیشتنی نالی، پێگەی شاعیرانەی، ستایشکردنی ئەو بۆ شیعر و زمان کە پەیوەندییەکی نزیکیان هەیە بەم کتێبەوە، بەئاشکرا دیارن. پاشانیش ئەو نمونە شیعریانە لە دیوانەکەی حاجی قادرەوە دەگوازمەوە، کە تیایاندا نالی وەک گرێیەک بۆ حاجی دەردەکەوێت.

نالی: لە خۆتێگەیشتن، ستایشکردنی شیعر و زمان:

(1) نالی نیەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە
ئەمما نیەتی قووەتی دڵ، قودرەتی ئینشا
(دیوانی نالی: 78)

(2) نالی حەریفی کەس نییە، ئیلف و ئەلیفی کەس نییە
بەیتی ڕەدیفی کەس نییە، هەرزە نویسە گەپ دەکا
دیوان: ل: 100)

(3) نوکی خامەی من کە بێتە مەعنائارایی کەماڵ
خەط بە خەط ئیظهاری نەقشی صورەتی (مانی) دەکا
(دیوان: ل/ 103)

(4)
تەبعی شەککەرباری من، کوردی ئەگەر ئینشا دەکا
ئیمتیحانی خۆیە مەقصودی، لە (عمدا) وا دەکا
یا لە مەیدانی فەصاحەتدا بە میثلی شەهسەوار
بێ تەئەممول بەو هەمو نەوعە زوبانی ڕادەکا
کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە خۆکردییە
هەرکەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی مەعنا دەکا
بێتە حوجرەم، پارچەپارچەی موسوەدەم بکڕێ بە ڕۆح،

هەرکەسێ کوتاڵ و پارچەی بێ بەدەڵ سەودا دەکا
شیعری خەڵقی کەی دەگاتە شیعری من بۆ نازکی؟!
کەی لە دیققەتدا پەتک دەعوا لەگەڵ هەودا دەکا؟!
(دیوان: 106-107)

(5)نالی عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا
مەعنایی زۆر و گەورە بە لەفڤی کەم و بچوک
(ل: 260)

(6)نیشانەی پوختەگی بێ دەنگییە نالی! ئەگەر پوختەی
بە حوججەت تەی بکە نامە، بە حیدەت پەی بکە خامە
(ل: 473)

(7)
فارس و کورد و عەرەب، هەر سێم بە دەفتەر گرتووە
»نالی» ئەمڕۆ حاکمی سێ موڵکە، دیوانی هەیە
(ل: 577)

(8)
نوصحی «نالی» ڕەنگە هەر کەس بیبیێ، بیکاتە گوێ
چونکە نەزمی صاف و وردە، هەر وەکو مرواریيە
(ل/582)

(9)شیعرەکانم، کە جگەر گۆشی منن، دەربەدەرن
دڵی «نالی» چ ڕەقە، قەت غەمی فرزەندی نییە!
(ل: 596)
(10)لە جگەرگۆشەیی شیعرم مەدە مەعنایی خراپ
بێ خەطا کەس نییە ڕازی کە لە ئەولادی درێ
(ل: 653)
(11)خەڵقی کە هەموو کۆدەکن و بەستە زوبانن
با بێن و لە «نالی» ببیەن شیعری سەلیقی
(ل: 657)

نالی لە شیعری حاجی قادردا:

وەک چۆن بینیمان حاجی قادر شوناسی خۆی لە پەیوەندیی بە شوێن و کاتەوە دەستنیشاندەکرد، ئاواش لە هەوڵدا بووە شوناسی شیعریی خۆی لەگەڵ شاعیرێکی وەکو نالیدا دەستنیشان بکات. ئەمەش چەند هۆکارێکی خۆی هەبووە، کە حاجی لە ئاستیاندا بێی ئاگا نەبووە.

یەکەم ئەوەی کە حاجی ویستوویەتی سەرنجی خەڵک بەلای شاعیرێکی وەک نالیدا ڕابکێشێت، چونکە ئەو بە شاعیرێکی تایبەت و گەورەی زانیوە. ئەمەش ئاشکرای دەکات، کە حاجی بۆخۆی ئاستێکی بەرزی ڕۆشنبیریی

شیعریی هەبووە، کە بەهۆیەوە شێوازەکانی جیا کرۆدتەوەو نالی وەک نمونەیەک بینیوە.
دووەم: حاجی ویستوویەتی شوناسی شیعریی خۆی چ لە ڕووی هونەی و شێواز و چ لە ڕووی ناوەڕۆکی کوردیانەیەوە، لەگەڵ شیعری شاعیرێکی نمونەیی بەراوورد بکات، بۆ ئەمەش لە نالی نمونەییتری نەدۆزیوەتەوە. ئەم خاڵە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە حاجی قادر لەخۆتێگەیشتنێکی بەرزی لەخۆی، نەک هەر وەک مرۆڤ، بەڵکو وەک شاعیرێکیش هەبووە.

سێیەم: حاجی بەهۆی ئەم جیاکردنەوەو پەیوەندییەی نێوان خۆی و نالی، دوو قەڵەمڕەوی شوێنی و جوگرافیش دەستنیشان دەکات: سلێمانی و کۆیە و نالی دەکاتە نمونەی شیعری خاکی بەبە و خۆیشی بە نمونەی شاعیری کۆیە.

چوارەم: حاجی جۆرێ لە حەسرەت و خەم بۆ نالی دەردەبڕێت کە ئیدی لە ژیانی ئەودا نەماوە. بەڵام شیعرەکانی بڵاوبوونەتەوە. ئەمەش دەستنیشانی ئەو ڕاستییە دەکات، کە شیعریی نالی قەڵەمڕەوی جوگرافیایەکی بەرینی گرتۆتەوە و تیایدا بەناوبانگ بووە.

پێنجەم: حاجی ڕووی ڕەخنە ئاراستەی ئەوانە دەکات کە بەبێ بەڵگە ڕەخنەیان لێگرتووە و ئەو دەیەوێت ئاراستەیان بکات بۆ ئەوەی لە پێگەی نالیدا بیبینن، یان بەو پێوەرەی قسە لەسەر شیعری نالی کراوە، قسەش لەسەر شیعری ئەو بکرێت، تا جیاوازییەکەیان دەرکەوێت، نەک لە خۆەوە قسەیان لەسەر بکرێت. ئەمەش ئەو ڕاستییە ئاشکرا دەکات، کە لەسەر دەمی حاجیدا، شیعر بابەتێکی گرنگیی قسە لەسەر کردن بووە و حاجیش ئەمەی بیستۆتەوە.

شەشەم: حاجی لەپاش هەڵسەنگاندنی شیعری نالی و پێگەی ئەو، هەروەها لە پاش بەراووردکردنی خۆی و نالی، دەگاتە ئەو بڕوایەی کە شیعری ئەو لە شیعری نالی کەمتر نیە و بگرە خۆی لە نالیش بە شاعیرتر دەزانێت. ڕەنگە ئەمە یەکێکیتر بێت لە تووڕەییەکانی حاجی قادر لە ئاست ئەوانەدا کە لە شیعری نالی چەکوشی سەرکوتانەوەی شیعری حاجییان دروستکردبێت، نەک هەڵوێستێکی دژ بە نالی خۆی.

(1) ووتی مەکەن وەکوو ئاساری «نالی» و «کوردی«
لە سەهوی دیدە بپۆشن، گوزەر بکەن لە خەتا

(2) »نالی» و خاکی بەبە، حاجی و کۆیە بە مەسەل

(3) سولەیمانێکە «نالی» خاوەنی دیوان و فەرمانە
نییە کەس بێتە مەیدانی، مەگەر حاجی خودئاسایە

(4)زاهیرا بەیتم لە «نالی» و «کوردی» زۆر کەمتر نییە
تالعم بەرگەشتەیە، بەدبەختە بەختم نوستووە

(5)ئیتتیفاقەن ئیتتیفاقم بوو لەگەڵ «نالی» وەکوو
تاجر و گەوهەر لەگەڵ گەوهەرفرۆش و موشتەری

(6)سەد قوببەیی خەورنەق و سەددی سکەندەری
ناگاتە بەیتەکاولی «نالی» و مەتانەتی

(7)
بەجێ ما نالی وەک ناڵی، بەپاش کەوت کوردی وەک گەردی
کە «حاجی» غاری دا ئەسپی لە مەیدانی سوخەندانی

(8)بە تەخمین فەردەکی «نالی» دەهێنم تا ڕەفیقانم
بزانن فەرقمان زۆرە، خەزەف قەت وەک گوهەر نابێ

(9)ئەو کە نۆشی شەرابەکی تاڵی
»ناڵی» لەو عەرصەدا بووە «تاڵی«
»ناڵی» ئوستادەکی گەلێ چا بوو
خزری ئابی حەیاتی مەعنا بوو

(10)ئەگەر «ناڵی» بوو لێرە ناڵی ئاوێت
دڵی «کوردی» بووە گەردێ لەبەر پێت

(11)

بەیتی «ناڵی» و بەیتی من گەر تێکەڵی یەکتر دەکەن
ئەحمەقی صورەت پەرست و جاهیلی مەعنا نەزان

# ئەنجام

شوێن و کات حاجیی قادریان زۆر بە خۆیانەوە سەرقاڵکردووە، ئازاریان داوە، تورەیان کردووە، ناچارییانکردووە بەرگریی لە خۆی بکات و لە زماندا نیشتەجێ ببێت، بەڵام نە شوێن و نەکات و نە هێزە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی ئەو کات و شوێنانەی ئەویان تێدا ژیاوە نەیانتوانی حاجی بکوژن و لەناوی بەرن. ئەوەی حاجی لە ناوبردووە و لە کلێشەیەکی تایەبەتدا سەمەندۆکی کردووە و خنکاندوویەتی، بەشێک لەو توێژینەوانەن کە لەبارەی حاجی قادرەوە نووسراون، ئەو ئاراستە ڕەخنەیی و توێژینەوە تەقلیدیانەن کە لە حاجی قادر ئەوەیان داتاشیوە خۆیان ویستوویانە بەبێی ئەوەی ڕێگە بدەن و گوێ لە زمانی حاجی خۆی بگرن، کە چیی گوتووە و دەیەوێت بڵێت چی و ئێمە چیی لێتێدەگەین.

من بەم ڕێچکەیەدا نەڕۆیشتووم. هەوڵی خۆم چڕکردۆتەوە لەسەر هەردوو چەمکی شوێن و کات و پەیوەندییان بە شوناسەوە و بەپێی توانا ئەمەشم لە مەتنی شیعرەکانی حاجییەوە هەڵهێنجاوە، بەبێ ئەوەی بۆخۆم بمەوێ لە زمان حاجییەوە بدوێم..

ئایا دەبێت کات شوێن بۆ حاجی قادر، کە مەلایەکی ئەم کوردستانە و دەربەدەرێکی هەندەرانی سەدەی نۆزدەهەم بووە لە قەڵەمڕەوی عوسمانیدا، بووبێتە بابەتێک بۆ بیرکردنەوە؟ ئایا حاجی پێشئەوەی دەست لە سەر قەڵەم دابگرێ، لە زەینی خۆیدا بیری لەکات و شوێن و تێپەڕینی کات لە ژیانی خۆی و میللەتەکەیدا و لەدەستدانی شوێن و نیشتیمان، کردۆتەوە؟

مێژووی ژیانی کورد لەو سەدەیەدا سەبارەت بەم پرسیارانە شتێکمان پێدەڵی و دەقی ئەو شیعرانەی حاجی پاش بیرکردنەوە نوسیونی، شتێکی ترمان بۆ ئاشکرا دەکات. مێژووی هاوسەردەمی حاجی، باس لەو واقیعە تاڵە دەکات کە کورد هەم بەدەستی خۆی و هەم بە پلانی بێگانە، میللەتێک بووە بەش بەش و نا ئاسوودە و زامدار. ئەم میللەتە لە هەژاری و بێدەرەتانییەکی بێ نموونەدا ژیاوە و نەخوێندەواری و دواکەوتن هەموو توانایەکیان بۆ بیرکردنەوە لە خۆی و لە بوونی خۆی لە ناو مێژوودا، لێسەندۆتەوە. لە لایەکی دیکەوە، هێزە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی ئەوسای کۆمەڵگای کوردی، ئەوەندە دواکەوتوو بوون و ناکۆکییە نێوخۆییەکان ئەوەندە زۆربوون؛ کە بۆ ساتێکیش نەپەرژاون بیر لە شوناسی خۆیان بکەنەوە و کۆمەڵگاکەیان بەو جۆرە ڕێکبخەن، کە

سوودی خۆیانی تێدابێت. ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانە ئەوەندەی لە ڕووی دەروونییەوە سەرکوت کراون و ئەمەش بەرەو خۆ بەکەمزانی و خۆ بچووکردنەوەی لە ئاست هێزی سەردەستەدا بردووون، هەروەها ئەوەندەی لە ڕووی سیاسییەوە چەوساونەتەوە و ملکەچکراون و ئەمەش لە ئاست دوژمنانیدا بێدەسەلاتیکردووون، ئەم دوو فاکتەرەش ئەوەندەی هانیداون بۆ خۆ گونجاندن، ئەوەندە هانیی نەداون بۆ خۆدۆزینەوە و خۆ دورستکردن.

بۆیە ناکرێ لە ناو ئەم بارودۆخەدا مرۆڤ بیری لە کات و سەردەمی خۆی کردبێتەوە. ناکرێت شوێن وەک چەمکێک ئەوەندە هزری شاعیرێکی داگیر کردبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، زەینی مرۆڤی کورد لەو سەدەیەدا، زەیینیەتێکی چەقبەستووە و سەرقاڵە بە خۆ گونجاندنەوە، نەک بە ژیان لەناو گۆڕانکارییەکاندا. کەچی بە شێکی دیاری شیعرەکانی حاجی، بە پێچەوانەی ئەم سیاسەتی خۆگونجاندنەوە، لە لایەکەوە، باسی گۆڕان و تێپەڕینی خێرای کات و ژیان لە هاوکاتیدا، دەکەن و لەلایەکیترەوە، شوێن وەک کێشەیەکی هزریی لە ئەزموونی حاجیدا دەخەنە ڕوو.

ئەوەی من بە (کێشەی کات و شوێن) لە لای حاجی قادر باسی دەکەم، نە بەتەنیا لەئەنجامی توێژینەوەیە لە ژیان

و هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و مێژوویی و سیاسی و کولتوورییەکان، بەڵکو لە ئەنجامی توێژینەوەیە لە ئەو دەقانەی کە نیشانەی بیرکردنەوەن لە کات و شوێن لەلای شاعیرە هەستیارەکەمان. من باسم لە کات و شوێن کردوە، وەکئەوەی لە دەقەکانی شاعیرێکدا بەرجەستە بووە، کە ئەو شاعیرە بەشێکی زۆری تەمەنی خۆی لە ئاوارەیی بە سەر بردووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

حاجی نموونەی تەواوی ئاوارەبوونی کوردییە لە سەدەی نۆزدەهەمدا و قەدەری هەر ئاوارەیەکیش ئەوەیە کە زۆر بیر لە کات و شوێنەکان و بەسەرچوونی کات و شوێنەکانی ئەزموونی ژیانی خۆی بکاتەوە. ڕەنگە ئەوە خەسڵەتێکی زەیینیەتی تاراوگە و ئاوارەیی بێت، کە لە ناو مێژووی ئاوارەبوونی خۆیدا، ئەو کاتەی دەزانێت شوێنی خۆی لە دەستداوە، لە هەوڵدا دەبێت (کاتی خۆی) دەستنیشان بکات و بەهۆی بەرهەمەکانیشیەوە پێمان بڵێ: من لەم کاتەدا ژیام و ئەمە بوو ئەو (ئێستا)یەی منی تێدا بەرجەستە بووم.

کاتێک لەم ڕوانگەیەوە حاجی قادر دەخوێنمەوە، بۆم دەرکەوت جیهانبینی و بیرکردنەوەکانی ئەم شاعیرە زۆر لە ئاستی گوزارشکردنەکەی بە زمانی کوردی فراوانتر و

دەوڵەمەندترە. حاجی هەرگیز نەیتوانی ئەوەی بیری لێدەکردەوە، بە زمان دەریبڕێت. من لەمە تێدەگەم: ئەو زمانەی ئەو پێی دەنووسی هەمان زمان نەبوو کە بیری پێدەکردەوە، ئەو زمانی کوردی (شێوەزاری کۆیێ) و زمانی شیعری کلاسیکی کوردی فێرببوو. شێوەزاری تیرەی دەربەندی کە ئێستاش لەناوخۆیاندا قسەی پێدەکەن، هەر زوو لە ژیانی حاجی قادردا دەچەپێنرێت و دەسەڵاتی زمانی فەرمیی ئەوسا، ڕێگە بە حاجی نادات پاشتر جگە لە بەکارهێنانی چەند وشەیەکی زاراوەکەی خۆی، شیعری پێ بنووسێت. ئەمەش یەکێکیترە لەو گوشارانەی لە ئاستی زمانیدا کراوەتە سەر ئەم تیرەیە و بە ناچاری و بە مەبەستی خۆگونجاندن بە زمانێک دواون و بە زمانێک گوزارشیان کردووە بۆ ئەوەی ڕێژەی ئەو هەڕەشانە لەسەر خۆیان کەمبکەنەوە، کە بەهۆکاری جۆربەجۆر کراوەتە سەریان و نەیانویستووە زمانیش ببێتە یەکێک لەو هۆکارانە. لەم ڕوانگەیەوە و بەدەر لەوەی چەندە حاجی زمانەکەی پوخت و کوردیانەیە، هێشتا دەبێت ئەو ڕاستییە لەبەرچاوبگرین کە هەمیشە ڕێگرگەلێک لە دنیای حاجیدا هەبوون تاکو نەتوانێت ئەوەی بیری لێدەکاتەوە، دەربڕێت.

پاشان حاجی یەک لەدوای یەک، شوێن و کەسەکان لەژیانی خۆیدا لەدەست دەدات: زێدی لەدایکبوونی و مەڵبەندی تیرەکەی، باوک و دایک، پاشان کۆیی عەزیزەکەی کە لە ڕووی ڕۆحییەوە تەواو پێوەی پابەند بوو، لەدوای ئەوانەش هاوڕێکانی و پاشانیش دوورکەوتنەوە لە وڵات.. لەبەرامبەر هەموو ئەمانەدا تەنیا نیشتیمانی شیعر و بیرکردنەوە بۆ حاجی مایەوە و ئەویش بەتەواوی دەستی پێوەگرتن. بۆ ئەمەش تەنیا زمانی بەدەستەوە بوو تا تیایدا بوونی خۆی بسەلمێنێت. بۆیە ئەوەی لە زمانی حاجیدا هەیە و بە ئێمە گەیشتووە، تێکەڵێکە لە گوزارشکردنی تایبەت و شەخسی ژیانی خۆی، لە ڕووداوی مێژوویی، لە هەست و دەرککردنی کولتووری، لە ئاستێکی ڕۆشنبیریی ڕەخنەیی، لە تێگەیشتنێکی نۆستالیژیانە لە شوێن و لە تێگەیشتنێکی داهاتووییانە لەکات. لە پابەندبوون بە زێدی منداڵی و پاشان پەڕینەوە بۆ ژیانی نیمچەشارنشینی و پاشان بۆ کوردستانیەت و لەوێشەوە بۆ ژیانی ئاوارەیی و پشتگیریی خەباتی گەلان و بەرجەستەبوونی ڕۆحێکی ئازادیخوازانە و نیشتیمانپەروەرانەی ڕەخنەیی. هەمیشە هاوکاتیش بە ترسی لەدەستدانی هەمیشەیی نیشتیمان و دەستبەردان لە سەفەری گەڕانەوە، تەنیا ئومێدێک ئەو لە

گەڕانەوەدا هەیبوو، گەڕانەوەی شیعرەکانی بوون بۆ وڵات. ئەمە کۆی میراتی حاجی قادریی کۆییە، بەڵام میراتێکی مەزن کە زادەی ئەزموونێکی دوورودرێژە. ئەزموون بۆ ئەو دەبێتە سەرتاگەی بیرکردنەوە لە هەر شتیکیتر نەک فۆرمێکی ئایدیۆلۆژی وەک ناسیۆنالیزم کە بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی ڕۆشنبیرانەیە. بە پێچەوانەی ئەو ڕوانگە باوەی کە لە دەریچەی ناسیۆنالیزمەوە تەماشای حاجی قادر دەکات، من لەو بڕوایەدام ئەم تەماشاکردنە بەرتەسککردنەوەی ئەزموون و هەست و جیهانبینی حاجییە. هیچ زەروورەتێک لەوەدا نابینم ئێمە ئەم جیهانە هەستەکی و ئەزموونی و پراکتیکیە فراوانە لە ڕۆشنبیری و تێگەیشتن و داهاتوو خوازیی و هەمیشە ڕەخنەگرانەیەی حاجی بخەینە ناو قەفەسی ئایدیۆلۆژیایەکەوە کە بەرتەسک ترە لەوەی جێی جیهانی حاجی قادری تێدا ببێتەوە. جگە لەوەی ئەو بۆخۆی هەرگیز بە خۆی نەگوتووە ناسیۆنالیست و ئەم وشەیە و هاوشێوەکانی بەکار نەهێناوە، ئاواش حاجی بەردەوام لەو ڕەمز و پێگانە دەدات کە لە کۆدەنگییەکی تیۆرییەدا بۆ ناسیۆنالیزم پێشنیار کراون، ناسیۆنالیزمیان لەسەر وەستاوە! ئەگەر ئەو ناسیۆنالیستیش بێت، ناسیۆنالیستێکی ڕەخنەگر و ڕەتکەرەوە بووە بۆ دۆخی

نەتەوە وەک ئەوەی کە هەیە. هەڵوێستی ئەو لە ڕەمزەکانی نەتەوە، لە مێژوو، لە شوێن، لە دین و کولتووری هاوبەش، لە یەکێتی نەتەوەیی و هتد، ئەوەندە ڕەخنەگرانەیە، کە هیچ گومان بۆ نەتەوەپەروەریی حاجی ناهێڵنەوە، بەڵام نەتەوە دۆستییەکە لەسەر بنەمای هەڵوەشاندنەوەی واقیع نەک پیرۆزکردنی. بۆیە ئەمە ڕێگرێکی هەرە سەرەکییە بۆ ئەوەی گونجاو بێت حاجی بخەینە چوارچێوەی ئەم ڕوانگەیەوە.

بەڕاستی حاجی لەو دۆخە بێماڵی و بێ نیشتیمانیەدا، بەرجەستەبووی کاتی خۆیەتی و شیعرەکانیشی کردنە نیشتیمانێکی گریمانەکراو کە بۆ هەمیشە تا ئەوکاتەی قسە لەسەر کوردبوون و کوردستان دەکەین، پێویستە ئاوڕیان لێبدەینەوە.
لە ئەزموونی شیعریی ئەم شاعیرەدا ڕەگەزگەلێکی ئەوتۆی شوێن و کات هەن، کە ناکرێت چاوپۆشییان لێبکرێت:

یەکەم: حاجی جیاواز بیری لە شوێن و کات دەکردەوە و پەیوەندیی ئەو دوانەی لەگەڵ شوناسی خۆیدا دەبینی. یان ئێمە بەوجۆرەی دەبینین. لەگەڵ هەوڵدانێکی زۆریدا

بۆ پاراستنی شوێنی یەکەم و دواجار بەرینکردنی ئەم شوێنە لە ناوچەیەکەوە بۆ قەڵەمڕەوێک و بۆ هەموو کوردستانی گەورە و بەپیرۆزکرنی شوێن و خستنەڕووی ڕوانگەیەکی نۆستالیژیانە بۆ شوێن، کەچی تێڕوانینێکی نوێتری بۆ کات خستۆتەڕوو. کات بۆ ئەو، نە کاتی ناو میتۆلۆژیاکانە، کە «ڕووداوی یەکەم» تیایدا باڵا دەستە و ئەمەش کاتی «ڕابردوو»ە، نە کاتی فەیلەسووفەکانیشە کە بۆ یەکێکیان کات جوڵەی گەردوون و ئەستێرەکانە و کاتێکی دروستکراوە (ئەفلاتوون)، نە ئەو کاتەیشە کە هەرگیز دەستی پێنەکردووە و هەرگیزیش کۆتایی پێنایەت (ئەریستۆتالیس). حاجی لە جوڵەی سرووشت ڕادەمێنی و بەمەشدا هەست بە گۆڕان دەکات و گۆڕانیش بە نیشانەی تێپەڕینی کات لێکدەداتەوە. بەڵام هەمیشە بۆ ئەو (کات)یش وەکو شوێن، کاتێکی مرۆڤانەیە و پەیوەندی هەیە بە ئەزموونی ژیانی مرۆڤەوە لە ناو واقیعێکی دیاریکراودا. بۆی هەیە ڕەگەزی ئەفلاتوونیانە و ئەریستۆتالیسییانە لە تێگەیشتنی حاجیدا بۆ کات بدۆزینەوە، بەڵام دواجار کات لە لای حاجی لە یەک دۆخدا سەقامگیرە کە ئەویش کاتی (ئێستای مرۆڤێکی هۆشیارە) بەرامبەر بە هەنووکەی خۆی. لەکاتێکدا کە

حاجی پەیوەندییەکی پێشینەیی لەگەڵ شوێندا هەبووە، ئەگەرچی هەردووکیان لە پەیوەندیی بە شوناسی خۆی وەک تاکەکەسێک، شاعیرێک و وەک هەندەرانییەک و وەک کوردێک و وەک مسوڵمانێک دەبینێت. بۆیە خودی خۆی دەبێتە چەقی پەیوەندییەک کە کات و شوێن بەیەک دەگەیەنێت، بە بێ ئەوەی هەمان ئاراستە لە ژیانی ئەودا وەربگرن.

ئەم خاڵەش سەبارەت بە کات، حاجی جیادەکاتەوە لە بۆچوونی تیۆلۆژیانەی قەدیس ئاگۆستین کە پێی وابوو کاتی(ئێستا) زەمەنی یەزدانە و تەنیا ئەو لە «ئێستای ئەبەدیی» خۆیدا بوونی هەیە. بەڵام ئەو خاڵەی لە (ئاگۆستین)وە وەریدەگرین و یاریدەمان دەدات بۆ شیکردنەوەی تێگەیشتنی حاجی لە کات، ئەوەیە کە بیرکردنەوەی مرۆڤ دابڕاو نییە لەو ئەزموونانەی خود لە میانەی تێپەڕینی کاتدا، پێیاندا تێپەڕ دەبێت. ئەگەر ئەو ئەزموونانە بەشێک بن لە پێکهێنەری شوناسی ئێمە، ئەوە چۆن دەکرێ ئێمە ئەزموون بکەینە پێوەری شوناسمان لە کاتی (ئێستا)دا، کە ئیتر دوورە لە کاتی ئەزموونەکانمانەوە، کە کاتی ڕابردووە؟

سەبارەت بە شوێنیش، حاجی کەرەستەیەکی زۆرمان دەداتێ بۆ ئەوەی لەبەر ڕۆشنایی نوێترین بۆچوونی

فەلسەفیانەی هێرمنۆتیک و دیاردەناسیدا، لە بواری شوێنناسی و نیشانەناسیی شوێن و چەندین بۆچوونی دیکە، لە شیعری حاجی بکۆڵینەوەو لە گەرووی مێژووی ئەدەبی و گێڕانەوە مێژووییە تاک ڕەهەند و یەک مەنهەجەکان، دەری بهێنینە دەرەوە. حاجی سەرەتا بە شێوەیەکی هەستەکی و پاشان لە ئاستێکی ڕۆشنبیری و دواجار لە ئاستێکی نۆستالیژیانەدا، بە پشتبەستن بە یادەوەریی و هێنانەوەی شوێنە بەدەروونیی و بە جەستەییبووەکان بۆ ناو شیعر، باسی لە شوێن کردووە. شوێن بۆ حاجی قادر بەشێکی زۆری لە ڕابردوودایە بەبێ ئەوەی جگە لە یادوەریی ئەو شوێنانە لە جێگەیەکی تایبەت بن. حاجی لە ئێستای دوورەوە وڵاتییەوە، باسی ڕابردووی ئەوێ دەکات و گەورە و پیرۆزیی دەکات، بایی ئەوەش شوێنی ئێستای بیر دەکات و بچووکیی دەکاتەوە و دزێوی دەکات و دەیکاتە جەهەننەم.

دووەم: شوێن و کات هەردووکیان لە شیعری کلاسیکیی کوردیدا باسکراون، بەڵام لە لای هیچ شاعیرێ هێندەی حاجی قادر نەبوونەتە پرۆژەیەک بۆ بیرکردنەوە. ئەگەر (نالی) جەمسەرێکی بیرکردنەوە لە کات و شوێن بێت لە شیعری کلاسیکیدا، ئەوە کاتی سەرەکیی لە لای

ئەو شاعیرە بریتییە لە کاتی (ڕابردوو)، شوێنی پیرۆزیش سلێمانی و خانەقا و حوجرەکەی خۆی. لە بارێکدا کە جەمسەری دووەمی بیرکردنەوە لە کات، کە حاجی قادرە، جەخت لە سەر (ئێستا) وەک کاتی سەرەکی دەکاتەوە و رابردوو بۆ ئەو (حیکایەتە). قسەکردنیش لە بارەی رابردووەوە، کات بە فیرۆدانە. شوێنی پیرۆز سەرەتا لەلای حاجی شوێنی یەکەم و پاشان کۆیە و دەروبەری و پاشان هەموو کوردستانە. بەمجۆرەش چەندە نالی وەک شاعیر سەرمەشقە بۆ حاجی، کە چی لە بیرکردنەوەیاندا لە کات، لێکدی جیادەبنەوە.

سێیەم: کاتی ئێستا بۆ حاجی کاتی ژیانە لە هەنووکەدا و کاتی (ئەم لا)یە نەک (ئەولا). بیرکردنەوە لە کات بابەتێکە بۆ مرۆڤی زیندوو کە هووشیارە بەرامبەر بە بوونی خۆی لە کاتدا. چونکە لەگەڵ مەرگدا مرۆڤ دەچێتە (ئەولا) و ئیتر کات بۆ مرۆڤ دەوەستێ و خۆ سەرقاڵکردن بەوەی لەپاش مەرگ چی ڕوودەدات، بێ ڕێزییە بەرامبەر بەو (ئێستا)یەی کە ئێمە وەکو بوونەوەری زیندوو تیایدا ئامادەییمان هەیە. کەچی حاجی هەموو هەوڵێک دەدات، تا بگاتەوە بە شوێنی (ئەولا) و گشت توانایەکی دەخاتە کار بۆ دووبارە بەرهەمهێنانەوە

و بیناکردنەوەی لە زمان و شیعر و خەیاڵدا. ئەو لە دۆخی ڕابردووی کات خۆی ڕزگار دەکات، بەڵام زۆر کەمتر خۆی لە وێنا ڕابردووەکانی زێد و کۆیە و نیشتیمانی خۆی بۆ ڕزگار دەکرێت. ئەمەش یەکێکە لە دژوازیی و ناکۆکیە جوانەکانی شیعری حاجی قادر، کە من هیچ بە پێویستی نازانم یەکیان بخەمەوە.

**چوارەم:** تێڕامان لە گۆڕانەکانی ناو سرووشت دینامیکیەتی کاتمان بۆ ئاشکرا دەکەن. چونکە گۆڕان لە سرووشتدا، گۆڕانە لە دۆخێکی تایبەتەوە بۆ دۆخێکی کامڵتر، لە (غونچە)وە بۆ (گوڵ) و ئەمەش پێماندەڵێت: دۆخی کامڵتر هەمیشە دۆخی ئێستایە و ئەمەش دۆخی کرانەوە و زیندوێتییە. کەچی هەر ئەم دۆخە ڕابردووە لە ئاستی شوێندا، بۆ حاجی قادر دەبێتە شوێنێکی پیرۆز و بەهەمان شێوەی کە دەتوانێت خۆی لە ڕابردووی کات دەرباز بکات، ناتوانێت خۆی لە ڕابردووی شوێن دەرباز بکات..

**پێنجەم:** ئەگەر دۆخی ئێستای کات کامڵترین زەمەنی ئێمە بێت بۆ خۆسەلماندن، ئەوە زمان و زمانی شیعریی

بەڵگەن لە سەر ژیانی ئێمە لە ناو کاتی خۆماندا. ئەوانەی زمان مەسرەف دەکەن ناتوانن لە کاتی خۆیان (نیشانە)یەک دروست بکەن تا بیسەلمێنێ، ئەوان لە (ئێستا)یەکدا ژیاون، چونکە هیچ مانایەکیان بە ژیان نەبەخشیوە و بۆ زیاد نەکردووە. تەنیا شاعیرەکان و ئەوانەی دەنگی شاعیرانە دەبیستن دەتوانن مانا لە ژیاندا بدۆزنەوە. لە هەمان کاتدا هەر زمانیشە جێی شوێن بۆ حاجی دەگرێتەوە و دەیکاتە نیشتیمانی خۆی و لەسەر عەردیی وشە و پیتەکان، خێزانێکی شیعری پێکەوە دەنێت. حاجی لە شوێن هیچ شوێنێکی جوگرافی، کولتووریی و مێژوویی بۆ نامێنێتەوە، تەنیا ئەوە نەبێت کە شیعر وەک شوێن دەخاتە بریی هەموو ئەوانە.

**شەشەم:** بۆیە شیعر لەلای حاجی زادەی بیر و خۆشەویستییە بۆ زمان، نەک بۆ هاوزمانان و هاوسەردەمەکان. بۆی هەیە هاوزمانان لە دژی شیعر و شاعیران بن. هەر لەبەر ئەم ڕاستییەشە هاوسەردەمەکان «بەیتی مەدداح بە جان دەکڕن» و «زەحمەتە قەدری بەیتی حاجی» بگرن. هەروەها هاوسەردەمەکان لەبەر ئەوەی بوونەتە خاوەنی ڕۆحێکی کۆیلە و ملکەچانە، ناتوانن لە پەیامی ئازادکەر و ڕۆشنگەرانەی زمانی

شاعیران تێبگەن. ئەوان شوناسی خۆیان لە دەستداوە و ڕێگای پەیوەندیی و گفتوگۆیان داخستووە. بۆیە لەلای حاجی (هاوسەردەمی) نابێتە مەرجی (هاوشوناسی). هەر لەبەر ئەوەشە ئەویش دەکەوێتە ستاییشکردنی هاوزمانەکانی (واتە شاعیرانی دی) و چاکی ڕەخنەگرتنی توونڕ لە هاوسەردەمەکانی بەلادا دەکا. بەهەمان شێوە، ڕەگەزێکی ڕەتکردنەوەی قووڵ لە شیعری حاجیدا هەیە بۆ شوێن، بەتایبەتی لەو ئێستایەدا کە ئەوی تێدا ژیاوە لە ئەستەمبووڵ. ئەمەش گەورەترین مەتەڵە لە ئەزموونی شیعریی حاجی قادردا، کە توانیویەتی ئێستا وەک دۆخێکی کات ستایش بکات، بەڵام شوێنی ئەو ئێستایە، کە ئەستەمبووڵە بکاتە کەلاوە و جەهەننەم.

**حەوتەم:** ئەگەر بیرکردنەوە لە شوێن و کات، ئەنجامی بیرکردنەوە بێت لە خود، ئەوە خود بە هۆی کردەوەیەکەوە دەتوانێ بوونی ئێستایی خۆی بەرجەستە بکات، کە کردەی داهێنانی زمان و بەرهەمهێنانی شیعرە. بەڵام شیعر بۆ حاجی ڕیزکردنی وشە و دەستەواژەی هاوکێش و قافیەدار نیە. بەڵکو نیشانەیە بۆ بوونی کائینێکی هەستیار و هۆشمەند، کە پاش ئەوەی ژیان ئەزموون دەکات، ئەو نیشانەیە جێدەهێڵێت تا نەوەکانی

پاش خۆی تێبگەن ئەو چۆن لە (ئێستا)ی خۆیدا ژیاوە و بەمەش خۆی بکاتە بەشێ لە (ئێستاکانی داهاتوو). هەر لەبەر ئەمەشە حاجی چاوەڕوانیی لە شیعر هەیە و بە گەرانتی مانەوەی دادەنێ لە بەردەم تێپەڕینی بێ ئەمانی کات و لە دەستدانی شوێندا. ئەو چاوەڕوانییەش لە زنجیرەیەک بابەت و ژمارەیەک خەسڵەتی جۆر بەجۆردا پۆلێن دەکات، کە هەموویان پانتایی شیعر ڕزگار دەکەن لەو بابەتانەی هەر لە زماندا دەخرێتە ڕوو، کەچی پانتایی ژیان تاریک و تەسک دەکەنەوە و ژیان بۆ مرۆڤ دەکەنە دۆزەخ.

زۆر بابەتی دیکە هەن لە ئەزموونی شیعریی حاجیدا گرنگیی خۆیان بۆ لێکۆڵینەوەکانی داهاتوو هەیە. حاجی لە بیروڕاکانیدا هەڵگریی ئەو ناکۆک و دژوازییەیە کە مۆدێرنیتە لەگەڵ خۆی هێناویێتی. خودێکی پەرتەوازە، بەڵام خودسەنتەر نا، هەمیشە لەسەر پێگەی تاکایەتی خۆی شەڕ دەکات، بەڵام خۆپەرست نییە. زمانێکی نێشدار و زبر گوزارش لە تووڕەییەکانی تاک دەکات لە ئاست نا عەدالەتی و دەستبەسەریی و داگیرکاری، بەڵام بیرکردنەوەیەک کۆنترۆڵی ئەم زمانە دەکات کە بڕوای بە مافی گەلان هەیە و پشتگیریی خەباتیان دەکات.

بەکارهێنانی ڕاناوی (من) لەبەرامبەر ئێوە، یان ئەوانیتردا دەلالەتە لەسەر لەدایکبوونێکی سەرەتایی تاکگەرایی و یاخییبوونیش لە نەریتەکان و کولتووریی باو، پێگەی ئەم منە بەهێزتر دەکەن. لەلایەکیتریشەوە، ڕاشکاوی و ڕەخنەی بەردەوامی ئەم منە لەوە دڵنیامان دەکەنەوە کە نایەوێت بچێتەوە ژێر باری ئێمە دەسەڵاتدارەکەوە، کە هەمیشە منەکان دەکاتە قوربانیی مانەوەی خۆی. بەولای دیکەدا، حاجی ڕەخنەگرێکی سەرسەختی ئایینداریی و ئایینسالارییە، بەڵام هەمیشە وەک دیندارێکی سۆبژەکتیڤ دەمێنێتەوە. نەرێت و نومایش و بانگەوازە ئایینییەکان ڕەتدەکاتەوە، بەڵام خوداناسییەکی بێ ڕیا و دینداریيەکی مەعنەویانە ستاییش دەکات.

حاجی ڕوو دەکاتە ئەستەمبووڵی عوسمانییەکان، بەڵام نە عوسمانیەکانی دەوێن نە ئەستەمبووڵ، لەبەرامبەریشیاندا جگە لە زەبری ڕەخنە، ئەویش جارێ بە حەق و جارێک بە ناحەق، هیچیتری پێ نیە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو لە نزیکەوە و ڕووبەڕوو قسە دەکات نەک لە پاشملە و لە دوورەوە. ڕاشکاویی و شەففافییەت لە حاجی قادردا ئەوەندە بەرجەستەن کە هیچ سانسۆرێک لەسەر زمانی دەربڕین دانەنێ و ئەوەی بە زمانیدا دێت، چ لە ئاست دیاردە ناوەکیی و چین و توێژە خۆماڵییەکاندا و چ لە

ئاست دەستە و تاقمی بێگانە و دیاردە دەرەکییەکاندا، دەیڵێ و دەینووسێت. پێوەریی حاجی بۆ خۆسانۆریی ئەم سات و دەمەیە کە ئەو تیایدا دەنووسێت، نەک شتێکی دیکە، بۆ نمونە ڕێزدانان لە ئەخلاقی باو، یان خاترانە. حاجیی شتەکان بە وشەکانی خۆیان ناو دەنێت و گوزارشیان لێدەکات. بۆیە زمانی ئیستیعارە و خوازە لە شیعری حاجیدا لەبەرمبەر زمانی ڕاشکاویی و قسە لە ڕوویی دەچێتە پەراوێز و دۆخی متبوونی خۆیەوە.

حاجی شیعری ئایینی زۆر کەمە، لە چاو شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کوردیدا، بەڵام شیعری دنیایی زۆرە. ئەو هەرچەندە مەلاش بوو بەڵام هەرگیز مەلایەتی نەکرد، هەرچەندە حاجییش بوو بەڵام هەرگیز نەچووە حەج. ئەو چەندە مۆدێرنە لە هزریندا ئەوەندەش دواکەوتووە لە پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و سۆزدارییدا. لە سەراپای دیوانی حاجیدا بە دەگمەن شیعر و غەزەل بۆ ژن دەبینیتەوە، ئەوەشی کە هەیە بە ئاشکرا دەریدەخات کە حاجیی ژنی لە ڕووی سۆزداریی و هەستەوەرییەوە نەناسیوە. بە پێچەوانەی ئەوەی لەسەر چین و توێژە کۆمەڵایەتی و خەباتی میللەتان دەیڵێت، کە هەمووی ڕەنگدانەوەی هزری مۆدێرنە، کەچی ئەوی لەسەر ژن دەیڵێت حاجی دەخاتەوە ناو بازنەی نەرێتخوازیی و پیاوسالاری..

له کۆتاییدا، حاجی قادر جیاواز بوو: له مێژووی میللەتەکەیدا به شاعیرێکی ئاواره ناو دەبرێت. له مێژووی ئەدەبدا به شاعیرێکی کلاسیک، له ژیانی خۆیدا تەنیا و له سەردەم و کاتی خۆیشدا: تاقانه. وەلێ ئەو هەمیشه بیری له لای کۆمەڵگاکەی بوو، بۆ ئەوانیتر دەژیا و خاوەنی شوناس و زمانی شیعریی خۆی بووه. هەر بۆیەشه بەرگەی تۆفانی سەردەمەکانی گرت و خۆی له سەردەمی داهاتووەکانیشدا بەرجەسته کرد. بگره ناچاریکردن دەست له «جەهالەتی» خۆیان بەرامبەر به شیعر هەڵبگرن و له ڕوانگەیەکی «وەحشیانه»وه نەڕواننه بەرهەمەکانی:

بەیتەکان عەیبی مەکەن، خوار و کەچن
مەقصەدم: لەم بەند و باوه دەربچن
وەرنێ ئەم دونیایه نەفسی نەفسییه
گەر لەبەر ئێوه نەبێ، باکم چییه؟
من له تۆفانا بەری خۆم دەردەکەم
وامەزانه دامەنی خۆم تەڕ دەکەم
ئێستا هەرچیم پێ بڵێن عەیبی نییه
چونکه ئینسان عیلمی غەیبی پێ نییه
ئاخیری چی وەحشییه، ماڵی دەبێ
جاهیلیش ئەو ڕۆژه دێ، حاڵی دەبێ

خۆزگە دەمتوانیی لەسەر هزرین و جیهانبینی حاجیی بەردەوام بم.. بەڵام شتێک هەیە لە ناخەوە پێمدەڵێت لە ئێستادا بوەستە، حاجی قادر بەم زووانە نامرێت...

# پێشنیار بۆ داهاتوو..

وەک لە چەند شوێنێکی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا، پێشنیارم کردووە، پێویستە توێژینەوە لە دۆخی حاجی قادر لێرەدا کۆتایی پێ نەیەت و بەردەوام بێت. بۆیە وەک ئەرکێکی زانستی و بەرپرسیارییەکی ئاکاری توێژینەوەیی لەم گۆشەیەوە چەند پێشنیارێک بۆ توێژەرانی داهاتوو دەخەمە ڕوو.

یەکەم: دوانەی (من/ ئێمە): هەروەک لە لاپەڕەکانی پێشوودا دەستنیشانم کردووە، حاجی قادر نەک هەر بەتەنیا نمونە مرۆڤێکە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا شوێنگۆڕکێیەکی نەوعی دەکات، بەڵکو لە ڕووی کولتوورییشەوە گۆڕانێک ڕوویداوە کە پەیوەندیی بە چوونی ئەوەوە هەیە لە دنیایەکی ناشارییەوە بۆ شار، یان لە پەراوێزەوە بۆ سەنتەر. لە کوردستانەوە بۆ ئەستەمبووڵ. کولتووری شار بەو جۆرەی کە ئێمە چاوەڕێدەکەین بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لە ئەزموونی شیعریی ئەودا بەرجەستە نەبووە، بەڵام ڕەنگدانەوە

هزرییەکانی تەواو دیارن و پێویستە توێژینەوەیان لێبکرێت، بەتایبەتی لە چەند ئاستێکدا:
مەسەلەی چەمکی تاکایەتی و بەتاکبوون، وەک بەشێکی لە ڕەوەندی ڕزگاریی منی تاکەکەس لە ئێمەی بە کۆمەڵ. حاجی قادر لە کولتوورێکی ئێمەییەوە بەرەو کولتوورێک کۆچیکرد، کە بواری ئەوەی هەبوو (من)ی خۆی بەو جۆرەی کە شار ڕێگە دەدات، بەرجەستە بکات. لێرەدا قسە لەسەر دژوازیی کولتووریی پێش مۆدێرن و کولتووریی مۆدێرن دێتە پێشەوە. یەکەمیان کولتورێکی دەستەگەرییە کە تیایدا بواری بەرجەستەبوونی تاکەکەس زۆر بەر تەسک و سنوورداره. نەریت و دووبارەکردنەوەی بەشێکی گرنگیی ئەم کولتووره پێکدەهێنن و ئەوەی لە دەرەوەی نەریت بێت، وەک شتێکی بێگانە و خراپ و مەترسیدار تەماشای دەکرێت. بەڵام لە کولتووری مۆدێرندا، تاکەکەس دەبێتە چەق و بواری خۆدروستکردن و خۆبەرجەستکردنی زیاتر بۆ دەڕەخسێت. لەم پەیوەندییەدا توێژینەوە لەو نمونە شیعریانە و ئەو ئیستیعارە و دەستەواژانەی کە بەڵگەی ئەم گۆڕانکارییەیان لێوە بەدەست دەهێنین، کارێکی پێویستە. ئێمە لە زمانی حاجیدا دەتوانین نمونە گەلێک بهێنینەوە کە لەلایەکەوە مانەوەی حاجی لە کولتووریی

دەستەگەریی و لەلایەکەوە هەوڵدانی ئەو بۆ بەرجەستەکردنی منی تاکگەرایانە و لەلایەکیتریشەوە، تێکەڵکردنی هەردووکیان دەبینینەوە. ئەمەش بایەخ و گرنگیی خۆی هەیە تا لێوەی ئەو تێشکەی مۆدێرنیتە و کولتووریی مۆدێرن پەیگیریی بکەین کە لە ڕێگەی شیعریی حاجییەوە دێتە ناو دنیای ئێمەوە. وێڕای ئەوانەش، مەسەلەی تاکگەرایی و ئەو هەوڵە سەرەتاییەی حاجی داوێتی لەم پێناوەدا، کە بناخەیەکی پێش هووشیارییشی هەیە، بۆ ئێمە بەهایەکی فیکریی و کولتووریی زۆر گرنگی هەیە و دەبێتە بەشێک لە سەلماندنی پەیوەستبوونی کورد بە مۆدێرنیتەوە. لێرەدا وشەی تاکایەتی (*individualisme*) بە هەمان مانا بەکار دەهێنم کە لویس دۆمۆن لە کتێبەکەیدا: (وتارگەلێک لەبارەی تاکایەتییەوە: ڕوانگەیەکی مرۆڤناسیانە بۆ ئایدیۆلۆژیای نوێ)، بەکاریهێناوە[1]: یەکەم: تاک وەک خودێکی پراکتیکی: کە دابەش نابێت و ئۆرگیناڵ و بێ جێگرەوەیە. دووەم: تاکەکەس وەک بوونەوەرێکی ئەخلاقی، سەربەخۆ، سەربەخۆی خودی و بەتایبەتی لە

---

[1] لويس دومون: مقالات فی الفردانية (منظور أنثروبولوجی للآيديولوجية الحديثة). ت: د. بدر الدين عرودكی. بيروت. منظمة العربية للترجمة. مركز دراسات الوحدة العربية. لبنان: الطبعة الاولی, 2006. ص: 32, 33, 89, 353-354

ڕووی جەوهەرییەوە، تا کۆمەڵایەتی. حاجی قادر هەردوو ئەم خەسڵەتەی لە ئەزموونی خۆیدا بەرجەستە کردووە، لەلایەکەوە شەڕێکی قورس دەکات بۆ خۆ ڕزگارکردنی لە هەر جۆرە دەسەڵاتێکی خۆسەپێنەری کولتووریی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی و ژیانەکی و کردەیی، کە بەناوی میرات و مێژوو و سەردەستەیی کۆمەڵایەتیەوە، کاریی خۆیان لە پێناوی ئامانجی خۆیاندا، لە کۆمەڵگادا دەکەن و خزمەت بە مانەوەی دۆخی لەباری خۆیان دەکەن، نەک خزمەت بە بەرژەوەندیی گشتی. لە لایەکیترەوە و لە ئاستی کوردبوونیدا هەوڵێکی زۆر دەدات بۆ بەدەستهێنانی کەسایەتییەکی تایبەت، نمونەیی و جیاواز و سەربەخۆ لە مرۆڤی کورد کە (ئەویتر) نیە. لە دنیای هزرینی حاجیدا ئەم جیاوازییە بەهایەکی مەزنە بۆ کوردبوون و بۆ بەدەستهێنانی شوناس. بەم مانایە زەمینەیەکی لەبارمان هەیە بۆ بەراوردکردنی پێگەی حاجی لەگەڵ و لە ئاست پێگەی منەووەرەکانی دیکەی هەمان سەردەمدا لە وڵاتانی سەردەستەی خۆرهەڵاتی ناوین، کە خەباتیان دەکرد بۆ بەخشینی ڕووخسارێکی مۆدێرن بە کۆمەڵگای خۆیان بە گرتنە بەری ڕێچکەی ئەوروویا لەو سەردەمەدا. ئەمەش بەڵگەی ئەوەمان دەداتێ کە کوردیش لەگەڵ و هاوکات بەو میللەتانە لە

هەوڵی خۆ ڕزگارکردنیدا بووە لە هووشیارییەکی پێش مۆدێرنەوە بۆ هووشیارییەکی مۆدێرن لەسەر بوونی خۆی[1].

ئەم تاکەکەسە، هەر تەنیا مرۆڤێکی توانا و ئیرادەگەرامان پێ ناناسێنێت. بەڵکو مرۆڤێکی تواناگەریشمان پێدەناسێنێت، مرۆڤێک کە دەتوانین بە شوێنپێ هەڵگرتنی ڕیکۆر، بە شێوەیەکی دیاردەناسانە لێی بکۆڵینەوە[2]. مرۆڤێک کە دەتوانێت *بڵێت*، گوزارش لەو هەست و تێگەیشتنە بکات کە بەرجەستەکەریی خۆیەتی[3]: (من حاجی قادرم، من کوردم) و ئەم خودەش ئەوەندە هووشیارە کە توانای خۆجیاکردنەوەی لە ئەوانیتر هەیە. خودێک دەتوانێت ***بکات***، ***چالاک*** بێت، هەستێت بە ***کردەیەک***[4]: (هووشیارکردنەوە، هاندان، داواکردنی دەوڵەت). هەروەها توانای هەیە ***بگێڕێتەوە*** و ***خۆی ڕیوایەت*** بکات، مێژوو بگێڕێتەوە و باسی یادوەریی خۆی بکات[5]. ئەمە جگە لەوەی تونای هەیە بانگەشە بکات کە

---

[1] لەمبارەیەوە بڕوانە کتێبە بە نرخەکەی: حازم صاغیە: مأزق الفرد في الشرق الأوسط. دار الساقي، لندن: 2001.

[2] بول ريكور: سيرة الاعتراف. ثلاث دراسات. ترجمة: فتحي انقزو. المركز الوطني للترجمة. تونس، دار سيناترا، 2010، ص: 133- 152

[3] بول ريكور: سيرة الاعتراف. ص: 137

[4] بول ريكور: سيرة الاعتراف. ص: 140

[5] نفس المصدر، ص: 143

چیی چاکە و چیی خراپ، چی ئاکارمەندانەیە و چی بەدوور لە ئاکار، چی ئاسایی و موباحە و چی نائاسایی و قەدەخە[1].

دووەم: هزریی ڕەخنەیی: لە شیعری حاجیدا بنەمای دید و بۆچوونەکان، جیهانبینی، بەکارهێنانی زمان و پێکهاتەکانی، بنەماکی چوونەوە بۆ مێژوو، لە ڕێگەی یادوەریی و وێناکردنەوە، هێنانەوە پێشچاوی ئەوەی هەبووە و پیشاندانی ئەوەی کە هەیە، گشت ئەمانە لەسەر بناخەیەکی ڕەخنەیی دامەزراون و کاری خۆیان دەکەن. حاجی بە پێویست و ناچارەکی، نەک ئادیۆلۆژیانە و حەماسیانە، لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەییەوە بیر لە جیهان و مرۆڤ و کێشەکانی دەکاتەوە و هەڵوێستێکی دژ لە مێژوو، کولتوور و هێزە کۆمەڵایەتییەکان وەردەگرێت. ئەمەش ئەو دەخاتە ڕیزی پێشەوەی ڕەخنەگرتنێکی مۆدێرن لە باو، لە نەریت و لە گشت ئەو ئاڵۆزییانەی ژیانی مرۆڤی مۆدێرنیان تەنیوە. ئەم ئاڵۆزییە لە بیرکردنەوەی مۆدێرندا، هزری حاجی خۆیشی گرتۆتەوە بە تایبەتی لە مانەوەی لە نێوان بیرکردنەوەی ئایینی

---

[1] بول ريكور: سيرة الاعتراف. ص: 148

نەریتگەرایانە و بیرکردنەوەی لە دین وەک مەسەلەیەکی تاکەکەسی. ڕەخنەی حاجی لە ئایین و مانەوەی لە بازنەی دیندارییەکی خودگەرایانەدا، کە لەلای مەحویش دەبینرێتەوە، هەر تەنیا بنەمایەکی ئایدیۆلۆژیی نیە. بەڵکو هاوکاتیشە بە فڕێدانە دەرەوەیەکی بنەبڕانەی دامەزراوەی ئایینیی و گشت ئەو فیگەرانەی لە کۆمەڵگایەکی تایبەتدا نوێنەرایەتی باوەڕداریی لە ڕێگەی دامەزراوە ئایینییەکانەوە دەکەن و وەک بەشێک لە دەسەڵات دەردەکەون کە دەبنە ڕێگر لەبەردەم پێشکەوتن و گۆڕانیی کۆمەڵایەتی و دۆخی تاکەکەس لە کۆمەڵگادا. هەموو ئەمەش ڕزگارکردنی (دین)ی وەک مەسەلەیەکی تاکەکەسی و سۆبژەکتیڤ و کولتووریی، لە (ئایین) وەک سیاسەتێکی ئاپۆرەیی و مۆبێلیزەکردنی کۆمەڵگا بۆ باوەشی فۆرمەکانی فەندەمەنتاڵیزم و دەمارگیریی ئایینی لێدەکەوێتەوە. ئەگەر ئێمە توانیمان لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی وردەوە ئەمە بسەلمێنین، ئەوە توانیومانە لە حاجی قادر نمونەیەکی پێشوەختی بەرەنگاربوونەوەی فۆرمەکانی دەمارگیریی ئایینی و فەندەمەنتاڵیزمی کولتووریی و سیاسیی و ئایدیۆلۆژیی، بناسێنین، کە پێگەی ئەو بەرز دەکاتەوە سەر ئاستی بیرمەند و فەیلەسووفانێک، پێش ئەو و هاوکاتی ئەو لەم پێناوە دا

خەباتێکی فەلسەفیی و فیکریی زۆریان کردووە. زەخیرەکە لەلای حاجی هەیە، بەڵام چۆن ئاراستەی بکەین و لە هەناوی ئەزموونە شیعرییەکەیەوە ئەو زەخیرەیە بکەینە بەشدارییەکی هزریی و مەعریفی، ئەمەیان کاری زانستیانەی وردی دەوێت. گرنگترین خاڵ لە پەیوەندیی بەمەوە، ئەوەیە کە ئەم زەینییەتە ڕەخنەییە شیاو نە دەبوو ئەگەر حاجی قادر لە شاردا نەژیابا و ئەزموونی ژیانی شار کاریگەریی لەسەر بیرکردنەوە و گۆڕینی هووشیارییدا نەکردبا. بەمجۆرەش ئەوەی حاجی لە شیعردا لەسەر شار لێی ڕادەکات و خۆی لێدەبوێرێ، لە هزرین و ئاستی ڕۆشنبیرییدا بۆی دێتەوە و خۆی لەبەردەمدا قوت دەکاتەوە!

سێیەم: یادوەریی و بیرچوونەوە: لە ئەزموونی شیعریی حاجیی قادردا ڕێچکەیەکی ڕوونی یادوەریی تایبەت و کەسیی و یادوەرییەکی مێژوویی و گشتیمان هەیە، کە خۆی لەبەردەم ترسی بیرچوونەوەدا دەبینێت. حاجی هەرگیز بیرەوەریی خۆی بە شیعر، چ بیرەوەیی شەخسی و چ گشتی نەنووسیوەتەوە. بەڵام هەمیشە لە هەوڵی پێکەوەنانەوەی یادوەرییە شەخسییەکانی خۆی و تێکەڵکردنیانە لەگەڵ یادوەرییەکی گشتییدا. ئەم مەسەلەیە

چ توێژەرانی بواری دەروونشیکاری، چ مێژوویی و چ توێژینەوەی فەلسەفی لە مرۆڤ هاندەدات بۆ لێکۆڵینەوەی زیاتر لە ئەزموونی حاجی قادر. لەم نێوانەدا لانیکەم دوو فەیلەسووفی گەورەی سەدەی بیستەم هاوکارییەکی زانستی و فیکریی قووڵمان دەکەن بۆ خوێندنەوەی ئەزموونی حاجی بە گرتنە بەری توێژینەوە لە یادوەریی کات و شوێن و لە تێگەیشتن لە مەترسییەکانی بیرچوونەوە و لەیادچوون، کە لە شیعری حاجیدا بە تەواوی بەرجەستەن. ئەو دوو فەیلەسووفەش کەس نین لە هانری بیرگسۆن و پۆڵ ڕیکۆری فەرەنسیی زیاتر. من هەر کات باسەکانی بێرگسۆن لە کتێبەکەیدا: (کات و ویستی ئازاد)[1] و لێکۆڵینەوەکەی ڕیکۆر بەناوی (یادوەریی، مێژوو، بیرچوونەوە)[2] دەخوێنمەوە، یەکسەر ئەزموونی حاجی قادرم بیر دەکەوێتەوە. چ ئەو شیکردنەوەیەی برگسۆن یادوەریی و یادکردنەوە دەیکات

---

[1] هانری برگسن: پژوهش در نهاد زمان و اثبات اختیار. ت: علی قلی بیانی. چ: 1، تهران: شرکت سهامی انتشار، 1368. بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بەشێوەیەکی کورتکراوە، لەم سەرچاوەیەشدا دەبینیتەوە:

- کیث انسل پیرسون و جان مورل کی: فلسفهء برگسن. ت: د. محمد جواد پیرمرادی. تهران: مرکز تحقیق و توسعه علوم انسانی. 1389، ص: 85-127

[2] بول ریکور: الذاكرة, التأريخ, النسيان. ت: د. جورج زيناتي. بيروت, لبنان, دار الكتاب الجديد المتحدة, 2009, ص: 31-207 و 602-728.

و له ڕێگەیەوە جەستە دەکاتە سەنتەرییێکی گرنیگی پەیوەندیی مرۆڤ بە دەوروبەر و پرۆسەی ئیدراککردنەوە[1]، ئەمەش لە شیکردنەوەی حاجیدا بۆ یادکردنەوەی کوردستان و ئەزموونەکانی لە دوورە وڵاتییەوە، گرنگیی خۆی هەیە و، چ ئەو شیکردنەوەیەش ڕێکۆر بۆ خەیاڵ و یادەوەریی کردوویەتی و دەیبەستێتەوە بە کات و شوناس و ترسی بیرچوونەوەوە، کە لە حاجیدا زۆر بەرجەستەیە. هەردووک ئەمانە بۆ خوێندنەوەی نوێی ئەزموونی حاجی قادر گرنگیی خۆیانیان هەیە. کاتێک ڕیکۆر لە سەرەتای کتێبەکەیدا دەنووسێت: "پێویستە لەدژی ئەو تەوژمە تەقلیدییەی چواردەوری یادوەریی گرتووە و لە پەراوێزی ڕەخنەگرتنیدا لە خەیاڵ، مامەڵەی لەگەڵ دەکات، دەست بکەین بە جیاکردنەوەی خەیاڵ و یادوەریی تا دوورترین شوێنێک بتوانین. بیرۆکەی سەرەکیی لێرەدا بوونی دژوازییەکە، کە دەتوانین بڵێین جەوهەرییە لە نێوان هەردوو ئامانجە مەبەستگەراکەدا: یەکێکیان، کە ئەویش *مەبەستگەرایی خەیاڵە، ڕێچکەکەی بەرەو وەهمی،*

[1] محمد جواد پیرمرادی: فلسفەء هستی سیال (تأملاتی تاریخی در مبانی، پیش فرض ها و پیامدهای نظریەء دیرند ،بنیادی ترین أصل فلسفةء برگسن". تهران: سروش، 1392، ص: 48-50

*چیرۆکاوی، ناڕاستانه و نا واقیعیانه و ناشیاو و یۆتۆپی* دەچێت. ئەوەیتریشیان کە مەبەستگەرایی یادوەرییە، بەرەو ڕاستەقینەی پێشوو، واقیعی لەمەوبەر و شێوەیەک لە پێشدەستیکردنی کاتیانە بۆ شتی یادکراو، لەلایەن یادکەرەوەوە پێکدەهێنێت"[1].

لەم ڕوانگەیەوە باشتر لە جەوهەریی یادکردنەوەکانی حاجی تێدەگەم کە ئەو بۆ سارێژکردنەوەی تراژیدیا کەسیی و گشتییەکەی، چۆن پەنای بۆ یادی وڵات بردووە نەک خەیاڵکردنەوەی ڕووت لە ڕابردوو، لەمەشەوە بۆم دەردەکەوێت کە هەوڵدانەکانی حاجی بۆ دروستکردنی شوناسی کوردبوونی خۆی چەندە لەسەر زەمینەیەکی ئەزموونی و هزریی بیناکراون کە ئەو بە جەستەی خۆی لە میانەی ژیانێکدا ئەزموونی کردبوون، نەک تەنیا حەزێکی تایبەت بۆ نووسینی شیعر.. هەموو ئەمانە پێمدەڵێن هێشتاش شتێکی قووڵ لە ئەزموونی حاجیدا هەیە، کە تەنیا بە توێژینەوە لە ڕووکارە شیعرییەکانی و بەستنەوەیان بە مێژووی ژیانییەوە، تێی ناگەین، ئەگەر نەیبەستینەوە بە ناوەڕۆکە قووڵە فیکرییەکانیەوە لە تێڕوانیندا بۆ خۆی و بۆ کوردبوون و

---

[1] بول ريكور: الذاكرة, التأريخ, النسيان. 2009, ص: 34

بۆ جیهان و کۆی ئەو ناکۆکی و شیاوانەی لەم نێوانەدا بوار بە کوردبوون دەدەن لە مێژوودا دەرکەویت.
ئەمەیە ئەو شتەی کە هیوادارم پاشەڕۆژ بتوانێت زانستیانە و وردەکاریانە خۆی لێ بدات و ڕەوتێکی توێژینەوە پێک بێت پێویستی بە چوونەوە بۆناو نەریتی توێژینەوەی تەقلیدیی نەبێت. بەمجۆرەش گرتنەبەری میتۆدیی فرەیی و جێهێشتنی تاکڕەهەندیی میۆدیی، دەبێتە پێویستییەک بۆ تێگەیشتنێکی بەرفراوانتر لەم ئەزموونە. وەکئەوەی تێگەیشتن بەبێ گرتنە بەری فرەمیتۆدیی هەر لە مانەوە لەو تاکڕەهەندیی و مێژووییەدا بمانهێڵێتەوە، کە بۆتە نەریتێکی توێژینەوە لە حاجی قادری کۆیی.. ئەم شێوازی خوێندنەوەیە دواجار نەک هەر ناتوانێت حاجی قادر بهێنێتە زەمەنی ئێستاوە و لێمانی نزیک بخاتەوە، بەڵکو جگە لە هەڵکەندنی گۆڕێکی هەمیشەییش بۆ حاجی قادر هیچ دیارییەکی دیکەی لە هەگبەدا نیە.

# سەرچاوەکان

## (بەپێی بەکارهێنان و سوودلێوەرگرتنیان لە هەر بەشێکدا)

- سەعید کەرەمی: دیوانی حاجی قادری کۆیی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: سەردار حەمید میران و کەریم موستەفا شارەزا. لەسەر نووسنێکی نوێ بە پێی بۆچوونەکانی موحەمەدی مەلا کەریم. ئینتیشاراتی کوردستان، سنە، 1391 (2012).
- نزار سابیر: ناسیۆنالیزم و موزیک (لە ئەزموونی کودرستانی عێراق دا). ئەڵمانیا: Clausen &Bosse –CPI، چاپی یەکەم، 2011
- دایره المعارف ناسیونالیزم، 1380
- دریوش اشوری: دانشنامه سیاسی، 1370
- عزت الله فولادوند: خرد در سیاست، تهران: طرح نو 1377
- مەسعود محەمەد: حاجی قادری کۆیی، بەرگی 1، 2 و 3. هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی دووەم، 2010
- فازیل کەریم ئەحمەد (مامۆستا جەعفەر): مێژووی بیری کوردی. "حاجی قادری کۆیی و پرۆسەی وێستەرنیزەیشن"، سلێمانی، لە بڵاوکراوەکانی دیداری جیهانیی مەولاناخالیدی نەقشەبەندی 3، 2009
- ڕەفیق حیلمی: شیعر و ئەدەبیاتی کوردی. هەولێر، چاپخانەی خوێندنی باڵا، 1988.
- ڕێبوار سیوەیلی: شوین و شوناس. خوێندنەوەیەکی دیاردەناسانە بۆ شاری سلێمانی. سلێمانیک غەزەلنووس، 2015

- کریستیان نوربرگ-شولتز: *اندیشه‌های هایدگر در باب معماری* در: معماری: معنا و مکان. ترجمه: ویدا نوروز برازجانی، تهران: نشر جان جهان، 1382
- مارتین هایدیگر: شعر، زبان و اندیشه‌ی رهایی. مترجم: دکتر عباس منوچهری. تهران، انتشارات مولی
- د. مصطفی بهزادفر: هویت شهر. نگاهی به هویت شهر تهران. تهران، نشر شهر، 1390
- مەریوان وریا قانع: ناسیۆنالیزم و سەفەر. کورد لە دیاسپۆرا. بڵاوکراوەکانی نێوەندی ڕەهەند. سلێمانی: چاپخانەی ڕەنج، 2005
- د. جەعفەر عەلی: ناسیۆنالیزم و ناسیۆنالیزمی کوردی. سلێمانی: ئەندێشە، چ: 2، 2013.
- بندکت أندرسن: الجماعات المتخیله. تأملات فی أصل القومیه و انتشارها. ت: ثائر دیب. المرکز العربی للابحاث و دراسه السیاسیات. بیروت: 2014.
- ڕێبوار سیوەیلی: کتێبی نالی. چاپی دووەم، هەولێر: لە بڵاوکراوەکانی ماڵی وەفایی و دەزگای زەریاب، 2015
- یاسین عومەر ئیبراهیم: مۆدێرنە و ڕەخنەکردنی کۆمەڵایەتیانەی ئایین لە هەرێمی کوردستاندا. ماستەرنامە (بڵاو نەکراوەتەوە)، زانکۆی سلێمانی، بەشی کۆمەڵناسی، 2016.
- ایموس راپاپورت :"*خاستگاههای فرهنگی معماری*" ترجمه صدف ال رسول و افرا بانک، فصلنامه خیال، شماره 8، زمستان 1382

- ادوارد رلف: مکان و بی مکانی. ت: د. محمد رضا نقصان، د. کاظم مندگاری، مهندس زهیر متکی، تهران، انتشارات ارمانشهر، 2002
- ئازاد سوبحی: دەنگ و سێبەر. کۆمەڵە وتار. چاپی یەکەم، هەولێر: لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری نما (8)، 2002.
- کریستین نوربیرگ- شولتز: روح مکان. به سوی پدیدارشناسی معماری. ت: محمد رضا شیرازی، تهران، رخداد نو، 1388 (2009).
- راپاپورت، آموس(1384)، معنی محیط ساخته شده: رویکردی در ارتباط غیرکلامی، ترجمه فرح حبیبی، تهران، انتشارات پردازش و برنامه ریزی شهری.
- وسلی کورت: زمان و مکان در داستان مدرن. ت: فرناز گنجی و دکتر محمد باقر اسماعیل پور. تهران: اوند دانش، چ: اول، 1391 (2012)
- Henri Lefebvre : *The Production of Space*.Translated by Donald Nicholson- Smith. Blackwell Publishing1991.
- د. خانزاد عەلی قادر: زمانی شیعری حاجی قادری کۆیی و مەحوی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی. بڵاوکراوەکانی ئەکادیمای کوردی، 2013، هەولێر.
- حمیدرضا شعیری: *نوع شناسی مکان و نقش ان در تولید و تهدید معنا* له دکتر فرهاد ساسانی: نشانەشناسی مکان، مجموعه مقالات نقدهای ادبی-هنری. (مجموعه مقالات هفتمین هم اندیشی نشانەشناسی)، تهران: انتشارات سخن، 1391 (2012)

- یوهانی پالاسما: دست متفکر. حکمت وجود متجسد در معماری. ت: علی اکبری. تهران: پرهام نقش، 1392.
- یوهانی پالاسما: چشمان پوست: معماری و ادراکات حسی. ت: رامین قدس. تهران:پرهام نقش. 1390.
- محمد رضا شیرازی: معماری حواس و پدیدارشناسی ظریف یوهانی پالاسما. تهران: رخداد نو. 1391.
- دکتۆر مارف خەزنەدار: مێژووی ئەدەبی کوردی. بەرگی چوارەم، نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم 1851-1914، هەولێر، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، 2004.
- ئیدریس عەبدوڵڵا ئومەرگومەتی: لە دەروەندەوە هەتا ئەیرە، مێژوو. (مانەوەی کولتوور و شێوەزار). لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی کۆمەڵایەتیە لەسەر ڕەچەڵەک، شێوەزار، کولتوور و داب نەریت، درەختی خانەوادەی تیرەی دەربەندییەکان). سلێمانی: چاپخانەی کەمال، چاپی یەکەم، 2015
- شەرەف خانی بەدلیسی: شەرەف نامە. وەرگێڕانی: هەژار. هەولێر، دەزگای ئاراس، 2006
- محەممەد ئەمین زەکی بەگ (سەرجەمی بەرهەم، بەرگی چوارەم): خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان لە زۆر قەدیمەوە تا ئیمڕۆ. ئامادەکردنی: ڕەفیق ساڵح، بنکەی ژین، سلێمانی: 2006
- محمد علی سوڵتانی: جغرافیای تاریخی و تاریخ مفصل کرمانشاهان (*ایلات و طوایف کرمانشاهان*)، جلد، دوم، جلد سوم، چاپ دوم، تهران: بانک ملی ایران، 1381
- د. جەمال نەبەز: وشەنامەکی ئیتیمۆلۆژیای زمانی کوردی. کۆبەرهەم ژ (8)، چاپی یەکەمی ئەلیکترۆنی، 2008

- میرچا الیاده: أسطورەء بازگشت جاودانه. ترجمەء: بهمن سرکاراتی، تهران، انتشارات طهوری، چاپ: دوم، 1384 (2006).
- میرچا الیاده: "معماری قدسی و رمزپردازی". له: أسطوره و رمز در اندیشەی میرچا الیاده. ترجمه: جلال ستاری، VI، چ: اول، 1381 (2002)، تهران: نشر مرکز
- د. جەمال محەمەد فەقێ ڕەسوڵ باجەلان: "ڕۆڵی حوجرەی مزگەوتەکانی کوردستان لە سەر ژیان و هزر و بەرهەمی حاجی قادری کۆیی" لە: دیداری حاجی قادری کۆیی (2016)، تەقتەق.
- خالید دلێر: ستەمکردن لە حاجی قادری کۆیی تاوانە. سلێمانی، چاپخانە و ئۆفیسی سەفوەت، 1998.
- أرسطو: سماع طبیعی (فیزیک)، ت: محمد حسن لطفی، تهران، طرح نو، 1386 (2007)
- مورس مرلو بونتي: ظواهرية الادراک. ت: د. فؤاد شاهين، معهد الانماء العربي، بيروت، 1998
- Maurice M. Ponty: Kroppens fænomenologi. Det Lille Forlag، København، 1994
- ڕێبوار سیوەیلی: پییەر بۆردیۆ و کۆمەڵناسیی فەلسەفی. چ: دووەم، دەزگای زەریاب 2013
- دیوید انگلیس: فرهنگ و زندگی روزمره. مترجم: علیرضا مرادی، تهران: انتشارات نیسا، 1391 (2012)
- مارتین هایدگر: شعر، زبان و اندیشەی رهایی. ت: د. عباس منوچهری، تهران، امتشارات مولی، چ: دوم، 1389 (2010).
- Jeff Malpas، Heidegger and the Thinking of Place، Cambridge and Massachusettes، the MIT Press، 2012.

- Jeff Malpas، Heideggers Topology، Cambridge and Massachusettes، The MIT Press، 2005.
- ناصر براتی، فرزاد زرین قلم: ملاحظاتی در رابطه با زبان، فرهنگ، ادراک و محیط انسان ساخت. تهران: انتشارات پرهام نقش، 1392، (2010)
- اموس راپاپورت: فرهنگ، معماری و طراحی. مترجمان: ماریا برزگر، مجید یوسف نیاپاشا. تهران، انتشارات سلفین. چ: اول، 1391 (2012)
- ڕێبوار سیوەیلی: دیاردەگەرایی تاراوگە. چاپی یەکەم، 1995، انتشارات باران، سوئد. چاپی دووەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، 2002
- Rapaport، A: House Form and Culture. Englewood Cliffs: Prentice- Hall Saeed، J. I. (2003). Semantics. 2ed edition، Blackwell Pub.
- ادم شار: هایدگر برای معماران (تأملی بر سنت معماری مدرن). ترجمه و گرداوری: روزبه احمدی نژاد. تهران: انتشارات: طحان/هله، 1388
- گاستون باشلار: بوطیقای فضا. مترجمان: مریم کمالی و مسعود شیربچه. تهران، انتشارات روشنگران و مطالعات زنان، چ دوم، 1392
- د. مراد حکیم محمد، ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ڕاگواستنی کورد لە عێراق ١٩٦٣-٢٠٠٣
- پۆل دومۆن: سەردەمی تەنزیمات (1839-1878). وەرگێرانی لە فەرەنسییەوە: نەجاتی عەبدوڵلا، هەولێر: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم: 2008

- ttp://www.etymonline.com/index.php?allowed_in_frame=0&search=nostalgia
- http://www.southampton.ac.uk/nostalgia/
- ئیدریس عەبدووڵڵا ئومەرگومەتی: *"ویستگەکانی ژیان و پێکەیشتنی کەسیەتی حاجی قادری شاعیر"* لە: دیداری حاجی قادری کۆیی، تەقتەق، وەزارەتی ڕۆشنبیری و لاوان، بەڕێوەبەرایەتی چالاکی ویژەیی سلێمانی، چاپی یەکەم، 2016
- اموس راپاپورت: **فرهنگ، معماری و طراحی**. مترجمان: ماریا برزگر، مجید یوسف نیاپاشا، تهران: انتشارات شلفین، چ: اول، 1391 (2012)
- Kadri Yildrim: **Xaniye Duyem (Haci Qadire Koyi)**. Istanbul، Avesta، 2016
- کریستیان نوربری-شولتز: **مفهوم سکونت (به سوی معماری تمثیلی)**. ترجمهء: محمود امیر یارأحمدی. تهران: نشر اگه، چ: پنجم، 1392 (2013)
- کەریم مستەفا شارەزا، نازم حەویزی و ئەوانیتر: **کۆیە لە ڕەوتی شارستانیەتدا**. هەولێر، وەزارەتی ڕۆشنبیری، زنجیرەی (359)، چاپی یەکەم، 2009
- برنارد لویس: **اسطنبول و حضارة الخلافة الاسلامية**. تعریب مع تعليقات نقدية و ايضاحية مفيدة، د. سيد رضوان علی. دار السعودية للنشر و التوزيع، الطبعة الثانية، 1982
- اندرو ويتكروفت: **العثمانيون: تفكيك الصور**. مركز الامارات للدراسات و البحوث الاستراتيجية، ط: الاولی: 2014
- J. J. THOMÆUS: Chbistianstad 1835
- http://www.marefa.org/index.php/

- *Magnus Västerbro:*
*ttp://www.altomhistorie.dk/artikler/konstantinope*
- خليل انجاليک (محرر): التأريخ الآقتصادى و الاجتماعى للدولة العثمانية. المجلد الثانى (1600-1900)، ت: د. قاسم عبدة قاسم. دار المدار الآسلامى، بيروت-لبنان، 2007
- - Robert Walsh: Narrative of a Residence of vol. I, 1836, 2 vol.,Constantinople. London
- د. مصطفى الستيتي: "إسطنبول العثمانية بعيون رحالة فرنسي"، له: http://www.turkpress.co/node/ 13يناير 2015.
- Johnsón. J. H: the poetland the city. The University of Georgia Press, 1948, p 18.
- د. ابراهيم رمانى: المدينه فى الشعر العربى، جزائر نموذجا (1925-1962). بەبێ ساڵ و شوێنی چاپ.
- جيمز أ. کوريک: امپراتورى بيزانس. ت. مهدى حقيقت خواه. تهران: ققنوس،
- ميرچا الياده: مقدس و نا مقدس. ت: نصرلله زنگوئى. تهران: سروش، 1375
- ميرچا الياده: رساله در تاريخ اديان. ت: جلال ستارى. تهران: سروش، 1376
- برتراند راسل: تاريخ فلسفهء غرب. ت: نجف دريابندرى، تهران: پرواز، 1372
- أفلاطون: تيمائوس (دورهء أثار) ت: محمد حسن لطفى. تهران، خوارزمى، 1380
- فردريک کاپلستون: تاريخ فلسفه. جلد يکم: يونان و روم. ت: سيد جلال الدين مجتبوى. تهران: سروش، 1380

- دیوید راس: أرسطو. ت: مهدی قوام صفری. تهران: فکر روز
- Det Står TenkereÆ Aristoteles. 0vst af A. Stigen، Munksgaard، 1996
- د. حەمید عەزیز سەعید: سەرەتایەک لەبارەی فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان. سلێمانی، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، 1979
- قدیس اگوستین: **اعترافات**. ت: سایەء میثمی. تهران: دفتر پژوهش و نشر سهروردی. 1380
- ڕێبوار سیوەیلی: قەشە ئاگۆستین: فەلسەفە و باوەڕ، کوردستان، دەزگای زەریاب، 2012
- Saint Augustine: The City of God. Edited with an Introduction by Vernon J. Bourke. New York، Image Books
- تروند برگ اریکسن: تاریخ زمان. ت: اردشیر اسفندیاری. تهران: نشر پرسش. 1385
- Birgit H. Jensen، Karl E. Scsollhammer og Rigmor K. Schmidt: Den Hovedeløse Bataigges kosmologi. Århus. Forlaget Anis، 1984.
- Peter Kemp: Tid og Fortelling. Introduktion til Paul Riceur. Aarhus Universitetsforlag، 1999
- دیوانی نالی. لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم. پیاچوونەوەی: محمدی مەلا کەریم. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا 1976.
- محمدی مەلا کەریم: حاجی قادری کۆیی، شاعیری قۆناغێکی نوێ یە لە ژیانی نەتەوەی کورد، چاپخانەی النجاح، بەغدا 197؟
- علاالدین سجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی. چ. دووەم، 1971

- سیوەیلی: *"پێشزەمینەکانی سەرهەڵدانی بزاڤی فەلسەفەی ڕۆشنگەریی لە ئەوروپا"*. لە گۆڤاری برایەتی. ژ. 25. پاییزی 2002، هەولێر.
- لويس دومون: مقالات في الفردانية (منظور أنثروبولوجي للآيديولوجية الحديثة). ت: د. بدر الدين عرودكي. بيروت. منظمة العربية للترجمة. مركرز دراسات الوحدة العربية. لبنان: الطبعة الاولى, 2006
- حازم صاغيه: مأزق الفرد في الشرق الآوسط. دار الساقي, لندن: 2001.
- بول ريكور: سيرة اللاعتراف. ثلاث دراسات. ترجمة: فتحي انقزو. المركز الوطني للترجمة. تونس, دار سيانترا, 2010.
- هانری برگسن: پژوهش در نهاد زمان و اثبات اختيار. ت: علی قلی بيانی. ج: 1، تهران: شرکت سهامی انتشار، 1368.
- کيث انسل پيرسون و جان مورل کی: فلسفهء برگسن. ت: د. محمد جواد پيرمرادی. تهران: مرکز تحقيق و توسعه علوم انسانی. 1389
- بول ريكور: الذاكرة, التأريخ, النسيان. ت: د. جورج زيناتي. بيروت, لبنان, دار الكتاب الجديد المتحدة, 2009.
- محمد جواد پيرمرادی: فلسفهء هستی سيال (تأملاتی تاريخی در مبانی، پيش فرض ها و پيامدهای نظريهء ديرند ،بنيادی ترين أصل فلسفهء برگسن"). تهران: سروش، 1392.

## پڕۆفایلی نووسەر:

ڕێبوار سوەیلی کوڕی حەمە ئەمین ئاغای حەسەن ئاغایە. ساڵی 1968 لە گوندی (بارێی بچووک) لە دەڤەری سیوەیلی شارباژێڕی سلێمانی لەدایکبووە، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سلێمانی تەواوکردووە، چۆتە پەیمانگای هونەرەجوانەکان و ساڵی 1985 لەگەڵ خانەوادەکەی دەربەدەر بووە و لە ساڵی 1988 لە وڵاتی دانمارک بۆتە پەنابەر و دواجار بۆتە هاووڵاتی ئەو وڵاتە.. هەر لە دانمارک دەستی بە خوێندنی دواناوەندیی کردۆتەوە و لە زانکۆ وەرگیراوە. بەکالۆریۆس (1996)و ماستەر (2000) لە بواری فەلسەفەدا لە زانکۆی (Roskilde) وەرگرتووە و هەمان ساڵ گەڕاوەتەوە هەرێمی کوردستان و لە زانکۆی سەلاحەدین وەک مامۆستای یاریدەدەر دامەزراوە. ساڵی 2005 بۆتە مامۆستا و لە ساڵی 2007 بەشی فەلسەفەی کردۆتەوە و سەرپەرشتی بڵاوکردنەوەی چەندین بەرهەمی فەلسەفیی کردووە کە دەزگای موکریانی بڵاوی کردوونەتەوە. ساڵی 2012 بۆتە پرۆفیسۆری یاریدەدەر. لە زانکۆی سلێمانی و زانکۆی ڕاپەڕین لەسەر داوای ئەو زانکۆیانە، وانەبێژ بووە و ئێستا لە ئەکادیمیای کوردیی کار دەکات. بە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی و ئینگلیزی بەرهەمی بڵاوکراوەتەوە. لە چەند سەنتەر و دەزگایەکی توێژینەوەیی ئەندام بووە و هەیە. لە ئێستادا ئەندامی ئەنجومەنی فەلسەفەکارانی ژنە لە دانمارک، ئەندامی بۆردی جێندەرناسی زانکۆی سلێمانی و بەڕێوەبەری (دەزگای زەریاب)ە بۆ چاپ و چالاکیی ڕۆشنبیریی و کولتووری. بەرپرسی بۆردی ئەدەبە بۆ ئینسکلۆپیدیای شاری سلێمانی، بە سەپەرشتی یونسکۆ.

جگە لەچەندین وتار و لێکۆڵینەوە لە بواری کاری زانکۆییدا، ئەم بەرهەمانەی لە دیارترین کارەکانین:

**ڕەخنە و هزر و فەلسەفە:**

- دیاردەگەرایی تاراوگە، چاپی یەکەم: دەزگای باران، سوید 1995. چاپی دووەم: دەزگای ئاراس، هەولێر 2002
- نووسین و بەرپرسیاری، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری بینین، ئەمەریکا 1997
- سۆفیستەکان، چ1 ستۆکهۆڵم 1998، چ2 دەزگای سەردەم، سلێمانی 1999، چاپی سێیەم، موکریانی، 2009
- دنیای شتەبچووکەکان، دەزگای سەردەم، سلێمانی 1999

ـ کتێبی نالی، دەزگای موکریانی، هەولێر 2001، 2015، ماڵی وەفایی.
ـ نەتەوە و حەکایەت، 2 بەرگ، دەزگای سپیرێز، دهۆک 2002، موکریانی، 2008، یانەی قەڵەم، 2008
ـ قەفەسی ئاسنین، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2003
ـ فەنتازیای خواردن، دەزگای خەندان،سلێمانی، 2006
_ زانکۆ لە مۆدێلەوە بۆ واقیع. دەزگای گەنجان، 2007
ـ ترسان لە فەلسەفە، دەزگای موکریانی، هەولێر، 2009
ـ دیکارت و ئەقڵانییەت، دەزگای موکریانی، هەولێر، 2009
ـ پییەر بۆردیۆ و کۆمەڵناسیی فەلسەفی، موکریانی، 2010
ـ مێژوو و هزری کۆمەڵایەتی، دەزگای زریاب، هەولێر 2011
ـ هاوکاتی و هاوشوناسی، دەزگای سپیرێز، دهۆک 2004
ـ کتێبی ستایشەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی 2011
– پێش سوکراتیەکان، دەزگای زەریاب، هەولێر، 2012
– قەشە ئاگۆستین: فەلسەفە و باوەڕ، دەزگای زەریاب، 2012
– فەلسەفەی ئاکاری پزیشکی و مافەکانی نەخۆش، وەزارەتی تەندروستی حکومەتی هەرێمی کوردستان، 2013
– سیاسەت لە قەیراندا، دەزگای زەریاب بەهاوکاری گۆڤاری گوڵان، 2013
– پێکەنین و فەلسەفە، دەزگای زەریاب، 2013
– لە ڕەهەندی مێژووییەوە بۆ ڕەهەندی یۆتۆپیایی ئەنفال، کۆمەڵەی ڕووناکبیریی و کۆمەڵایەتی، کەرکووک، 2013
– ئۆپۆزیسیۆن و دەسەڵات، سیڤیل: 2010
– ئەزموون و کەس، دەزگای زەریاب بە هاوکاریی گۆڤاری سیڤیل: 2013
– کۆمەڵگای شلەقاو، دەزگای والا، 2011
– دیاردەناسیی شوێن و شوناس، 2015، غەزەلنووس.

بەرهەمی ئەدەبی:
- گۆرانییەک بۆ گوندە سووتاوەکان (شیعر)، کۆپنهاگن 1989
- کۆپنهاگن! (شیعر)، کانونفرهنگ ایران، دانمارک 1994
- زمانی عەشق، زەمەنی ئەنفال (شیعری) چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2000
- من و مارەکان (چیرۆک) مەڵبەندی لاوانی میدیا، سلێمانی 1999
- خودایە بۆ نەتکردم بە قۆخفرۆش, شیعر, سەردەم, سلێمانی 2011
- ئێوارەیەک بۆ ژن و خودا شیعر, دەزگای زەریاب, 2012

گفتوگۆ و هەڤپەیڤین:
_ مرۆڤ وەک بەخشندە، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2006.
_ زمان، فەلسەفە، شوناس، کاکێشان، کوردستانی نوێ، سلێمانی، 2011.

وەرگێڕان:
- ئەفسانەی خۆشەویستی (سەمەد بیهرەنگی) ئەفسانەچیرۆک، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی 1983
- دەنگی پێی ئاو (سهراب سپهری) چ1، 1989، چ2 کۆپنهاگن 1990
- در امدی بر شعر معاصر کوردی، کۆپنهاگن، 1990 ·
- پیدرۆپارامۆ (ڕۆمان)، خوان ڕۆلفۆ (بەهاوکاری ئازاد بەرزنجی) دەزگای سەردەم، سلێمانی 1999
- دەروازەکانی کۆمەڵناسی (منوچهر محسنی)، بەهاوکاری کۆمەڵێ وەرگێڕ، دەزگای موکریانی، هەولێر 2002
- ئەلبوومی کیژی جنۆکان (چیرۆکی منداڵان لە دانمارکییەوە)، دەزگای سەردەم، سلێمانی 2002

## سوپاسنامە و پێزانینی تایبەتم:

ئەم کتێبە لەسەر پێشنیاریی خۆی، بە هاوکاریی هاوڕێی بەڕێزم (بەدرەدین عەلی) چاپکراوە، لەگەڵ ڕێز و سوپاسی نووسەردا بۆ ئەو بەتەنگەوەچوونەی.

کاکە بەدران عەلی خەڵکی دەشتی هەولێر و لە بنەماڵەیەکی شەهیدپەروەرە و لە ساڵی 2002وەوە هاوڕێی یەکترین..

Rebwar Siwayli

Haji Qaders Book

2016